## دیوانی

# ئەسعەد مەحوی

کۆکردنەوە و ئامادەکردن و لەسەر نووسینی

د. عەبدوڵڵا ئاگرین



ناوی کتێب: دیوانی ئەسعەد مەحوی
کۆکردنەوە و ئامادەکردن و لەسەر نووسینی: د. عەبدوڵڵا ئاگرین
بڵاوکراوەی ئاراس- ژمارە: ٣٠٧
دەرهێنانی هونەری: حاجی دلاوەر
دەرهێنانی بەرگ: ئاراس ئەکرەم
پیت لێدان: کارزان ئاوڕەحمان + عەزیز عەبدولخالیق
هەڵەگری: دڵشاد مستەفا عەباس
هەڵەگریی سەر کۆمپیوتەر: عەزیز عەبدولخالیق
سەرپەرشتیی چاپ: ئاوڕەحمانی حاجی مەحموود
چاپی یەکەم ، هەولێر- ٢٠٠٤
لە کتێبخانەی بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی ڕۆشنبیری و هونەر لە هەولێر ژمارە (٢٩٤)ی ساڵی ٢٠٠٤ی دراوەتێ

## ژیانی ئاسایی

* ئەسعەد مەحویی شاعیر، کوڕی مەلا خالیدی دوا کوڕی مەحویی شاعیرە، مەلا خالید لە ١٩٦١/٧/١٦ لە تەمەنی (٨٦) ساڵیدا وەفاتی کردووە و لە خانەقاکەیاندا لە مەرقەدی مەحوی و لەلای برا گەورەکەی حاجی شێخ عومەری مەحوییەوە، بەخاک سپێردراوە.

* ئەسعەد مەحوی ساڵی ١٨٩٨ لە گەڕەکی چوارباغی شاری سلێمانی و لە ماڵی مەحویدا کە بەتەنیشت خانەقاوەیە، لەدایکبووە.

* سەرتای ژیانی پەروەردەیی و خوێندنی لای مەلا خالیدی باوکی بووە.

* ساڵی ١٩١٠ بۆ خوێندن ڕووی لە قوتابخانەی (سەید ئەحمەد) کردووە.

* ساڵی ١٩١٤ بۆ خوێندنی سەرەتایی ئایینی لە حوجرەی «خواجە فەندی» بووە و لەوێ خوێندنی قورئانی پیرۆزی تەواو کردووە.

* ساڵی ١٩١٥ بۆ خوێندنی ڕەسمی و حکومی لە قوتابخانەی «أعدادي» سلێمانی وەرگیراوە.

* لەکاتی بەرپابوونی جەنگی یەکەمی جیهانی و لەو ساتەی ئینگلیزی داگیرکەر پێی نایە عێراق و ڕووی لە کوردستان کرد، ئەسعەد مەحویش وازی لە قوتابخانەی ئەعدادی هێنا و ڕێچکەی خوێندنی ئایینی باوانی گرت.

* خوێندنی ئایینی و زانستەکانی شەریعەتی ئایینی پیرۆزی ئیسلامی لای زانا و مەلا گەورەکانی کوردستان تەواو کرد، لە پێشیانەوە مەلا خالیدی باوکی و مەلا حوسێنی پیسکەنی و شێخ بابا عەلی تەکێی.

* دوای ئەوەی پلە بەرزەکانی خوێندنی زانستی ئایینی تەواو ئەکات و ئیجازەی «دوانزە عیلم» وەر ئەگرێت، لە خانەقای مەحویدا پیشەی (مدرس)ی مامۆستای ئایینی ئەکات و وانەی بەفەقێیان وتۆتەوە و پێشنوێژیشی لە خانەقای مەحویدا کردووە.

* چەندین قوتابی ئایینی لەبەر دەستی پێگەیون و زۆریان بۆ خوێندنی باڵا ڕوویان لە زانکۆی ئەزهەر لە میسر کردووە و بڕوانامەی دکتۆرایان بەدەست هێناوە.

* ساڵی ١٩٤٦ بەئیمام و (مدرس) لە خانەقای مەحوی دائەمەزرێت.



* شاعیر زانا و ڕۆشنبیرێکی سەردەمەکەی خۆی بووە و زمانی عەرەبی، فارسی، تورکی بەباشی زانیوە.

* لە بواری زانستی ئاینیدا ئەم بەرهەمانەی هەیە و کاتی خۆی چاپی کردوون:

١- «عقائد الرحمانية».

٢- «تحسين البيانية».

٣- «شرح على العقائد الرحمانية».

٤- بەشی یەکەمی دیوانی شیعرییەکەشی ساڵی ١٩٧٠ چاپ کرد و بڵاو کردۆتەوە.

* شایانی ئاماژەی پێکردنە، ژیانی مامۆستا و ئیمامی خانەقای مەحوی و خەرجی مجەوەر و فەقێیان و شۆربای خانەقا، تا ساڵانی بەر لە هەڵگیرساندنی جەنگی یەکەمی جیهان هەر بەو فرمانە ئەکرا، کە کاتی خۆی سوڵتان عەبدولحەمیدی دووەم بەخانەقای مەحویی بەخشیوە.

* دواتر کە دائرەی ئەوقاف دامەزراوە، ساڵی ١٩٤٦ مەلا خالیدی مەحوی موچەی ئیمامی و ئەسعەد مەحویش مووچەی (مدرس)ی بۆ دیاریکراوە.

***

## ژیانی سیاسی

* باوکی ئەسعەد مەحوی، لەتافی لاوێتیدا، تێکەڵییەکی گەرم و گوڕ و دۆستایەتییەکی بەتینی لەگەڵ شێخ مەحموودی حەفیدا بووە، ئەم برایەتییە، لە هەڵگیرساندنی جەنگی یەکەمی جیهانی و دوای دامەزراندنی ئیدارەی حکوومەتی مەلەکیی شێخ مەحموود لە کوردستانی باشووردا تۆختر بۆتەوە.

ئەوکاتەی ئینگلیزی داگیرکەر هێرشی بۆ سەر شێخ مەحموود و حکومەتەکەی هێنا، ماڵ و خانەقای مەحوی یەکێک بوو لە بنەکە و بنەوانی، حەوانەوەی شێخ مەحموود، بەو هۆیەوە، لەکاتی بۆردومانکردنی شاری سلێمانیدا، فڕۆکەکانی ئینگلیز چوار بۆمبایان بەخانەقای مەحویدا داوە و یەکێکیان بەر ژووری مەرقەدی مەحوی کەوتووە، ڕێکەوت پوچەڵ بووە و نەتەقیوەتەوە... ئا لەو سەردەمەوە ئەسعەد مەحویش لەگەڵ کوڕانی شێخ مەحموود بەگشتی و شێخ لەتیف بەتایبەت، پەیوەندییەکی بەهێزی سیاسییان لە نێواندا پەیدابوو... خەباتی کوردایەتی و ڕزگارکردنی کورد و خاکی کوردستان، لەو مەینەتییەی تێیکەوتوون، تەوەری هەرە سەرەکی گفتوگۆی نێوانیان بووە، شێخ مەحموود لە ئامانج و تێکۆشانی شێخ لەتیف و ئەسعەد مەحوی بێ ئاگا نەبووە، بەڵکو ڕێنماییکەر و ڕێنیشاندەریان بووە.

* ساڵی ١٩٣٧ بەهاندانی شێخ مەحموود و پشتگیریکردنی حەپسەخانی نەقیب... لە ماڵی شێخ مەحموودی حەفید... ئەسعەد مەحوی لەگەڵ شێخ لەتیفی شێخ مەحموود و دکتۆر نوری فەتوحی ئەلەکە و محەممەد مەحموود قودسی و ئیسماعیل شاوەیس و سەدیق شاوەیس و مەحموود ئەحمەد و محەممەد خدری تاپۆ و، کەریم زەند حزبی «کۆمەڵی برایەتی» دائەمەزرێنن. ئەمە سەرەتای کار و چالاکی حزبایەتی ئەسعەد مەحوی بووە.

* ساڵی ١٩٤١ لەسەر چالاکی ناو کۆمەڵی برایەتی، لەلایەن کاربەدەستانی حکومەتی عێراقییەوە بەتۆمەتی خەباتی کوردایەتی و هوشیارکردنەوەی جەماوەری سلێمانی و هاندانیان دژی ڕژێم، دەسگیر ئەکرێت و لەگەڵ چەند ئەندامێکی چالاکی دیی کۆمەڵی برایەتی، سەرەتا لە بەندیخانەی سلێمانی دائەنرێن و دواتر ڕەوانەی بەندیخانەی حەویجەی نزیک کەرکووک ئەکرێن، پاش ماوەیەک بەهۆی هەوڵی حەپسەخانی نەقیبەوە، خۆی و هاوڕێکانی ئازاد ئەکرێن.



* لە ١٩٤٣/٣/٢١دا و لە ئەنجامی چالاکی سیاسی و خەباتی حزبایەتی، لەلایەن موتەسەریفی ئەوسای سلێمانییەوە، ئەمری گرتنی خۆی و شێخ لەتیفی حەفید و زۆربەی هاوڕێکانی دەرئەچێت و بەتەگبیری باوکی و پشتگیریی حەپسەخانی نەقیب پەنا بۆ شێخ مەحموودی حەفید لە داریکەلی ئەبات.

هەر لەو ساتەدا شێخ لەتیفی حەفیدیش ئامادە ئەبێت و بەڕێنمایی شێخ مەحموود، کوردستانی باشوور بەجێ ئەهێڵن و ڕوو لە کوردستانی ڕۆژهەڵات ئەکەن و پاش ماوەیەک ڕوو لە شاری «سەردەشت» ئەکەن.

* لە ١٩٤٣/٩/٢١ شێخ لەتیف و ئەسعەد مەحوی لە شاری سەردەشت ئیعلانی لەدایکبوونی حکوومەتی ئازادی کوردستان ئەکەن و شێخ لەتیف بەحاکم و ئەسعەد مەحویش، بەقازی خۆیان بەجەماوەر و ناوچەکە ئەناسێنن و بەناوی «مەحوی زادە»وە بەیان و ئاگادارییە ڕەسمییەکانی حکوومەتی ئازادی کوردستان بڵاو ئەکرێتەوە.

دوای ماوەیەک، لە ئەنجامی کاری نارەوای ئاژاوەگێران و فیتنەنانەوە و بوختان دروستکردنی دوژمنانی کورد، ساردی لە نێوان شێخ لەتیفی حەفید و ئەسعەد مەحویدا پەیدا ئەبێت... ئەسعەد مەحوی ناچار بڕیار ئەدات شاری سەردەشت جێ بهێڵێت و لە دوا ڕۆژی هەینی ئەو مانگەدا، وتاری هەینی بۆ جەماوەری سەردەشت و ناوچەکە پێشکەش ئەکات و ماڵئاواییان لێ ئەکات. ئیدی بێ ئەوەی ئیعلانی ڕەسمی بۆ هەڵوەشاندنەوەی حکومەتی ئازادی کوردستان بکرێت، هاوکات کۆمەڵی برایەتیش بێ خۆ حەلکردنی ڕەسمی ناوی لەناواندا نامێنێت و شاعیر ئەسعەد مەحویش لەوساوە، تا دوا تەمەنی ژیانی، واز لە جموجۆڵی حزبایەتی ئەهێنێت و لە خانەقای مەحویدا گۆشەگیر ئەژی و خۆی بۆ خواپەرستی و وانە وتنەوەی ئایینی بەفەقێیان تەرخان ئەکات و لەگەڵ شیعریشدا ژیان بەسەر ئەبات.

شاعیر ئەسعەد مەحوی، لەبەرەبەیانی ڕۆژی یەک شەممە ڕێکەوتی ١٩٧٦/٤/٢٥ بەنەخۆشی، لە ماڵی مەحویدا کۆچی دوایی ئەکات و لە گردی سەیوانی شاری سلێمانی بەڕێز و شکۆیەکی مەزنەوە لەلایەن جەماوەر و ناوداران و پیاوانی ئایینی سلێمانییە بەخاک ئەسپێردرێت.

***

## پێشەکی

وتەیەک: ئەسعەد مەحوی، یەکێک بوو لەو شاعیرانەی دواچۆڕی شیعری کلاسیکی کوردییان پێشکەش کردوین.

شاعیر لە سەرەتای تەمەنی لاوێتیی شعرییەوە، ڕێچکەی شاعیرانی شیعری کلاسیکی کوردی گرتووە و پەیڕەوی شیعری عەروزی و بەحرەکانی خەلیلی ئەحمەدی فەراهیدی کردووە.

شاعیر دیوانێکی تەواوی شیعری خاوەن سەروای تەواو پیتەکانی (ئەلف) تاکو (یای) پێشکەش کردوین.

شیعر لای ئەسعەد مەحوی، تەنیا خولیایەکی تایبەتی و عەشقێکی تاکە کەسی نەبووە، بەهرە کە کانگای داهێنانی تاکەکانی مرۆڤە، خودا پێداوییەکی زگماکی و سروشتی شاعیر بووە و عەشقی ڕاستگۆیی و خواست و مەبەستەکانی کورد، هەوێنی شیعرەکانی بووە و لە دنیای عیرفان و بڕوا و خەباتی نەتەوایەتیدا ڕەنگیان داوەتەوە.

شاعیر لەناو خێزانێکی ئایین و نەتەوەپەروەر و ڕۆشنبیری شاری سلێمانیدا چاوی هەڵێناوە، مەلا وەسمانی باڵخی باپیرە هەرەگەورەی ئەسعەد مەحوی، دوو ساڵ دوای بنیاتنانی شاری سلێمانی واتە: ساڵی ١٧٨٦ لەلایەن ئیبراهیم پاشای بابانەوە، لە گەڕەکی چوارباغ مزگەوتێکی بۆ دروست کردووە و هەر ئەو ساڵە بەبنەماڵەوە، بۆ سلێمانی هاتووە.

دەوروبەر، ژان و سوێی ژێردەستەیی میللەتی کورد و چەوساندنەوەی خەڵکی سلێمانی و زوڵم و زۆری داگیرکەری ئینگلیز و عێراقی، کاریگەرییان لەسەر ڕەوتی ژیان و ناوەرۆکی شیعرەکانی بووە، بەتایبەت: ڕووخاندنی حکومەتی مەلیکی شێخ مەحموود و ڕووداوە خوێناویەکەی ڕاپەڕینی شەشی ئەیلوولی ساڵی ١٩٣٠ی بەردەرکی سەرای شاری سلێمانی، کلپەی بەگڕەکانی دەروونی شاعیر سەندووە.

**گیروگرفتی بەردەم ئەم کارە:** شاعیر تا لە ژیاندا بوو، بەشێکی لە شیعرەکانی بەچاپ گەیاند، دوای وەفاتیشی، ئەو بەشە شیعرانەی نەشیاون لە بەشی یەکەمیدا بڵاویان بکاتەوە، لەگەڵ ئەو شیعرانەی دواتر و تاکاتی کۆچی دوایی لە دایکبوون کۆمکردنەوە و ئەوەش لە چەند دەستنووس و چوار دەفتەری جیاجیادا نووسرابوون، ماوەیەکی زۆر



ڕەنجیان لەگەڵدا درا، تا بەشێوەیەکی پوخت پێشکەش بەکتێبخانەی کوردیی بکرێت، پاش ئەوەی بەناڕەحەت هەندێک وشە یاخود ڕستە ساغ کرایەوە و بەراورد لە نێوان هەرهەموو دەستنووسەکاندا کرا، ئەو سەرچاوەیەی دوا دەستکاری شاعیری پێوە بوو، ئەو تێکستە متمانەی پێکراوە، چونکە زۆرجار شاعیر خۆی چەندین گۆڕانکاری بەسەر وشەیەک یاخود فەردێک یان پارچە شیعرێکدا کردووە و تەنانەت هەندێک جار پاش و پێشی بەبەیتە شیعرییەکانی کردووە و تەنانەت دەستکاری مێژووی لەدایکبوونی شیعرەکانیشی کردووە.

**شێوازی ئەم کارە:** دوای ئەوەی هەر هەموو دەستنووسی سەرچاوە جیاجیاکان ساغکرانەوە، بەپێی دەستووری ڕێکخستنی دیوانی شیعری کلاسیکی، شیعرەکان ڕێکخراون... ئەوسا هەوڵدراوە:

١- بۆ ئەوەی زیاتر، بەرچاوی خوێنەر ڕوون بێت، چەندە توانرابێت و زانیاری چنگ کەوتبێت، بۆنەی وتنی شیعرەکان خراونەتە ڕوو.

٢- ئەو وشە و زاراوانەی بۆ نەوەی ئەمڕۆ، واتاکانیان ئاشکرا و ڕوون نین، یا خود لێکدانەوەیان پێویست بووە، شیکراونەتەوە.

٣- وا بەپێویست زانراوە، هەندێک شیعر، وەک نموونەی جۆر و شێوەی نوێی داڕشتنی هونەری، یا خود لەبەر هێز و پێزی مەبەست و ئامانجی ناوەرۆکەکانیان لێک بدرێتەوە و تیشکی بۆچوونی نوێیان ئاراستە بکرێت.

**مەبەست:** بۆ نووسینی ئەم پێشەکییە، بەپێی بەرنامەیەکی ڕەنگداڕێژراو، هەوڵدراوە، ڕێچکەی نووسینی پێشەکی بەر لە ئێستا دووپات نەبێتەوە، ڕەوتی هەڵسەنگاندنی نموونەی شیعرەکان پەیڕەو نەکرێت، ئەمەش لەبەر ئەوەبووە، خوێنەر دووجار بەخوێندنەوەی شیعرەکانەوە خەریک نەکرێت و دووبارە بوونەوەش نەبێت و لێکدانەوەی سەرجەم شیعرەکانی ناو ئەم دیوانە، بۆ خوێنەر جێ بهێڵرێت.

یەکێکی دی لەو خەسڵەتە باشانەی ئەم دیوانە، ئەوەیە: شاعیر بۆخۆی کاتی لەدایکبوونی شیعرەکانی لەسەر تۆمار کردوون، چونکە شاعیرە کۆنە کلاسیکییەکانی کورد مێژووی شیعرەکانیان نەنووسیوە، مەگەر خوێنەر بەهۆی ئاماژە بەڕووداوێکی دیاری ناو شیعرەکە، کاتی پاش و پێشی لەدایکبوونی شیعرەکەی زانیبێت.

ئەم هەڵوێستەی شاعیر بەڵگەی عەقڵییەتی پێشکەوتوو و بیرکردنەوەی سەردەمانەی

ئەسەلمێنێت و ئەم کارەش خزمەتێکی ڕاستەوخۆی زانا و پسپۆڕانی نووسینی مێژووی ئەدەبی کوردی ئەکات.

ئەسعەد مەحوی یەکێک بوو لەو مرۆڤانەی لە سەرەتای ژیانی لاوێتییەوە، بەهرەی هونەری شیعری پێوە دیار بووە و کانی ئیلهامی بەردەوام تەقیوەتەوە و بووکی شیعر میوانی بووە و تا دوا تەمەنی ژیانی ڕووباری شیعری وشکی نەکردووە.

**دنیای شیعیری شاعیر:** ئەگەر مەبەست لە شیعر پەیڤی جوان و بینای هونەرێکی نوێی و ڕوخسارێکی ڕێکوپێک و ئامانجێکی پیرۆز و مەزن بێت، ئەوا مرۆڤی خاوەن بەهرە، هەمیشە خولیای شیعر هەراسان بەکاسەی سەری هەڵئەگرێت و بەردەوام نوێکاری و داهێنان لە ڕووخسار و ناوەرۆکی شیعرەکانیدا ئەبینرێت.

ئەگەر تێکڕای شیعر، یەک تام و چێژ و مەبەست و کاریگەری هەبوایە، ئەوا هەر زوو، کفنی مەرگی ئەپۆشی و ناوی لەناو ناواندا نەئەما، بۆیە تا مرۆڤ هەبێت شیعری نوێش لەدایک ئەبێت، چونکە شیعر خۆراکێکی فیکرییە و هەمیشە مرۆڤ پێویستی پێیەتی و لێی تێر نابێت.

ئەسعەد مەحوی خاوەنی دەنگ و ڕەنگی تایبەتی شیعرەکانی خۆیەتی... شیعرەکانی تام و بۆی، جۆری پەروەردەی بنەماڵە و کەسایەتی خۆی و ژیانی سەردەم و دەوروبەرەکەیەتی و ئەشێت شاعیر لە شیعرەکانیدا کاریگەری شیعری پێش خۆی پێوەبێت، بەوە لاسایی هیچ شاعیرێکی نەکردۆتەوە و پێویستیشی بەڕاوکەی شیعری نەبووە و شیعر لەلای بەئاسایی و سروشتی چاوی بەدنیای ئەدەب ڕۆشنبۆتەوە.

شاعیر مرۆڤێکی هەست ناسک بوو، لەگەڵ خۆی و خەڵکی و خواوەندیدا ڕاستگۆ و سەرڕاست بوو، خاوەنی کۆمەڵێک خەون و ئاواتی پیرۆز و بەرز بوو، ئاواتەکانی لە دووتوێی شیعرەکانیدا شەوق ئەداتەوە، ڕۆژانی ئاوات و خەمەکانی بەشیعری ڕەنگاڵەیی دەربڕیووە.

ئەسعەد مەحوی عاشقێکی دڵسۆزی وشەی پیرۆزی کورد بووە، لەو ڕۆژەی دەستی خامەی گرتووە، بەهەڵوێستی کوردایەتی و بەهۆنینەوەی شیعر ڕێگای تاریکی ڕووناککردۆتەوە و بەشیعرەکانی، تینوێتی خودی ئاواتەکانی خۆی و خەڵکی چەوساوە و ژێردەستەی کوردی پێشکاندووە.

شاعیر لەگەڵ ئەوەی گرنگییەکی زۆری بەمەبەست و ئامانج و ناوەرۆکی شیعرییەکانیدا



و بەهەمان شێوەش بایەخی تەواوی بەجوانی ڕوخسار و هونەری شیعری داوە... ئەو ڕۆشنبیرێکی سەردەمەکەی خۆی بووە و شارەزای مێژوو و کەلتووری کورد و دەوروپشت و میللەتان بووە.

شاعیر پەیڕەوی هەموو خەسڵەت و هەلومەرجەکانی هونەر و ناوەرۆکی شیعری کلاسیکی کوردی کردووە، توانا و لێهاتوویی خۆی لە بەکارهێنانی وشە و زاراوەی بەهێز و واتاداری زمانی عەرەبی و فارسی و تورکی دەرخستووە و بەوردی و قووڵی، بەزمانی کوردیدا شۆڕ بۆتەوە و لە بواری ڕەوانبێژی «البلاغة» و لایەنەکانی ڕوونبێژی «البیان» و جوانبێژی «البدیع» و گوزارەبێژی «المعانی» سامانێکی دەوڵەمەندی ڕۆشنبیری گشتی و مرۆڤایەتی پێشکەشکردوین و لەڕووی فەرهەنگی زاراوە و وشەی کوردی پەتی و نوێشەوە، شارەزاییەکی یەجگار زۆری هەبووە، شاعیر لە هونەری تێهەڵکێشی (تضمین)ی شیعری هانای بۆ ناوەرۆکی قورئانی پیرۆز و وتەکانی پێغەمبەری ئیسلام (د.خ) کتێبە شەرعیەکاندا بردووە و بەجوانی واتا و مەبەستی ناوەرۆکی لەگەڵ شیعرەکانیدا گونجانوێتی، خزمەتێکی یەکجار مەزنی بەکەلتووری نەتەوایەتی و زمانی کوردی کردووە.

خەسڵەتێکی دی شیعرەکانی شاعیر، ئەوەیە: مێشکی نەوەی نوێی وروژاندووە، هەوڵیداوە بەهوشیارییەوە هەڵوێست بنوێنن و داوای لێکردوون، خاوەنی بڕیار و کەسایەتی خۆیان بن، هانیان ئەدات، هەمیشە و لە هەموو کات و شوێنێکدا، هەڵوێستی جوامێرانە بنوێنن و هەرگیز لەبەردەم چەقۆی زاڵم و ستەمکاردا نەچەمێنەوە... بۆیە: دیاردەی ڕاستگۆیی لە گوفتار و ڕەفتار و کرداردا، هەوێنی شیعرەکانە و بۆ دەرخستنی ڕووی دزێوی ناحەز و دوژمنانی کوردیش، پەنای بۆ بوختان هەڵبەستن و سووکایەتی پێکردنی ئەم و ئەو نەبردووە، ئەوەش ئەرکی پیرۆزی شیعر و بەهای مەزنیی شاعیرە... بۆیە: ناوەرۆکی شیعرەکانی ڕەنگدانەوەی ئایدیۆلۆژییەتی نەتەوەیی کوردە و مەشخەڵێکە، خواست و مەبەستەکانی نەتەوەی کورد و خاکی کوردستان و پێناسەی بوونی نەتەوەییمان دەرئەخات.

لەبەر ڕۆشنایی، تێکەڵیی و ژیانی هەمیشەیی نێوان هەردوو بنەماڵەی مەحوی و کاکە ئەحمەدی شێخ، برایەتی نێوان مەلا خالیدی باوکی ئەسعەد مەحویی و شێخ مەحمودی حەفید، بەتایبەت لە سەردەمی دامەزراندنی حکومەتی مەلیکی شێخ مەحموود لە

کوردستانی باشوور و دوای ڕووخاندنی ئەو حکوومەتە کوردییە، بەدەستی دوژمنانی کورد و ئینگلیزی داگیرکەر... ئەتوانرێت قۆناغەکانی ژیانی شیعری شاعیر بەمجۆرە دیاربکرێت:

**١- قۆناغی یەکەم:** لە سەرەتای ژیانی شیعری شاعیر، تا دامەزراندنی «کۆمەڵی برایەتی» لە ساڵی **١٩٣٧** ئەخایەنێت. لەم قۆناغەدا شاعیر، زیاتر ئاوڕی لە داڕشتنی پتەو و بەهێزی بەیتە شیعرییەکانی داوەتەوە و زاراوەی واتا قووڵی بەکارهێناوە، بایەخی بەلایەنی هونەری شیعری داوە و شکستی شۆڕشەکانی شێخ مەحموود و ڕووخاندنی حکومەتی کوردستانی باشوور و ئاکامی ڕاپەڕینی خوێناوی شەشی ئەیلوولی ساڵی **١٩٣٠**ی بەردەرکی سەرای سلێمانی ڕەنگیان لە شیعرەکانیدا، داوەتەوە و تیایدا هانی نەوەکانی سەردەم ئەدات، بەفرت و فێڵی هەلپەرست و خۆویستەکان باوەڕ نەکەن و لە ئاست پێشێلکردنی ئازادی و مافی ڕەوای کورددا بێدەنگ نەبن و ئەو واقیعە تاڵەی تێیدا ئەژین بەهۆشیارییەوە ڕەتی بکەنەوە.

**٢- قۆناغی دووەم:** لە دامەزراندنی کۆمەڵی برایەتی تا پێکهێنانی ئیدارەی حکومەتی ئازادی کوردستان لە شاری سەردەشت ئەخایەنێت، ئەو ئیدارەیەی لەلایەن شێخ لەتیفی حەفید و ئەسعەد مەحوییەوە پێکهێنرا... ئا لەم قۆناغەدا «**١٩٣٧-١٩٤٣**» شاعیر زیاتر سەرقاڵی کار و چالاکی سیاسی و جموجۆڵی حزبایەتی بووە... ئەمەش کاریگەری لەسەر شیعرەکانی هەبووە. ناوەرۆکی زەق و دروشمدار بووە، گیانی حزبایەتی پێوە دیار بووە... خۆی لەم دوو لایەنەدا ئەنوێنێت:

أ- ئەو شیعرانەی، لە دامەزراندنی کۆمەڵی برایەتییەوە لەدایکبووە، تا ئەوکاتەی ئەسعەد مەحوی و شێخ لەتیفی حەفید و زۆربەی سەرکردەکانی کۆمەڵی برایەتی لەلایەن کاربەدەستانی حکومەتی پاشایەتی عێراقەوە دووچاری ڕاوەدوونان ئەبن و ساڵی **١٩٤١** هەندێکیان لێ ئەگیرێت و بەند ئەکرێن و شێخ لەتیفی حەفید و ئەسعەد مەحویش بەتەگبیری شێخ مەحموود و حەپسەخانی نەقیب، لە دەست گرتن ڕزگار ئەکرێن و ساڵی **١٩٤٣** بەرەو کوردستانی ڕۆژهەڵات ئەڕۆن و ڕوو لە شاری سەردەشت ئەکەن و هەر لە ساڵی **١٩٤٣**دا ئیعلانی حوکمڕانی حکوومەتی ئازادی کوردستان ئەکەن...

ئەسعەد مەحوی بەناوی «مەحوی زادە»وە بەیان و ئیعلانی حاکمییەت واژۆ ئەکات و بڵاو ئەکرێتەوە.



شیعرەکانی ئەم ماوەیە، گڕ و تینی شۆڕشگێڕانەی بەهێزی پێوە ئەبینرێت و زیاتر گیانی بەرخودانی تیا خەستبۆتەوە.

ب- ئەو شیعرانەی لە شاری سەردەشت هۆنراونەتەوە، هەستی ناسک و سۆزی نامۆیی و غوربەتیان لێ بەرز ئەبێتەوە، تاڵە دەزوولەیەکانی، تروسکەی بەئاوات گەیشتنی کوردە کلۆڵەکەی تیا ئەبینرێت، ورشەی ئەو شیعرانەی لەم ماوەیەدا لەدایکبوون چاوی ئارام لێک نانێن... لە شیعری ئەم ماوەیەدا شاعیر جاروبار بەشیعر لاپەڕەکانی دەفتەری بیرەوەرییەکانی ژیانی هەڵئەداتەوە، بیروڕا و بۆچوونەکانی ڕابردووی بۆ سەلماندنی ڕاستی قسەکانی خۆی ئەهێنێتەوە.

**٣- قۆناغی سێیەم:** شیعرەکانی ئەم قۆناغە، لەوساتە سامناکەوە سەر هەڵئەدات کە ژەهری فیتنەیی و بوختان هەڵبەستن و تەنانەت ناپاکی لە نەتەوە و خاک، بەسەر هەردوو گوڵی باخچەی حوکمڕانی حکومەتی ئازادی کوردستان «شێخ لەتیفی شێخ مەحموود و ئەسعەد مەحوی»دا ئەڕژێت و ساڵی **١٩٤٣** ئەو حکوومەتە تێک ئەچێت و کۆمەڵی برایەتیش بێ ئەوەی ئیعلانی هەڵوەشاندنەوەی خۆی بەڕەسمی ڕا بگەیەنێت وەک بڵقی سەر ئاوی لێ دێت و هەردوو بەرپرسی یەکەم «ئەسعەد مەحوی و شێخ لەتیفی حەفید» و سەرکردایەتی و ئەندام و دۆست و لایەنگیرانی کۆمەڵی برایەتی هەریەکەیان ڕوو لە لایەک ئەکەن وەک لایەنە سیاسییەکانی: حزبی هیوا، حزبی شۆڕش، حزبی ڕزگاری و هەندێکیشیان بەیەکجاری ماڵئاوایی لە ژیانی حزبایەتی ئەکەن.

ئەسعەد مەحویش، شاری سەردەشت جێ ئەهێڵێت و ڕوو لە سلێمانی ئەکاتەوە و لە خانەقاکەی باپیریدا «خانەقای مەحوی» بەیەکجاری ژیانی گۆشەگیری هەڵبژاردووە و خۆی بۆ پەروەردە و وانە وتنەوەی قوتابیانی «فەقێیانی» ئایینی پیرۆزی ئیسلام تەرخان ئەکات و بەردەوامیش عاشقانە لەگەڵ شیعردا ژیان بەسەر ئەبات و شیعریش میوانی هەمیشەیی ئەبێت.

**ئامانجی شیعر لای شاعیر:** شیعر لای ئەسعەد مەحوی ئاخ و ئۆف هەڵکێشان نەبووە، بەڵکو ئەو پەژارەیەی سەرتاسەری ژیانی شاعیری تەنیوە، لەبەر ئەوە بووە، کورد بەچەوساوەیی و ژێردەستەیی ماوەتەوە و ئەو دەرفەتانەی لە مێژوودا، بۆی هەڵکەوتووە، لە دەستیداوە.

شاعیر ئەزموونی ئەدەبی و سیاسی خۆی لە ناوەخنی شیعرەکانیدا دەرخستووە. بەڕاست زانرا، شیعرەکانی قۆناغی سێیەم بەمجۆرە پۆلێن بکرێن:

**یەکەم:** دوای ئەوەی شاعیر لە شاری سەردەشت بۆ سلێمانی گەڕاوەتەوە، گرنگی زۆری بەهونەری داڕشتنی شیعری داوە و لەڕووی ناوەرۆکیشەوە پەنای بۆ هوشیارکردنەوەی وەچەی ئایندە بردووە و بۆ ئەوەی بەزمانی لووس و چاووڕاوی ناحەزانی کورد فریونەدرێن، پێویستە لەسەریان خۆیان ڕۆشنبیر بکەن و بەهەستی پیرۆزی کوردایەتی ڕۆڵەکانیان گۆشبکەن و لە کردەوەی کەچ ڕەفتاری دوور بکەونەوە.

**دووەم:** ئەو شیعرانەی دوای شۆڕشی ١٩٥٨/٧/١٤ هۆنراونەتەوە... تیایدا داخوازییەکانی ڕابردووی کورد ئەخاتە ڕوو... هاولەنگەرییەکی گونجاو لە نێوان ڕوخساری هونەری شیعری و ناوەرۆکەکەیدا هەیە.

**سێیەم:** ئەو شیعرانەی دوای بەرپابوونی شۆڕشی ئەیلوول لە ١٩٦١/٩/١١ تا ١٩٧٠/٣/١١ لەدایکبوون... شیعری ئەم ماوەیە، هەر وەک ژیانی سیاسیی ئەو سەردەمەی شۆڕش، سەقامگیر نییە و بەهەڵبەز و دابەزدا تێئەپەڕێت، لەڕووی هونەری شیعرییەوە، خۆی لە لوتکەدا ئەبینێتەوە، ناوەرۆکەکەشی لە هەڵکشان و داچوونی خواست و ئاواتەکانی نەتەوەی کوردایە و بۆ و بەرامەی خوێن و خاکی لێ دێت... شیعرەکانی ئەو ماوەیە گیانی بەرخودان و شۆڕشگێڕی تیا بەهێزە و هانی نەوەی نوێی دڵسۆز ئەدات بەبڕوا و ئیمانێکی بەهێز و ورەیەکی بەرزەوە خۆیان لەبەردەم جەوری نەهات و قەدەری چارەڕەشدا بگرن و بڕوایان بەسەرکەوتنی ئیرادەی نەتەوە هەبێت. مەبەست و ئامانجی شیعرەکانی شاعیر، خۆیان لە بوارەکانی: «عیرفان و کوردایەتی و سیاسەت و فەلسەفە و ڕۆشنبیری و کۆمەڵایەتی... تا دوایدا» ئەبینێتەوە.



## ئەنجام

لە ڕۆژگاری سەردەمی ژیانی ئەسعەد مەحویدا، مرۆڤی خاوەن بەهرەی زکماکی و بەتوانا و ڕۆشنبیرێکی پایەبەرز نەبووایە، زاتی ئەوەی نەئەکرد، ڕوو لە داڕشتنی شیعری کلاسیکی بکات، ئاخر شاعیری کلاسیکی، بێ لەوەی خاوەنی عەشقێکی سەرمەدی و ناسک و شەوقدارە، پێویستە بیرتیژ و خاوەنی سەلیقەی ورد و قووڵ بێت و شارەزایی تەواوی لە زمان و ئەدەب و کلتوور و مێژووی نەتەوەکەی خۆی و میللەتانیشدا هەبێت و لێهاتووانە، بەقووڵایی زانست و مێژووی هونەری شیعریدا شۆڕ بوبێتەوە و ئاگاداری ئەو گۆڕانکاریانەش بێت، کە بەسەر شیعردا دێت.

ئا ئەو خەسڵەت و هەلومەرجانەی پێویستن لە شیعری کلاسیکیدا هەبن، لە شیعرەکانی شاعیر ئەسعەد مەحویدا بەئاسانی و ڕوونی چنگ ئەکەون... هەر بۆیە شاعیر ئەسپی خۆی لە مەیدانی هەموو جۆرە هونەرەکانی شیعری کلاسیکیدا تاوداوە... ئەوەتا نموونەی شیعری «لیریک» و «ئیسپۆس» وەک بینای هەیکەلی بنچینەیی و سەرەکی شیعر بەکارهێناوە و ڕووی لە بابەتی وردەکارییەکانی ئەو هونەرە بەرزە کردوە و دیوانەکەی بەشیعری: «تاک بەیت، چوارین، چوار خشتەکی، پێنج خشتەکی...» ڕازاندۆتەوە.

هونەری چنینی تاڵە دەزوولەییە ناسک و ڕەنگاڵەییەکانی شیعر، شاعیر بینای هەیکەلێکی شیعریی ڕێکوپێکی ڕوخسارجوانی لێ پێکهێناوە، بەوێنەی شیعری هەست بزوێن و زمانێکی پاراو ڕەوانبێژی جوان زادەی ڕەنج و ماندوبوونی بیری خۆی پێشکەش کردوین، ئەو وشە و زاراوانەی لە شیعرەکانیدا بەکاری هێناون، خزمایەتیان لەنێواندا، توند و تۆڵ و بەهێزە و خاوەنی ئاهەنگ و زەوق و ئاوازی مۆسقاییی خۆیانن. هێماکان دەلالاتی مەعریفی قووڵی بیری ئەبەخشن، نەک خەڵکی ئاسایی بەڵکو ڕۆشنبیری ئاسۆفراوان و شارەزایانی دنیای ئەدەب بەگشتی و شیعر بەتایبەت سەرسام ئەکەن.

ئا ئەو ڕوخسارە هونەریە جوانەی شیعرەکانی، ناوەرۆکێکی بەهێز و پوختی بەباڵا بڕیوە و خۆی لە هەردوو تەوەری فیکری نەتەوەیی و خۆشەویستی نەتەوە و خاک و مرۆڤایەتی عیرفاندا ئەبینێتەوە... ڕاستگۆیی و بەهای بەرز و پیرۆزی باوان و کلتووری دێرین و پەیڕەوکردنی دەستووری ئایینی ئیسلام و قورئانی پیرۆز لایەنێکی دی ناوەرۆکی شیعرەکانیەتی، بەوەش: شاعیر بەکردەی جوامێرانە و هەڵوێستی دڵسۆزانە سەلماندوویەتی: عاشقی پەیڤی جوان و هەق و ڕاستگۆییە.

***

## پاڕانەوە(*)

وا بەدەستی چەرخەوە ئەمڕۆ گرفتارم خودا
بێ کەس و بێ تاڵع و چارە ڕەشم چارم خودا؟(١)
ڕۆژ بەداخ و دەردی میری، شەو بەدەس نا ئەهلەوە
نا تەواو و دڵ بڕاو و سینە غەمبارم خودا...
دەردەکەم خەیلێ گرانە زەحمەتە دەرمانی بێ
نوێژ و ڕۆژووشم بەتاڵە چەندە بەدکارم خودا(٢)
بۆ جەواهیر سورمەیی گەردی کۆی مەحبوبی تۆ
چاوە چاوە، چاوەکەم؛ بینێرە بیمارم خودا(٣)
قەت لە دڵ ناچێتە دەر نایل نەبووم بەو حەزرەتە
بەسمە بابێتە خەوم سوڵتان و سەردارم خودا(٤)
دەر بەدەربم بۆ (مەدینە) کێ غەریبم پێ ئەڵێ:
ڕۆحەکەم پەروانەیە، بۆ شەمعی دڵدارم خودا(٥)
ڕاستە (دار المحنة) دنیا ئەمما (یثرب) نەبێ
کانی ئەهلی جەوهەرە هەم شوێنی ئەنوارم خودا(٦)
(با) بەکامم لە حزیە بێ، گەردشی زەرفی زەمان
بێ مەکان و مەلجەئو داماو و بێ کارم خودا(٧)
نەوەکو من موحتاجتم، عالەم هەموو موحتاجی تۆن
(ئەسعەد)ە داماو و دیلی نەفسی غەددارم خودا

١٩٧٢

(*) ئەم قەسیدەیە؛ گوزارشت لە خواستی ئایندەی خودی شاعیر دەکات؛ لە دنیای عیرفان و خواپەرستیدا و لە خوای میهرەبان ئەپاڕێتەوە، زیارەتی گۆڕی حەزرەتی محەممەد پێغەمبەری خودا (د.خ) بکات و کاتێک لە شاری مەدینەی منەوەرە لە نزیک گیانی حەزرەتەوە دەبێ، ئا ئەوە نەک خۆی بەغەریب و نامۆ نازانێ، بەڵکو ئەوە ئەوپەڕی ئاواتێتی.

(١) تاڵع: طالع مەبەست بەخت و ناوچەوانی چاکە.



(٢) خەیل: فارسییە... واتە: فرە... زۆر.
شاعیر ڕوو لە بارەگای بەزەیی خودا ئەکات و ئەڵێ:
دەردو گوناهم زۆرگرانە، دەرمانی نییە، نوێژ و ڕۆژوشم بەتاڵە و گیرا نابێ، دیارە شاعیر لەچاو خوداپەرستی و دنیای عیرفاندا، هێند خۆی بە بەدکار دائەنێ و دواتر لە خوا ئەپاڕێتەوە بەنسیب کردنی زیارەتی گۆڕی پێغەمبەر لە گوناهی خۆشبێ تەنیا ئەوەشە چارە.

(٣) چاوە چاوە: ئەمە ڕەگەزدۆزی ناتەواوە و بەواتای: چاوەڕوانی و سەیرکردن، یاخود ئەو ترێ: چاو چاو واتا سەیرکەن و تێ بڕوانن.

(٤) لەم بەیتەدا شاعیر تا ئەوەدەمە، داخ و حەسرەتیە، چونکە بەدیداری حەزرەت شاد نەبووە، بۆیە ئاواتەخوازە بەخەویش بێ، (سوڵتان و سەردار) کە مەبەستی پێغەمبەرە (د.خ) پێی شاد بێ.

(٥) لەم بەیتەدا شاعیر ڕۆحی خۆی بەپەروانە چوواندوە و بۆ ئەوەی بەدەوری مۆمی دڵدارەکەیدا بخولێتەوە و ئاکام پەروباڵی بسووتێ، ئائەوە شادی ئەکات، بەڕاستی جوانکاریەکی پەسندیدەی لەو بەیتەدا نەخشاندووە.

(٦) (دار المحنه) خانەی ناخۆشی و مەینەتی؛ مەبەست ئەم دنیایە، بۆیە تەنیا ژیانی ئەو دنیای هەمیشەیی و ئەبەدی لە شاری (یثرب)ە واتە: مەدینەی پیرۆزدا ئەبینێ.

(٧) کام: چێژ، تامی خۆش.
لەحزە: لحظە: ساتەکاتێک.
گەردش: شوێنی سەیرکردن، ڕوانگە.
مەلجەء: پەناگە، شوێنی داڵدەدان.

**بای سەبا مژدەی نیگاری پێیەتی مەردی خودا[*]**
**کۆ وەبن وا جائیزە دابەش ئەکا بۆ ڕێی هودا[١]**
**جوتێ شمشێری مجەوهەر پێشکەشی ئەم بەندەیە**
**با بکاتن، تەن لە جان و جان لە سینەمدا جودا[٢]**
**کێیە تیری تیژی بەرکەو جەرگی پارە پارە بوو**
**ڕووی زەوی پڕبوو لە خوێن و ئاسمانیش مەوج ئەدا[٣]**
**خۆ بەخوێنی (احمدی) دڵخۆش ئەکا (شمر) و (یەزید)**
**کێ بەشایی و کێ بەشین سەیریکەن بەهری خودا[٤]**
**مەسخەرەی ئالی نەبی ڕۆژێکی ڕەش بوو بۆ (یەزید)**
**مل کەچی ئەمری ئیلاهی ماوە (ئەسعەد) یاخودا[٥]**

**١٩٤٠**

---

(*) مێژووی رسکانی ئەم شیعرە (١٩٤٠)ە، ناوەرۆکەکەی ململانێی نێوان هێزی خێر و شەڕە و بۆی عیرفان و خوا پەرستی لێبەرز ئەبێتەوە.

(١) بای سەبا: شنەی بای دەشت، بایەکی فێنک و سازگارە
کۆوەبن: کۆببنەوە، گردبنەوە.
جائز: خەڵات، پاداشت
ڕێی هودا: ڕیی ڕاست مەبەست ڕێگای خواپەرستی هەق ویستیە.

(٢) ئەم بەیتە، جوانکاریەکی وەستایانە ڕازاندویەتەوە و هونەری پێچەو پەخشی شیعریی بەشێوەیەکی هوشیارانە بەکارهێنراوە و ئەوەتا داوای جووتی شمشێری بەمجەوهەر دراو ئەکات یەکێکیان بۆ ئەوەی جەستە لە گیان و ئەویدیان گیان لە مینە جیا بکاتەوە فەرموون ئەو دیمەنە شیعرە جوانە چ واتایەکی بەرز ئەگەیێنێ... ئەمە لەکاتێکدا: شمشێر زۆرجار بەواتای برۆ دێت و هەر برۆیەی بەجۆرێک کاریگەری لە دووکەرتکردندا ئەبینێ.

(٣) پارە پارە: پارچە پارچە، کەرت کەرت.
مەوج ئەدا: شەپۆل ئەدا.

(٤) شمر و یەزید: کوژەرانی شەهیدکردنی حەزرەتی حسێن لەچاپی پێشووی بەشی یەکەمی دیوانی شاعیر لە عجزی ئەم بەیتەدا ئاوا نووسراوە:
کێ بەشین و کێ بەشایی سەیریکەن بەهری خودا



کەچی شاعیر لە دەستنووسێکی پاشتردا هەمان عجزی بەم شێوەیە نووسیوە و من خۆشم ئەمەیان لا جوانتر و پەسندترە.
کێ بەشایی و کێ بەشین سەیری کەن بەهری خودا

(٥) ئالی نەبی: نەوەی پێغەمبەر (د.خ)
واتە ئەو ڕۆژەی یەزید دەستی چووە خوێنی نەوەی پێغەمبەر ئەوە ڕۆژێکی ڕەش بوو، بەتایبەت بۆ یەزید وەک کوژەری هەق و هەق ویستی.

بەئیمدادم کەوە پیری بوخارا[*]

منم بێ کەس لەناو جانی لە شارا[1]

لە پێشوودا فەراعین یەک دوویە بوو

ئەمێستاکە هەموو نەمروودی نارە[2]

ئەوی فتوا بەناحەق نەداتن

وەکو مەنصور ئەوا ئەیکەن بەدارا[3]

سەری خۆم هەڵگرم ئەچمە کەژو کێو

لە هەرلا پێ ئەنێم خۆ پڕ لە خارا[4]

خوا (ئەسعەد) بپارێزە لە نەفس و

دەم و دەستی دەر و ناوانی شارا[5]

١٩٧٠/١/١٥

---

(*) ئەم شیعرە بەر لە ڕێکەوتنامەی ١١/ ٣/ ١٩٧٠ هۆنراوەتەوە و شاعیر دۆخی سیاسیی ئەوسای ناو شاری سلێمانی لا پەسند نەبوو هەمیشە دەنگی ناڕەزایی دەربڕیوە و هەر بەهەمان ڕێچکە گرتنی خوا پەرستی و دنیای عیرفان، داوا لە پیری بوخارا ئەکات بەهانایەوەبێت و لەو بارە ناخۆشە، خۆی و خەڵکی شار ڕزگاریان بێت.

(١) ئیمداد: بەهاناوەهاتن و دەستگیرۆیی کردنە.

جانی: تاوانکار، ئەوەی دەستدرێژی لە مافی خەڵکی ئەکات شاعیر لەم بەیتەدا لایەنێکی جوانی ڕەوانبێژی، لە بواری ڕەگەزدۆزی ناتەواو لە نێوان وشەی (بوخارا) و لە (شارا)دا بەکارهێناوە.

(٢) فەراعین: کۆی فیرعەونە.

نەمروود: مەبەست لەوەیە، جاران دوو زاڵم لەناو شاردا بوو ئێستە زۆربەی هەرە زۆریان ستەمکار و پیاوی دەست ڕۆیشتوو زاڵمن.

(٣) فتوا: ڕێگەی دەستبەکاربوونی شەرعی ئەم بڕیارە لەلایەن زانایانی ئیسلامەوە ئەدرێ.

مەنصور: مەبەست لەمەنسوری هەڵلاجە کە بە ناهەق بەدارا کراو شەهیدیان کرد.

دار: یاخود (دارا) مەبەست لە قەنارەیە.

(٤) خار: دڕک.

(٥) شاعیر لە خوا داوا ئەکات، لە نەفسی پیس و دەمی شڕ و دەستی پیس و دڕندە لەناو شاری سلێمانیدا بیپارێزێ.



شەو لە نوێژا بووم و دەرکەوت سینەکەی نوێژم بڕا

ڕۆژی پاکە، نارەوایە، نوێژی شەوکەی کار ئەکا؟[*]

دڵ بلوورە، واشکا ئەمڕۆ بەدەس بەردی ڕەقیب

کەی ئیکە (ئەسعەد) هیوای بینین و یاری یارئەکا؟[1]

١٩٤٣

---

(*) لە تێکڕای واتای ناوەرۆکی بەیتەکانی ئەم شیعرەدا، شاعیر، ئەو ڕاستییە ئەسەلمێنێ، کاری باشە پێویست ناکا بەدزییەوە وبەشاراوەیی ئەنجامدرێت، مادام مرۆڤێک ڕاست و خاوێن بێ ئەوەش وەک ڕۆژی ڕووناک دیارە و پێویست ناکا لە تاریکی شەوەزەنگدا بخرێتە ڕوو.

شەرحی حاڵم با بنووسم تا نەخۆشە ناحەزم

دەولبەرم سەیرێکی نامەی عەشقی پڕ ئەنوار ئەکا

سەر لە ڕێیا دائەنێم. بابێتە تەختی شاه

زۆر دەمێکە ئارەزووی پاوپلی سەردا ئەکا

(١) بلوور: شووشەی چرا.

ڕەقیب: ناحەز، نەیار، دوژمن.

***

رۆژی تاڵە با بژین ئەمــــرۆ بەشـــــیـــــرینی برا
دەس لەدەست و دەم لە دەم بێ کاری خۆمانە کرا[*]

با نەزرنگێ جـام ئەڵێ: لەم حـاڵە بشکێم چاکـتـرە
بوومــــە پەندی عــــالەم و ناوم لە ناوانا زڕا[١]

بەســیــەتی گـیـانی برا تاکـەی بەئاکـامی ژیان
ڕۆژی ئازادی گـــەلە گـــەل وا هەمـــوو ئازا کـــرا

یا عـــزیزی مـــا ســـمـــعت قـــول جن فی الدجـــا
دوای شەڕی ئەیلوول وتی: ئەم وەحشیانە کەر کرا[٢]

دڵ گرۆی چیی گرتووە (ئەسعەد) ئەوا شیوەنیەتی؟
عـەشـقی ڕووتە کـەوتە سـینەم چل چرایی هەڵکرا

١٩٤٠/٨/٦

---

(*) شاعیر لە ساتێکدا ئەم شیعرەی هۆنیوەتەوە، خۆی لە دنیا و کاری سیاسیدا سەرقاڵبووە و ئەم شیعرە، گوزارشت لەو سەردەمەی ژیانی شاعیر ئەکات، کە لە حزبی (کۆمەڵی برایەتی)دا تێکۆشاوە، لایەنی واتای سیاسیی بەسەر تێکڕای ناوەرۆکی شیعرەکەدا زاڵە.

(١) لەم بەیتەدا شاعیر بەشێوەیەکی هوشیارانە ئەو پەندە کوردیەی تەوزیفکردووە کە ئەڵێ: جام بشکێ و نەزرنگێتەوە... واتا: پیاو بمرێ بەسەربەرزی لەوە باشترە بەهۆی کەچ ڕەفتارییەکەوە، ناوی بزڕێ و خەڵکی لۆمە و سەرزەنشتی بکەن.

(٢) جن: جنۆکە.
الدجا: تاریکی ئەمە لە ڕەوانبێژیدا بەواتای (شەو)دێت وەک توانج پۆشی بەکاردێت.
شەڕی ئەیلوول: مەبەست لە ڕاپەڕینی جەماوەری ئازاو نەتەوە پەروەری شاری سلێمانییە کە لە «٦»ی ئەیلوولی خوێناوی بەردەرکی سەرای شاری سلێمانیدا بەڕوو زوڵم و ستەمدا ڕاپەڕین.



لە ١٩٧٠/٣/١١ چرامان هەڵکرا......
حوکمی زاتی کورد لە بەغدا ئەم شەوە ئیعلان کرا[*]

ئەی مـەلای بەرزان بژی بۆ دلێـری و صـەبرەکـەت
وا ڕماندت فێڵی غەربی کەر گەلیش جەرگی بڕا[١]

با نەمـێنێ پیـاوی خـائین هەر بتـۆپێ خـوێن مـژان
مـژدە بێ ئازادی کـوردە ئەم گـەلە بۆتن بەگـوڵ

هەڵپـەڕێنە نێـر و مێ دوشـمن هەناوی لێ بڕا
پارەسێن و پیـاو کـوژە پەردەی حـەیاو شـەرمی دڕا

چاو کـز و سـەر شـۆڕەکـانە ئێـستـە دێتـە بیـریان
مـوفـتی مـاڵی عـالەم گـیـانیش بەخـۆڕایی مـرا[٢]

سەروەت و سامان و قەصری کاسبی و میراتییە
یا، بەلوولەی چوارده خـۆر و بڕنەوە کـۆمـەڵ کـرا

نان و دەرزی بەن بەجاسوسیش بتۆپێ ئەوسەگە
شوکری حەق بۆ (ئەسعەد)ە زاڵم هەموو باری خرا[٣]

١٩٧٠/٣/١١

---

(*) ئەم شیعرە شەوی ڕاگەیاندنی ڕێکەوتنامەی نێوان شۆڕشی کوردستان بەڕابەرایەتی بارزانی مستەفا حکوومەتی عێراقدا لە ١٩٧٠/٣/١١دا ڕسکاوەو گوزارشت لە ژان و ئازاری دەروونی شاعیر و خۆشی و شادیی ئەکات.

(١) شاعیر بەهەق و لە دەروونێکی بێ ڕووپاماڵیەوەوە ڕێز و تەقدیری بۆ بارزانی مستەفا، سەرکردەی کورد هەبوو، کە توانیویەتی پیلان و فێڵی دەوڵەتە ئیمپریالزمەکان هەڵتەکێنێ و جەرگی خۆ فرۆش و کلک و نۆکەر و پیاوی داگیرکەر ببڕێ.

(٢) موفتی پارە: ئەوانە بە بەلاش و ناڕەوا پارەیان دەست ئەکەوێ.
شاعیر لەو بەیتەدا، ئاماژە بەو پارەسێن و پیاوکوژانە ئەدا کە بەر لەڕێکەوتنامەی ١١ ئازاری ١٩٧٠ لەژێر سایەی ڕژێم و دژایەتی کردنی شۆڕشی ئەیلوولدا ناهەقیان بەرامبەر جەماوەر ئەکرد، بۆیان ئاشکرا بوو ئاکامی ئەو هەڵوێستەیان سەرشۆڕی و مەرگی گیانی خۆیانە.

(٣) شاعیر زۆر جوان و بەشێوەیەکی ئەدەبیانە باسی لەو پیاو خراپانە کردووە و دواتر بەحەماسەتەوە ئەڵێ: ئەوی جاسووسە و پیاوی داگیرکەر هەقە نان و دەرزیان بدرێتێ، تا بەدەرد و ئازاری ویژدانی خۆیانەوە بتلێنەوە، هەروەها ئەوەش ڕوون ئەکاتەوە بەهۆی ڕێکەوتنی ١١ ئازاری ١٩٧٠وە... باری زاڵم و زۆردار کەوت و شکستی هێنا.

## یاد و جەفا[*]

ڕووت و قووت و بێ کەسم، قووتم غەمە و دەرد و جەفا
پێم ئەڵێ: دڵ دەرنەخەی، ئەم نیکتەیە بۆ بێ وەفا[1]
قوڕ بەسەر بولبول، نەماوە موسمی گوڵباز و گوڵ
شەمعەکەی کووژایەوە، پەروانەکەم خاوەن وەفا[2]
خاکە لێوی پیاوە؛ ئەمڕۆ پڕ لە نا پیاوە وڵات
کاولیکە؛ کاولی، تێدا ئەکەن؛ سەیر و صەفا[3]
هێندە موشتاقم بەهاودەم، تا دەمێ بینێمەدەم
سینەکەم پڕبوو لەدەم بۆ دەم دەمانی پڕ جەفا[4]
ڕێگەیی پیاوانەیی بگرە بەرت، بەسیە وتە؟
بەڵکو نایل بێتەوە (ئەسعەد) بەڕێی (مەروەوصەفا)[5]

---

(*) سەرجەم واتای بەیتەکانی ئەم شیعرە، بریتیە لە دەرد و پەژارە و ئازار و شەپۆلی غەمی پەنگخواردەی ناخی دەروونی شاعیر کە وردەکارێکی خنجیلانەی گوزارەبێژی لە نێوان وشەکاندا بەکارهێناوە.

(١) ڕووت و قووت: بێ کەس و بێ دەرەتان.
قووتم: خواردنم.
لە دەستنووسێکی دوایی شاعیردا لە بریتی (دەرد و جەفا)ی قافیەی سەدری ئەم بەیتە (بەرگم جەفا) نووسراوە، من پێم وایە هەر دەرد و جەفاکە، باشتر و جوانترە و هەماهەنگی لە نێوان وشەکانی بەیتەکەدا ساز ئەکات.
وشەی (قووت) و (قووتم) ڕەگەز دۆزی تەواون و هەریەکەشیان واتایەکی جوان و پڕ بەستی بەهای شیعرەکە ئەبەخشێ.

(٢) لە سەرەتای عجزی ئەم بەیتەدا شاعیر لە دەستنووسێکی دواییدا لە بری شوعلەیی؛ وشەی شەمعەکەی واتە مۆمەکەی بەکارهێناوە، ئەمەشیان بەلای منەوە گونجاوترە.

(٣) کاولیکە: وێرانیکە، تێکوپێکی بدەو خاپووری کە.
کاولی: مەبەست لە تیرەی کاولییە لە نێوان هەردوو وشەکەدا ڕەگەزدۆزیەکی تەواو هەیە.

(٤) موشتاقم: پەرۆشم.
لەم بەیتە شیعرییەدا، جوانبێژیەکی سەرنج ڕاکێشەر بەکارهێنراوە و لە بواری ڕەگەزدۆزی تەواودا



خانەیەکی ناسکی هەست بزوێنی شیعری پێبڕاوە.
ئەوەتا وشەی (هاودەم) بەواتا: خێزان یاخود نزیکترین کەسی مرۆڤ دێت... هەر واتای هاوسەر ئەبەخشێ کەچی یەکەم وشەی (دەم) لە عجزی بەیتەکەدا بەواتای خوێن دێت، واتە سینەم پڕ لە خوێنەوە، هەروەها (دەم)ی دووەم هەر بەواتای دەم= فم) دێت واتە خوێنەکە لە سینەم تاکو دەمم هاتووە، دەمانی سێیەم کە بەدوایدا پڕ جەفا هاتووە، مەبەست لە هەژاندن یاخود جۆڵاندنی دەرد و جەفاکەیە و ئەشێ: ئەم وشەیە لە مۆشێ دەمەوە هاتبێ، کە هەواکە ئەجووڵێنێ و ئاسنگەر کوورەی پێ گەرم ئەکا.

(٥) مەروە و صەفا: صەفاو مەروە: شوێنێکە لە مەدینەی منەوەرە و حاجی، وەک ئەرکێکی بەجێهێنانی ئەرکانی حەج مەراسیمەکەی بەجێ ئەهێنێ و لە نێوانیاندا دێت و دەچێ.

***

## سەرزەنشتی گەردوون(*)

زەهری دەستی دولبەرە بۆ من شیفا
شەربەتی دەستی عەدو جەورەو جەفا
ئەم کەوایەی گێتییە تەنگە بە (بەر)
خۆش نەکەن دڵ قەت بەچەرخی بێ وەفا
کوڕەیی ئەم ئەرزەیە باری نییە
ورد و گەورە هەڵئەدا پشتەو قەفا(۱)
ئەو کەسانەی هیچە لای ئەم گێتییە
(ئەسعەد)دا بۆیان ئەکا سەیر و سەفا
وا ئەبوورم لەو کەسەی باسم ئەکا
چونکە پایەی گەورە (عمَّنْ عفا)...(۲)

١٩٧١/١٢/٣١

(*) ئەم شیعرە دوای ڕێکەوتنامەی ١١ی ئاداری١٩٧٠ لە دایکبووە و ڕۆژی هۆنینەوەکەی لەسەر نووسراوەکە باری سیاسیی ناوخۆی کوردستان بەرەوهێمنی و ئارامی چووە، بەتایبەت کاتێک بارزانی مستەفا لە پێناو ئارامی و ژیانی برایەتی خەڵکی کوردستان لێبوردنێکی گشتی دەرکرد و لاپەڕەی ژیانی ڕەشی ئەوانەی پێچایەوە کە دژایەتی شۆڕشی کوردستانیان کردبووە بەوەش، ئەو ڕاستییە دەرکەوت کە ژیان تا سەر بەو شێوەیەی خۆی بۆ کەس نامێنێ و شانۆی سەیر و سەفایە، بۆیە ئەمیش لای خۆیەوە گەردن ئازادی لەوانە کرد کە بەنهێنی و ئاشکرا دژی دواون.

(١) کوڕەیی: (کرة الارض) مەبەست لە گۆی زەوییە.

قەفا: پشتاوپشت، بەپشتی سەردا، مەبەست کەوتنە بە تەپڵی سەردا.

(٢) لەم بەیتەدا شاعیر وەک لایەنێکی هونەری شیعری، هونەری تێهەڵکێش (تضمین)ی بەکارهێناوە بە (عَمَّنْ عفا).

(عَمَّنْ عفا): مەبەست لێبوردنە و پێچانەوەی لاپەڕە ڕەشەکانی ڕابردووە.



بڵێ ئەی دڵ بەنەفست ڕوو لە قاپی وازی ڕەحمەتکا
بەبێ هوودە چووە ژینی بەسە تاکەی دەنا ئەتکا(*)
گەیی عومری بەحەفتا بوو بەمامەی موو سپی شەرمێ
چل و چۆپی هەتاکەی عیزەتی بێت و قەناعەتکا
لە بازاڕی درۆ دەرچێ لە گۆشەی مەعریفەت ڕۆچێ
لە چەوت و لاری لادات و دەم و دەستی سەلامەتکا
حەیا لەو مێزەرەت کە! (مینبرت) کردۆتە مەیخانە
لە بەرگی زانیاری بەس دڵی پیس فەساقەتکا(۱)
بەنا ئەمنی لە ژووری ئەمنەدا عالەم مەشێوێنە
دەبا نەفست سنک بێ ڕوو لە میحرابی سەعادەتکا
لە دەستی دەر نەکا فرصەت هەتا ماوە نەتۆپاوە
چروکی و پیسی و بەدناوی لە خۆ لادە سەخاوەتکا
نەبیتە خادمی گێتی وەرە ئەمجا بەجان و دڵ......
بڵێ (ئەسعەد) بەنەفست ڕوو لە دەرگانەی شەفاعەتکا(۲)

١٩٤٠/٨/٦

(*) ئەم شیعرە لە کاتێکدا هۆنراوەتەوە، شاعیر لەناو (کۆمەڵەی برایەتی)دا خەباتی کردووە، لە مزگەوتەکەی باپیریدا (مەحوی) درێژەی بەتێکۆشانی سیاسیی داوە.

شاعیر ڕوو لە بەناو زانایەکی ئایینی ئەکات کە مینبەری ژووری نوێژی کردۆتە شوێنی خراپە و مەیخواردنەوە، ئەمە بێ ئەوە ڕێز لە مێزەرە سپییەکەی سەری بگرێت، تەنانەت بەوەشەوە نەوەستاوە هاتووچۆی دەزگاکانی ئەمنی ڕژێم ئەکات و خەڵکی نیشتمانپەروەر و پیاو چاک لەدەمەوە ئەدات، شاعیر داوای لێ ئەکات واز لە خراپەکاری بهێنێ...

(١) فەساقەتکا: کاری پوخڵ و خراپە بکا.

(٢) شەفاعەتکا: واتە ڕوو لە مەنزڵی بەزەیی هاتنەوە بکات کە بارەگای خواوەندی میهرەبانە.

***

## ڕوونکردنەوە[*]

پیاوی میری وەرتەیە داوا ئەکا
سێ بەشەش بێ، کاتبی ئەو وا ئەکا[١]
سێ لەسەر چوارم هەیە ڕازی نییە
گوێ بە لە بەرتیلی وا داوا ئەکا
بۆ نەمانی مەبدەئی ئەم عالەمە
ناحەقی و بێ حورمەتی ئاوا ئەکا
ئەی کوڕانی ئەفلەقی کارە ئەمە؟
ئیشتراکی و لادینی سا وا ئەکا[٢]
مەخلەتی گیانە، بەوەعدەی بێ ئەساس
پیاوەتی؛ کێ؛ لە کوونی و سەرسەری داوا ئەکا[٣]
شەرحی حالم؛ بابنووسم تا نەخۆشە ناحەزم
دولبەرم سەیرێکی نامەی عەشقی پڕ ئەنوار ئەکا
سەر لە ڕێیدا دائەنێم تاکو ئەبێتە تەختی شا
زۆر دەمێکە ئارەزووی پاوپلی سەردار ئەکا[٤]

١٩٧١/٥/٢

(*) ناوەڕۆکی ئەم شیعرە، پڕێتی لە گلەیی و گازندە، لە کاربەدەستانی ئەو سەردەمە کە هەر چاوەڕوانی بەرتیل وەرگرتنن، و بەهەموو دیاریەکیش کە شێوەی بەرتیلی وەرگرتووە ڕازی نین... شاعیر ئەو دەردە کوشندە و نەخۆشییە کۆمەڵایەتییە کە ئێستە ناوی گەندەڵی دەستەڵاتی پێ ئەوترێ، هەمووی لە چاوی کوڕانی ئەفلەق، واتە: دەستەڵاتداری بەعس و ئەوانەی سەربە بەعسن ئەزانێ، چونکە ڕژێمی بەعس لە کوردستاندا هەوڵی بڵاوکردنەوەی نەخۆشی و پۆخڵەواتی سیاسیی و کۆمەڵایەتی داوە... هەر دەربارەی ئەم قەسیدەیە... دووبەیتی دوایی بڕیاڕبوو لەسەر بەرگی یەکەمی دیوانەکەی بنووسرێت بەڵام ئەوەش نەکرا بۆیە لێرەدا و لەشوێنی خۆیدا تۆمارم کردەوە.

(١) وەرتە: مەبەست لە فەرش، یاخود قاڵی گەورەیە و لە ٣×٤ کەمترنییە.

(٢) کوڕانی ئەفلەق: مەبەست لەو بەعسیانەیە کە میشیل عەفلەق ڕابەریانە.

(٣) کوونی: کەسانی بەدڕەوشت و کەچ ڕەفتار. سەرسەری: ئەوانەی سنووری ڕەوشت و نەریتی باوی ناو کۆمەڵگا ئەبەزێنن.

(٤) پاوپلی: هەواو هەوەس، ئارەزوو ئەکا.



عەشقی ڕووتە قەستی کوشتەی باوک و ئەولاد ئەکا
کون ئەکاتە بێستوون و ڕوو سپی فەرهاد ئەکا[*]
ئافەرین ئەی (بارك اللّه) دەشتی بێ پایانی عەشق
تیا هەموو حەیرانە عالەم خاتری ناشاد ئەکا
سەد هەزارەن پادشاهی کردە دەروێش و گەدا
دڵ برینداری ئەوانە ناڵەوو فەریاد ئەکا
ئەی فەلاتوونی زەمانە حاڵ زان چارە ساز
بێنە بۆم شاها دەوایە زامی سینەم چاد ئەکا[١]
دەردی (ئەسعەد) دەردی یارە موشکلێکی زەحمەتە
دەسبدا یاخۆ نەدا ژینم برا بەرباد ئەکا[٢]

١٩٤٦

(*) ئەم شیعرە دوای گەڕانەوەی شاعیر لەسەر دەشت وتراوە و لەم ساتەدا (کۆمەڵی برایەتی)یش هەڵوەشاوەتەوە بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا دەروونی شاعیر بۆ خواست و ئاوات و ئامانجی میللەتەکەی هەژاوە و ئەوەی لە دنیای سیاسەتدا، لە ڕێگای حزبەکەیەوە وتوویەتی، ئێستە بەشیعر دەری ئەبڕێ.
– قەستی کوشتەی: قەست: قصد؛ مەبەست... واتە مەبەستی نەهێشتنێتی.

(١) فەلاتوونی: واتەی ئەی ئەوانەی پەیڕەوی فەلسەفەی فەیلەسوف ئەفلاتوون ئەکەن.

(٢) بەرباد: هیچ و پووچ، بێ کەڵک، خراپ و نابەجێ.

خوا کە ڕشتی چاوی لەیلائیکە بۆ کل کار ئەکا
نایەوێ دەنگم دەرێ برژانی سورمەدار ئەکا[*]

تۆ کە هاتی دڵ ئەبێ ون بێ لە من مەنعی مەکە
ڕۆژ کە وەختێ هاتە دەر شەونم لە ئەرزا بار ئەکا

ڕوومەتی ڕۆژت لەگەڵ لێوی شەوم ڕێناکەوێ
خوا کە ڕێکیخا بەجارێ بێ دڵی ئەغیار ئەکا[1]

شەو لە نوێژا بووم و دەرکەوت سینەکەی نوێژم بڕا
ڕۆژی پاکە نارەوایە نوێژی شەو کەی کار ئەکا

دڵ بلوورە واشکا ئەمڕۆ بەدەس بەردی ڕەقیب
کەی ئیکە(ئەسعەد)هیوای بینین و یاری یار ئەکا[2]

١٩٤٣

---

(*) شاعیر لەوێنەکێشانی شیعرەکەیدا، لە ڕوانگەی ئیمانداری و خواپەرستییەوە، جوانی سروشتی و دەستی کردگاری لە چەند وێنەیەکی سەرنج ڕاکێشا دانەخشاندووە.
تەوزیفکردنی کاری کردگاری خودای و سروشتی، تەواو ڕەنگی بەسەر ئەم شیعرەیدا داوەتەوە...
ئەوەتا لە بەیتی یەکەمدا ئەڵێ: خودای مەزن لە ئەزەڵدا چاوی لەیلای بەڕەشی خولقاندووە، ئیدی ئەو چاو ڕەشە پێویستی بەوە نییە، بەکل و کلچیوک بیرێژی.
(١) ئەغیار: ئەوانەی کەسوکار نەبن پێیان ئەوترێ ئەغیا؛ بێگانە، هەندێک جاریش بەناحەزدێ.
(٢) بەیتی (چوارەم و پێنجەم) دووبارەبۆتەوە و شاعیر لەناو پارچە شیعرێکی پشووتردا جێی کردۆتەوە، ئەمەش مافێکی شاعیرە.



خۆی لەخۆی گۆڕیوە؛ غەم؛ ئێستاکە نازی یار ئەکا
نازی بەیانی سەر، نییە بۆ سەر دڵم بولغار ئەکا[*]

کۆنە یارم بۆ فەرەح؛ تۆوی لەسەر ئەرزا نەما
تەبعی دوونی ئەم زرووفە؛ سینەکەم پڕ (نار) ئەکا[1]

ئابڕو یەکجارە چوو؛ شەرم و شکۆ ناوی نەما
عەشقی دینار و درەم؛ ئەم عالەمە بێ بار ئەکا

مردنە ژینم هەموو کاتی بەدەس ئەم جیلەوە
ناشییە، بڵحە؛ بەخیلە خۆ بەڕەئیس کار ئەکا

حورمەتی هەرکەس، بەخۆیە، نەوەک جێگە و مەنسەبی
(کەر) بە(شا) بێ هەر کەرە مەیلی کەری بن بار ئەکا[2]

تەکیەو مزگەوتە؛ نادی، پڕ لە نوێژی بێ خشوع
کێ ئیمامە؟ کێیە واعظ؟ کێیە حوکمی شار ئەکا؟[3]

وا لە (٧٦) تەمەن تێپەڕ ئەبێ ئەی (ئەسعەد)
ئیکە بۆ نەفسی بەدت؛ مەیلی سەر و سەردار ئەکا

١٩٧٣

---

(*) شیعر هەڵوێستەو فەرامۆشی بەدڵ و دەروونی شاعیر ئەبەخشێ، شاعیر لە ساڵی ١٩٧٣دا ئەم شیعرەی بەدەسخەتی خۆی نووسیوە، لە کاتێکدا تەمەنی ڕووی لە هەورازی (٧٦) ساڵە کردووە و ڕۆژگاریش لە ڕووی بارودۆخی سیاسیی کوردەوە گەش دیارەو شارەکانی کوردستان لەژێر سایەی حوکمڕانی کوردیدا بەڕێوە ئەچێ، بەڵام هەستی دەروونی پڕ لە جۆشی شاعیر جۆشاوەو بەشێوەیەکی ساکار باس لە دۆخەکە ئەکا.
- بولغار: مەبەست لە توێکڵێکی ڕەنگ جگەرییەو بۆ و بەرامەیەکی خۆشی لێبەرز ئەبێتەوە.
شاعیر لەسەرجەم بەیتەکەدا ڕووی گلەیی لەو کەسانە ئەکا بەهۆی پلەوپایەوە لە خۆیان گۆڕاون و دۆستەکانی دوێنێیان لەیاد چۆتەوە، کە هەقە ناز و خۆشەویستی بکەنە دیاری و پێشکەش بەو دڵسۆزانەی ڕۆژی ڕەشیان بکەن.
(١) فەرەح: الفرح: خۆشی و شادی
ئەرزا: زەویدا.
تەبعی دوونی: کەسانی دەروون سووک.

زروف: ظروف: ئەم بارودۆخە.

(٢) مەنسەب: منصب: پلەوپایەی دەستەڵات.

لەسەرجەم ئەو بەیتە شیعرییەدا، شاعیر بەجوانی دەستی لەسەر دەردە کۆمەڵایەتی و سیاسیەکان داناوە و خانەی پلە و پایە و ڕێزی مرۆڤی لەناو کۆمەڵدا دیاریکردووە کە هەرگیز ڕێزی کەس بەپلەوپایەوە نەبەستراوەتەوە و ئەوانەی لە خۆیان ئەگۆڕێن، ئەوانە لە بنەچەدا سروشت و دەروونیان و وابووە، چونکە کەسانی گەوج و کەر لەسەر تەختی شاهانەش دابنرێن، هەر سروشتی گەوجێتیان هەیەو هەمیشە ئارەزووی ڕەفتاری نابەجێ ئەکەن.

(٣) خشوع:

- ئیمام: پێش نوێژ.
- واعظ: ئامۆژگاری و ڕێنمایی دەری ئاینی.



دوشمنم بۆتن بەتوولە ڕاوی جەرگ و دڵ ئەکا
ئەی خوایە بیگرە بۆ کاری وا سەر چڵ ئەکا(*)

سەیری ئەو ناکەس بەچەی پەتیاریە بێ حورمەتە
دڵ وەکو بولبول هەمیشە پاسەوانی گوڵ ئەکا(١)

شکوەیی حاڵم کە بردە خزمەتی لەیلا وتی:
عاشقی دێوانەکەی لەم جۆرە توولە سڵ ئەکا(٢)

نەغمە خوانی بوو بەهۆی وەستانی روحی ڕەوان
ئیکە کێ هەوڵی نەمانی حەزرەتی بولبول ئەکا

تێ چریکێنە بەقوربانی دەمت بێ دیدەکەم
ڕوحی شیرینم لەگەڵ تۆ ئەم چڵ و ئەو چڵ ئەکا(٣)

تۆ لەگەڵ گوڵ من لەگەڵ دڵدارەکەی بێ وێنەکەم
ئەم دوو ڕوحە شانەکاری پەرچەمی سومبوڵ ئەکا

چوو لە دەس چاوم لەبەر هیجرانی یار ئەی (ئەسعەدا)
ئەو چی دەربەست چاوی تۆیە، چاوەکەی پڕ کل ئەکا

١٩٦٨

---

(*) شیعری شایەتی ڕاستگۆیانەی سەردەمەکەی خۆیەتی، شاعیریش لە سای سێبەری قورسی شیعرەکانییەوە خەم و پەژارەی خۆی دەرئەبڕێ و هاوبەشی ژان و خەونەکانی میللەتەکەی ئەکات... ساڵی ١٩٦٨ کورد لە شۆڕشێکی سەرتاپایی کوردستانی عێراقدا بووە، دوژمن، بەتایبەت پاش ئەوەی حزبی بەعس دەستی بەسەر دەسەلاتی عێراقدا گرت، خەڵکانی دڵڕەش و خۆ فرۆش و خۆویست بوونە نۆکەرو داردەستی ئەو زاڵمانەو... ئەوەتا شاعیر لەم شیعرەدا ئاماژە بۆ خەم و ئاواتەکانی ئەکات و تەنانەت لە بەیتی یەکەمدا، ئەڵێ: دوژمن توولە سەگەو لە کوردستاندا کەوتۆتە ڕاوی پێشمەرگە و شۆڕشگێڕانی کورد، هەر لەو بەیتەدا، جوانبێژییەکی سەرنج ڕاکێشەری پێشکەشکردوین، ئەوەتا دوژمنی بە توولەسەگ چواندووە و پێشمەرگەش بەجەرگ و دڵی شاعیر، ئەوە هەستی خۆشەویستی و دڵسۆزی شاعیرە بەرامبەر کورد و شۆڕشی ئەیلوول و دوژمن و داگیرکەرانی کوردستان.

(١) پەتیارە- ئاژاوە و بەڵاو بەرەڵڵایی.

(٢) شکوەیی: شکوی: شیکایەت کردن، داوا تۆمارکردن.

(٣) لەم بەیتە شیعرییەدا: دیمەنی ناسک و جوان و دڵفڕینی هونەری شیعریمان پێ ئەبەخشێ، شاعیر چەند جوان ڕوو لە نوێنەر و دەم ڕاستی میللەت ئەکات، و ئەڵێ:

دە هاوار بۆ مافی میللەت بکە و تێچریکینە بەقوربانی ئەو دەمەت بم و بەو دەمە ڕاستییەت، ڕوح و گیانی من لە خۆشیاندا بەرزەفڕ ئەم سەرچڵ و ئەو سەرچڵ ئەکا.

ئەم لێکدانەوەیە لەوەوە سەری هەڵداوە، ناوەڕۆکی شیعرەکانی شاعیر لە تەرازووی خۆشەویستی نەتەوە و نیشتمانەوە لەنگەری گرتووە و نەک مەبەستی خۆشەویستی عوزری جوانێک بێ، یاخود مەبەستی سروشتی پەیوەندی نێوان گوڵ و بولبول بووبێ، لە شیعردا نەک هەر ئەوە جائزە کە لایەنە بەهێزەکانی ڕەوانبێژی وەک (لێکچوواندن) بخرێتە پاڵ وشەیەک، بەڵکو جوانی و ڕوونی و گوزارەبێژی ئەو هونەرەیە شیعر بەهێزوپێز و ڕەوان ئەکا.

لەسەرتاپای ئەو شیعرەدا چەندین نموونەی وێنەی شیعری بەهێزی تیا بەکارهاتووە کە مرۆڤ بەلای خۆیدا ڕائەکێشێ.

***



## یادێکی پڕ لە ناسۆری(*)

چاوەکـــانم وەک (زێبـــار)ە بەدایم ئاو ئەکـــا
ئاهی خەمناکم لە (دەربەندی دزڵی) پایە ناو ئەکا[١]
خـان ئەڵێ: بۆچی برا جـەردە لە عـێـراقـا نەمـا
مـیری مـیرم جەردەیە، جەردە لەگـەڵیا ڕاو ئەکا[٢]
مێش و مێشوولەی (قەڵایە)یە، بۆ بەلێفەی حەسرەتم
نۆکـەری ئاغـا گـەلە، وێنەی مـری ڕووتاو ئەکـا
(شـامی بانە) تاڵیـیـە، خـۆشی لە دڵـمـانا نیـیـە
دۆستی بێ کـارم وەهایە، سوحبەتی بەدناو ئەکا[٣]
هەروەکـو هەڵـمـاتە عـالەم باری مـەعلووم نیـیـە
بۆ نەمـانی یەکـتـری سـەیریکە چاوە چاو ئەکـا
بۆ چرۆکی سـینەیی سـووتاوم کـەوتە سـەمـا
شـێـوەنی جـەرگ و دڵم بۆ ئەم گـەلەی دامـاو ئەکـا
جـرت و فـرتی ئەمنی بێگانە ئەوا فـەوتانمی
فـێڵی پیسـە (ئەسعەد) ئێمە لە بەند داو ئەکا[٤]

١٩٤٣ بانە

(*) شاعیر بۆ هەندێک لە قەسیدە شیعریەکانی، ناونیشانی داناوە... (یادێکی پڕ لە ناسۆری) ئەو قەسیدە شیعرییەی شاعیرە، ساڵی ١٩٤٢لە دەربەدەریدا، دایناوە، لەوکاتەدا چالاکی و خەباتی کوردایەتی لەناو کۆمەڵەی برایەتیدا درێژەی هەبووە، لە ئەنجامی ئەوخەباتە لەگەڵ شێخ لەتیفی شێخ مەحموودی حەفید پێکەوە لەلایەن کاربەدەستانی ڕژێمی عێراقییەوە ڕاودووئەنرێن و سەرەتا بەرەو دزڵی و دواتر ئەچن بۆ شاری بانەو لەوێوە ڕوو لە شاری سەردەشت ئەکەن و هەر لەوێشە بۆ ماوەیەک جێگیر ئەبن.

(١) شاعیر ئەو بەیتەی بەمجۆرەش نووسیوە:
مێش و مێشولەی قەڵابۆتن بەلیفەی حەسرەتم
نۆکەری ئاغا گەلە، وێنەی مری ڕووتاو ئەکا
- زرێبار: گۆمی زرێبار گۆمێکی بەناوبانگە و نزیک مەریوان لە کوردستانی ئێران زۆر شوێنی ئەم

گۆمە لە زستانە تووش و ساردەکاندا ئەیبەستێت بەجۆرێک مرۆڤ ئەتوانێ بەسەریدا بپەڕێتەوە.

(٢) خان: مەحموود خانی دزڵی.

(٣) شام: ئێوارە... لەو بەیتەدا تێهەڵکێشکی جوان و ڕێکوپێکی ئەم بەیتە فۆلکلۆریە بەرجەستەکراوە

سوبحی بەردەست و شامی بانە
ئاوی ئەڵوەن و خەوی ڕازیانە(*)

(*) بەیتێکی فۆلکلۆرییە، کاتی خۆی لەدەمی باوکم مەلا عەزیزی مەلاخالد بیستووە.

واتە: بەیانیانی شاری سەردەشت و دەمەو ئێوارانی شاری بانە دیمەنێکی یەجگار جوان و هەست بزوێن و خۆشیان هەیە، لەگەڵ سازگاری ئاوی ئەڵوەن و خەوی گوندی ڕازیانەی لای سلێمانییەوە بەڵام ئەو هەموو جوانی و خۆش و چێژە لای شاعیر تامیان نییە، چونکە سەرچاوەی دڵی خۆش و ڕوون نییە... هەروەکو چۆن کامەران موکری لەم کۆپلە شیعرییەدا هەمان دیمەن و مەبەست ئەبەخشێ.

ئێستە گوڵی دووانی دڵت سیس و ژاکاوە.
بێخی گوڵبەن لە دەروونی وشک و سووتاوە
چاوی لێڵم گێژی ئەدا دیمەنی سزام
شتی نییە هەرگیز لای من تیابێ نەختێ تام(**)

(**) عەبدوڵڵا ئاگرین- دیوانی کامەران موکری- چاپی یەکەم- چاپخانەی ڕۆشنبیری و لاوان - هەولێر- ١٩٨٧- ل٣٧٢.

(٤) یەکێک لەو هۆکارەی دەنگی بێزاری خۆی بەم شیعرە دەربڕیوە، ئەوەیە: سەرەڕای ئەو دەربەدەری و نامۆییەی تووشی هاتووە، هێشتا جاسووسەکانی ڕژێمی عێراقی و نۆکەرانی ئینگلیز بەدوایانەوە و شوێن دەست و جێی پێیان هەڵئەگرن و لە دەرەوەی کوردستانی عێراقیش وازیان لێناهێنن.



ڕەنگی غەمباریم وەرەم بوو وا لە ڕەنگی بەی ئەکا
ئاهو ناڵەی حەسرەتم جانا لە ناڵەی ئەی ئەکا[*]
ئاسکی سڵ زەحمەتە بی بۆ کەسێ هۆگربێ
شێت و وێتە، عاشقی بێ ڕوو لە دەشتی ڕەی ئەکا
دەنگی تار و عودەکەت ڕیشەی دڵی هێنامە دەر
بۆ زەفافی عوشرەتت چاوی لە جامی مەی ئەکا[1]
نەی خەیە ژێر دەستی کەس ئیشی نهێنی دولبەرم
شەربەتی دوژمن بزانە هەر لە زەهری حەی ئەکا
بۆ سیاسەت گوێ مەدە ئەم لا درۆ ئەولا درۆ
هەردوولا هەروا درۆیە دڵ بەچی ئۆخەی ئەکا[2]
جامی جەم دەست ناکەوێ (ئەسعەد) خەیاڵی چی ئەکەی
قوڕ بەسەر ئەو موفلیسەی فکری کڕینی مەی ئەکا.

١٩٤٥

(*) ئەم شیعرە، دوای ئەوە هۆنراوەتەوە، شاعیر لە سەردەشت ئەگەڕێتەوە سلێمانی و لە هەمان کاتیشدا شەڕی دووەمی جیهانی کۆتایی هات و کوردی بەستەزمان و ستەمدیدەش هیچی چنگ نەکەوت و هەروا بەژێر دەستەیی و خاک داگیرکراوی مایەوە.

- وەرەم: ئەمە بریتییە لە یادێک خۆی لە ژان و ئازاریدا ئەبینێتەوە، لە شێوەی لوو یاخود ئەو برینەی لە ئەنجامی کارێکی ناسازی کتوپڕ پەیدا ئەبێ.

- بەی: بەهێ کە ڕەنگی زەردە.

شاعیر لە دەستخەتێکی خۆیدا بەیتی دووەمی بۆ ئەم شیعرە زیاد کردووە.

(١) زفاف: مەبەست لەشەوی بووکێنیە.

عوشرەت: دۆستی و خوشگوزەرانی پێکەوە ژیان و گونجاندن.

(٢) لەم بەیتە شیعرەیەدا ئاماژە بەهەڵوێستی پێش و پاش شەڕی دووەمی جیهانی ئەکات، بەوەی بەرەی ڕۆژئاوا، سستمی سۆشیالیستی کە خۆی لە حکوومەتە مارکسی و شیوعیەکاندا ئەنوان، هەردوولایان بەر لەشەڕ ئەوەیان ڕاگەیاند، بەرگری لە مافی میللەتانی چەوساوە و دابەشکراو داگیرکراو ئەکەن، کەچی هەردوولایان بەرامبەر گفت و پەیمانەکەیان، نا ڕاست بوون... بۆیە نابێ بڕوایان پێبکرێ و باش وایە: میللەتان پشت بەهێزی خۆیان ببەستن.

***

## خاینان (*)

کۆمەڵێکی بێ شەرەف؛ کەوتوونەتە ڕەقس و سەما
بۆ بڵندی دوژمنی کوردە، حەیا ناوی نەما
لاشەیی منداڵ و پیری خستە جاهی ماتەما
خاوەنی سەییارەبن، ئێمەش لە زیندانی غەما
خانمە ئەفەندی ئەرکلکت ناموسی گیستری دائما
زۆر لەناو ئەم قەومەدا، ئەم تاقمە بێ قیمەتن
وا ئەڵێن: ئەم کەرگەلە، خاین بەدین و میللەتن
سەیری پاشەڕۆژیکەن، بێ شەوکەت و بێ عیزەتن
ڕشتنی خوێنی هەژارانە، کەوایە نەگبەتن
(قل لنا يا إبن الحمار، أين تروحوا بعدنا)(١)
فرسەتێ هەڵکەوتبوو، پیاوی سیاسی دای لە دەس
خوێندەواری گەر وەهابێ، نامەوێ، ئەم علمەبەس
بانەمێنی ئەم گەلە،، ناموسیان، بڕوا لەدەس
هەی لەوەی زوو پێبگا بۆ پارەوپوولە مەبەس
(من نميدانم چرا إين كار آيد رووى ما)(٢)
بوونە لۆتی بۆ عەدو، ئەم کۆمەڵەی ناپاکمان
حەفلەیە، بەزمە، سەمایە، بۆ نەمانی خاکمان
جەرگە سووتا، دڵ بڕا، وادەم ئەنێنە لاکمان
قوڕ بەسەردا هەر ئەکەن بۆ ڕۆڵەیی چالاکمان
(– ئەسعەد– هەروا بووە تەئریخی کوردی بێ وەفا)(٣)

١٩٤١

(*) شاعیر لە دەفتەری ژمارە(٥)دا نووسیوویە: ئەم شیعرە لە ٢١ ڕەمەزانی ساڵی ١٣٨٩ لە وەرامی نامەی خاینانی کوردا دانراوە و لە ژێرەوە نووسراوە ساڵی ١٩٤١.
شاعیر لەم قەسیدەیەدا پەنای بۆ بەکارهێنانی هونەرەکانی شیعر بردووە و خۆی وا ئەنوێنێت:
أ– شیعرەکە لە شێوەی پێنج خشتەکیدا هۆنراوەتەوە پەیڕەوی ئەو شێوازەکراوە، بەڵام جگە لەوەی سێ



دێری یەکەم کە پێویستە هی شاعیر بێت و دوودێری دوایی پێنج خشتەکیەکەی هی شاعیرێکی دی بێت ئەم هاتووە هەر خۆی بنیاتی هەیکەلەکەی تەواو کردووە.
ب– لە پارچەی پێنج خشتەکی یەکەم و چوارەمدا دوو دێری چوارەم و پێنجەم کە ئەبوو تێهەڵکێشی شیعری شاعیرێکی دی بێت، هەر هی شاعیر خۆیەتی و بەکوردی هۆنراوەتەوە.
ج– لە پارچەی دووەمی پێنج خشتەکیەکەدا، دێری پێنجەم بەزمانی عەرەبییەو لە پارچەی سێیەمی پێنج خشتەکیەکەدا؛ دێری پێنجەم بەزمانی فارسییە. ئەو هەموو وردەکاری و فەنتازیایەی بۆ شیعرەکە بەکارهێنراوە نیشانەی توانا و دەستەڵاتی شاعیر لە بواری هونەری شیعری دەرئەخات.
ئەمە لە بارەی هونەری هۆنینەوەوە و لەبارەی ناوەرۆکیشەوە، ئەندێشە و ژان و ئازاری ناحەز و خاینانی کورد سەرچاوەی لە دایکبوونی شیعرەکەیە و شاعیر هات و هاواری لە دەست کردەوەی ناهەمواری خۆ فرۆش و دوژمنانی میللەت لێبەرز ئەبێتەوە و زۆرجار وشە و زاراوەی زۆر میللی و ناو خەڵکە ئاساییەکە بەکارئەهێنێت و هێند داخی ئەو میللەتفرۆشانەی لە دڵدایە نازانی بەچ جۆرێک سووک و ڕیسوایان بکات.
(١) شەوکەت: مەزن و پایە بڵند... شان و شەوکەت، بە پیاوەتیش دێت.
عیزەت: ڕێز و قەدرگیراو.
ئەو دێرە عەرەبییەش ئەمە ماناکەیەتی:
کوڕی کەر و نەزان پێمان بڵێ: لە ئاکامی خراپەکاریت دوای ئێمە بۆ کوێ دەرئەچیت؟
(٢) شاعیر بەداخ و حەسرەتەوە ئەڵێ: هەلێکی لەبار بۆ بەدیهێنانی مافی ئەم میللەتە هەڵکەوتبوو، کەچی لەلایەن سیاسەتمەدارا نەوە لە دەست چوو، بۆیە گەر زانین و، خوێنەواری وەک ئەو سیاسیانەبێت کە هەریەکەیان خۆیان بەدانا و زانا ئەزانن، چش لەو زانیاریەش... بۆیە لە داخدا ئەڵێ: میللەت کە لە ئاست ئەو کارە ناهەموارانەی سیاسەتمەدارەکانمان بێ دەنگ بوون، با میللەتی ئاوا ناموسیان بڕوات و نەمێنێ... چونکە هەڵوێستی ئەو سیاسەتمەدارانە بۆ پارە و ماڵی دنیا بووە نەک سەربەرزی و ئازادی میللەت.
لە دێری پێنجەمی فارسیەکەشدا ئەڵێ: من نەمزانی ئەو کارە چۆن ئەنجامدرا. ؟
(٣) لۆتی: شایەر، ئەوانەی بەناهەق بەسەر کەسانی ناشیاودا هەڵئەدەن... لای ئێمەبە دەهۆڵ ژەنیش ئەوترێ.
عەدو: عَدو: دوژمن
حەفلە: ئاهەنگ.
لاکمان: لاک: واتە جەستە... جەستەمان.

***

## ڕواڵەتی ئەم سەردەمە(*)

سوێندی زۆری بێ شەرەف بوو، وا شەرەف ناوی نەما
بوو بەژن، دەرپێی نەما، حورمەت ئەوا باوی نەما[1]
سەرزەنشتم با بکا واعیز، لەگەڵ لۆمەی گران
ڕۆژی (یە) بێ چاوڕوو کەی قیمەتی چاوی نەما[2]
میری ئەمنی پێ ئەوێ، پارەی بەلاشی پێ ئەدا
زۆر لە پەت بەربوو هەیە، سەگ مۆدەیی ڕاوی نەما[3]
مەکتەب و کانیی درۆی ئینگلیزە، عالەم فێری بوو
لیتە، با بیکا بەسەر بازاڕەکەی باوی نەما[4](**)
چاوەکەت هەڵێنە (ئەسعەد) سەیری ئەم دەوروبەرە
بۆ دەوا، ناکەس نەبێ کەس نەما ناوی نەما[5]

١٩٧٢

---

(*) زۆرجار باری هەڵچوویی دەروونی شاعیر، وای لێئەکا، بێ پەردە نهێنییەکانی پرسیاکە ناخی بکاتەوە و چی لایە هەڵیبڕێژێ... دەنا عالمێکی دوانزە علمیی وەک ئەسعەد مەحوی، گەر ئازارەکەی نەگەیشتبێتە سەر ئێسک وشەی بێ شەرەف بەکارناهێنێ، ئەوە مافێکی شاعیر خۆیەتی.
دیارە تێکڕای شیعرەکانی ناو ئەم دیوانە ڕاستەوخۆ پەیوەستە بەکات و سەردەم و دۆخی لە دایکبوونیەوە، ساڵی ١٩٧٢ دەستەڵاتی حوکمی کوردستانی عێراق بەدەست کوردەوەیە، پێویست بوو ئەوانەی دەستەڵاتداربوون، بۆ خواست و ئارەزووی تاکە کەسی خۆیان ڕوو لە کەسانی بێ چاوو ڕوو هەلپەرست نەکەن، تاکو وێنەی دیمەنی ژیانی ئەو قۆناغە تەڵخ بکەن!... (ڕواڵەتی ئەم سەردەمە) سیمای سەرەکی و واتای بنچینەیی ئەم شیعرەیە.

(١) بوو بەژن: لەم بەیتەدا بۆ سووکایەتی بەئافرەت بەکار نەهێنراوە، بەڵکو جارانیش لەناو کۆمەڵدا ئەو تەشەرە لە کەسانی لاواز و بێ هێز ئەدراو مەبەستیش تەنیا ئافرەتی بێ چاوڕوو و بێ شەرمە، هەروەک چۆن لە (صدر)ی ئەم بەیتەدا، دەستەواژەی سوێندی زۆری بێ شەرەف بەکارهاتووە، بەوەی شەرەف باوی نەماوە، بەڵام حاڵەتەکە سەرجەم و تێکڕای ناگرێتەوە، چونکە ناڵێ هەموو ئەوانەی سوێند ئەخۆن، بەڵکو باس لە سوێند زۆر ئەکا.

(٢) ڕۆژی(یە): ڕۆژی دێت... لە شێوەزار و دووانی شاری سلێمانیدا، زۆر جار پیتێک نەخۆری، پیتی(ت)ش لێرەدا قووتدراوە.



٣- زۆر لەپەت بەربوو هەیە: مەبەست لەوانەیە، تازە پێکەوتەن و بۆ بەرژەوەندی خۆیان وەک سەگی هار هەڵپەو پەلامار بۆ ئەم و ئەو ئەبەن.

(٤) لیتە: وای بۆ ئەچم، مەبەست لە قوڕ و لێتەبێ و بۆ ئەمجۆرە شوێنانە کار دێت شاعیر داخی بەڵێن و پەیمان شکێنی ئینگلیزەکانی لە دڵدایەوە، کە چەند جارە کورد فریو ئەدەن، بۆیە وای بۆ چووە کە هەموو دنیا شارەزای ئەو درۆیانەیان بوو، بۆیە با قوڕولیتە بەسەر بازاڕی ناراستیدا بکاو، باش بزانی باوی داونانەوەی نەما.

(**) شاعیر ئەم بەیتەشی بەمجۆرە وتووە:

مەکتەب و کانیی درۆی ئینگلیزە عالەم فێری بوو
لینە بابیکا بەسەر بازاڕەکەی داوی نەمابوو

(٥) لەم بەیتەشدا شاعیر بەرەهایی و ببڕای ببڕ ناڵێ: پیاوی باش نەماوە، بەڵکو ئەڵێ: پیاوی باش یەجگار کەمن، زۆربەیان کەسانی ناکەس بەچەن

***

## نەکەی بڕوا؟!

دڵم کەوتۆتە داوی تۆ؛ وەرە شاها نەکەی بڕوا
بەرەڵڵا بێ لە زنجیرت؛ بڵێن ئەڕوا نەکەی بڕوا[١]
لە ڕێزی عاشقانا بەندەیەکی جان فیدای تۆیە
بەچوغڵی ناحەزانی، جانی شیرینم نەکەی بڕوا[٢]
دەوایە گەردی ڕێگەت بۆ هەموو چاوی بریندارێ
بەتەنیا چاوەکانم، چاوەکەم بێ بەش نەکەی بڕوا
بەقوربانی سەحابەو تابیعین و پیری پیرانم
لە شەرعی مستەفا یارەب دڵ و هۆشم نەکەی بڕوا
نەسیم بۆنی دەمی دڵداری ئێمە بێنە بۆ سینە
دڵم وا مات و مەدهۆشە بەناکامی نەکەی بڕوا
بەتەنیا یاری شیرینم لە غوربەت ماوە ئەی خالق
کەساس و کز بەنەومێدی لە شارانا نەکەی بڕوا
دەمی تیغی ئەجەل بیخەیتە جەرگی دوژمنی دینم
هیوای (ئەسعەد) بەشادی بێ بەناشادی نەکەی بڕوا

١٩٧٠

---

ژان و ئاوات و خواستی مرۆڤ، بەڕووتی سەرچاوەی ئیلهامی شیعر نییە و کوورەی دەروونی شاعیری پێناجۆشێ، بەڵکو زۆرجار هونەری شیعری جوانکاری لە بواری ڕەوانبێژیدا لای شاعیر هاندەرێکی بەهێزە. لەو قەسیدەیەدا شاعیر پەنا بۆ بەکارهێنانی لایەنێکی هونەری شیعری لە بواری جوانکاریدا بردووە و تێکەڵی مەبەستەکانی شیعری کردووە. بەنموونە تەنیا ڕوو لە دنیا جوانەکەی بەیتی یەکەم ئەکەین.

(١) ئەوەتا دڵی شاعیر بۆ بەداوی دنیای شێخ و شاهەکەی، کە دیارە مەبەستی لە شاهی نەقشبەندە و شاعیر ئەوەندە پابەندی خۆی بەشێخەکەیەوە دەرئەخات، وەک ئەوەی بەزنجیر بەسترابێتەوە بۆیە ئەڵێت: من ئەوەندە بڕوام بەتۆیە گەر بڵێن لە زنجرەکەشت بەربووە، تۆ نابێت بەوە بڕوا بکەیت و وابزانێت ڕۆیشتووم و بەجێمهێشتوویت لە هەردوو دێڕی یەکەم و دووەمی (صدر و عجز)ی بەیتەکەدا دووجار وشەی (بڕوا) بەکارهاتووە و هەریەکەشیان بەواتایەکە و ئەمەش لە ڕەوانبێژیدا لە بواری ڕەگەزدۆزی خۆیان ئەبیننەوە... لە (صدر)ی بەیتەکەدا بڕوا بەواتای ئەوەیە کە ئەڕوا و پاندیی



خۆی ناهێڵێت واتە لێی دوور ئەکەوێتەوە، کەچی لە (عجز)ی بەیتەکەدا (بڕوا) بەواتای: بڕوا و قەناعەت دێت واتەی نەکەی بڕوا... پێویستە بڕوا بەوەنەکەی کە هەرگیز دڵم لێت دوور ناکەوێتەوە دڵم لاتە...
شاعیر بەشێوە جوان و ڕەوان وشەی بڕوای قەسیدەکەدا چەند بارەکردۆتەوە، بەجۆرێک لەگەڵ شارەزایی ئاستی ڕۆشنبیری خۆیدا ئەگونجێت...

(٢) بەچوغڵی: بەقسەی: بەچوغڵی ناحەزان: بەقسەی ناحەزان.
چوغڵ: بەچەندین واتا دێت وەک؛ فرت و فێڵ و چاووراو، ئاژاوەگێڕی و چرۆک و دەست نوقاو بەڵام لێرەدا بەواتای فێڵباز و دەست بڕین دێت، ئەوەتا بەجوغڵی ناحەزان نەکەیت واتە: بەقسەی ناحەزان نەکەیت، چونکە ناحەز قسەی باش ناکات و هەمیشە خەریکی فرت و فێڵ و قسە هێنان و بردنە.

***

## پاسەوانی شەیدا(*)

دڵم مەشکێنە ئەی دولبەر، عەزیزی من نەکەی بڕوا
لەکانی مەعریفەت لادا بەڕەڵڵا بێت و بێ بڕوا(1)
گرفتاری غەمی دووریتم و هۆشم ئەوا ڕۆیی
بەئەفسانە و فسونی دوشمنی دینم نەکەی بڕوا(2)
بەلەرزەدێ و جوودم، ناوی پاکت دێتە سەر زارم
وەکو شەونم کە هاتیشی دڵ و ڕۆحم ئەبێ بڕوا
لە زومرەی پاسەوانی باخی تۆیە (ئەسعەد)ی بێ کەس
نەهێڵی دەرکرێ بێ مەنزڵ و مەئوا ئەبێ بڕوا(3)

١٩٦٩

---

(*) ناونیشانی شیعرەکە (پاسەوانی شەیدا)یە و ناونیشانێکی جوان و ناسکی شیعرییە، شەیدا بەواتای عاشقێکی بێ پەروا و یاخود دێوانە و ئالوودەیی دێت...
شاعیر لەم شیعرەشدا پەنا بۆ توانای خۆی لە بواری شارەزایی هونەری شیعری بردووە... ئەو وەستاییە لەسەرجەم شیعرەکەدا هەست پێدەکرێت.

(١) لەو بەیتەدا شاعیر ڕوو لە دولبەرەکەی ئەکات و بەتکاو نزاوە ئەڵێت: ئەو دڵەی شەیدا و عەشقی تۆیە، وەک قبلەگایەی ڕووی تێکردوت و لە هەموو شت خۆشەویسترە، مەهێڵە لێت دوورکەوێتەوە چونکە سەرچاوەی مەعریفەت کە نووری خوداییە دۆزیویەتەوە، هەر لەو بەیتەدا دووجار وشەی (بڕوا) بەکارهاتووە، بەڵام لە (عجزی) بەیتەکەدا ئەتوانین لە بواری گوزارەبێژیدا بڕواکە بەمجۆرەش لێکبدەینەوە:
ئەی ئەوەی دڵمت بۆ لای خۆت بردووە، مەهێڵە ئەو دڵە لە کانی زانیاری و ڕاستی لابدا و بەرڵڵابێت و و لێت دوورکەوێتەوە... بەمجۆرەش بەیتەکە لێک ئەدرێتەوە: ئەی دولبەرەکەم منی شەیدات دڵم مەشکێنەو، مەهێڵە دوورکەومەوە و بێ بڕوا و ئیمان بڕۆم، ئەمە لە کاتێکدا بەرەڵڵابێت جێگای واتای بێ و ئەو بڕوا ئەگرێتەوە... ئەمەش هەر شارەزایی لە هونەریی شیعری شاعیر دەرئەخات.

(٢) ئەفسانە: تەلیسم... زۆرجار بەواتای جادوش دێت.
فسون: لێرەدا بەواتای دەستگرەوە یاخود جادوگەر دێت، لە (عجز)ی ئەم بەیتەدا، نەکەی بڕوا: واتا بڕوای پێنەکەیت.



(٣) مەنزڵ: شوێن... لێرەدا بەواتای خانەوماڵ دێت.
مەئوا: پەناگە.
لەم بەیتەدا وشەی (ئەبێ بڕوا) لێکدانەوەیەکی شیاو هەڵئەگرێت... ئەگەر بەجیا (ئەبێ و بڕوا) بخوێنینەوە ئەوا، بڕوا بەواتای ڕۆیشتن و دوورکەوتنەوە دێت، بەڵام گەر لەگەڵ سەرجەم بەیتەکەدا بێت بەم شێوەیەیە:
واتە: ئەسعەد، یەکێکە لە دەستەی پاسەوان و شەیدایانی باخەکەت... بۆیە: هەقە نەهێڵی لە باخی خۆشەویست دەرکرێت و ئەوسا بێ پەناو شوێن ئەمێنیتەوە،ناچار سەری خۆی هەڵگرێت، بڕوا...
یاخود بەم شێوەیەش لێک ئەدرێتەوە: (بێ مەنزڵ و مەئوا ئەبێ و بێ بڕوا سەری خۆی هەڵئەگرێت و لەوێ نامێنێت.

***

لە دەشتی غوربەتا تاکم ڕەفیقێکی ژیانم کوا؟
ئەماوو دڵ بریندارم خوا ئارامی جانم کوا؟[1]
بەنووکی تیری موژگانە کەواڵایە کونی سینەم
لە بۆ تیماری ئەم زامە حاڵ زانم کوا؟
ئەگەر بمشۆن لە خوێنی شیری ئەبرۆی ئەو پەڕی شێوە
لەکاتی مەحشەرای گیانە نیشانە بۆ ئیمانم کوا؟
سبەینێ قەبرەکەم بەرنە گوزەرگاهی حەبیبانم
بەسەرما با بچن تاکو بزانن باکی گیانم کوا؟
ئەزانێ مەیلی مەعشووقە لە بۆ عاشقی نییە (ئەسعەد)
بڵێم چی غەیری ئەم دەردە برا دەردی جیهانم کوا

١٩٤١

(١) شاعیر بەدەستخەتی خۆی ئەم هەڵانەی ڕاستکردۆتەوە:

أ- لە (صدر)ی بەیتی یەکەم، وشەی تاک بووە بەتاکم.

ب- لە (عجز)ی بەیتی دووەمدا، وشەی: (ئەم حەکیمی) بووە بە: ئەم زامە.

ج- لە (صدر)ی بەیتی سێیەمدا، وشەی: ئەبەر بووە بە ئەگەر... دیارە ئەمەیان هەڵەی چاپ بووە شاعیر لەسەرجەم بەیتەکانی ئەم شیعرەدا، پەنای بۆ هونەری شیعریی سەروا دوو (التشریع) بردووە، کۆتای هەر عجزیکی بەیتەکان بەدوو قافیە هاتووە ئەویش بریتین لە (آنم و کوا؟).، ئەوەش نیشانەی شارەزایی هونەری شیعریی ئەگەیێنێت... هەروەها لە بەیتی سێیەمدا کە ئەڵێ: ئەگەر بمشۆن لە خوێنی شیری ئەبرۆی، ئەوپەڕی شێوە وێنەیەکی شیعری جوانمان پێشکەش ئەکا، برۆی ئەو ئازیزە پەریی شێوەیە بۆتە شیر و دڵ و جەرگی پێ بڕیوە و ئەو خوێنەش بۆ کاتی حەشر لە ڕۆژی دوایدا (قیامەت) نیشانەی ئیمان و شەهید بوونیەتی... هەر لە صدری ئەو بەیتەدا خزمایەتیەکی جوانێژی لە نێوان وشەی شیر و ئەبرۆدا هەیە و ئەبرۆ لە شیر ئەچێ و کە جەرگ و دڵ ئەبڕێ، لە بەیتەکانی دیشدا گەلێ وردەکاری هونەری شیعری بەکارهاتووە و شیعرەکەی پێی بەهێز کردووە.

***



## شەڕی بەر دەرکی سەرای سلێمانی(*)

بۆ عیلاجی دەردی ئێمە کوا دەوا
هەر بەفیشاڵ ئەم گەلە کەوتە حەوا[1]
خۆی بەژێر دایە قەڵەم ئەو جانییە
وەعدەکانی چی لێهات بوو بەهەوا
بۆ سەرۆکی، (چەورە) کەی لایەق بووە
چەرمی ئێستر نەبووە بیکەیتە کەوا[2]
تاکو ئەمرێتن هیوای چاوانییە
کوێر وەکو ئێمە زەلیل و بێ نەوا[3]
پیر ئەڵێ: باوەڕ بەدەنگی کەر نییە!
یەعنی ئینگلیز لێ بدا ساز و نەوا
ئەو کەسەی باوەڕ بەجاسوسانییە
بێ دەوایە دەردی (ئەسعەد) بێ دەوا

٦ ئەیلول ١٩٣٠

(*) لە دیوانە چاپکراوەکەدا، ناونیشانی ئەم شیعرە (شەڕی سەرا)یە، بەڵام لە ڕاستیدا؛ شەڕی بەردەرکی سەرای سلێمانییە... هەروەها لەدوایی شیعرەکەوە ساڵی ١٩٣٠ نووسراوە، شاعیر لە دەفتەرێکی دەستنووسدا ٦ ئەیلولی ساڵی ١٩٣٠ی نووسیوە و لە دەفتەری ژمارە (٥)دا کە بەدەستنووس مامۆستا ئەحمەد بێداد پاکنووس کراوە ئەم تێبینییەی خودی شاعیر لەسەر وشەی (جانی) لە (صدر)ی بەیتی دووەمدا نووسراوە:

جانی: تاوانبار: ئەوانەی بەدرۆ و فیشاڵ هەر بەدەم دەستی کوردیان لە بنا بڕی، بەهۆی خۆفرۆشانی ناوخۆوە و بەدەسیسەی ئینگلیز شەڕی بەردەرکی سەرایان هەڵگیرسان، سەدان هەژاری کوردی بێ تاوان کوژرا، بەدەستی ناپاکی کاربەدەستانی بەریتانیا.

(١) عیلاجی: چارەسەری.
دەوا: دەرمان.
حەوا: ئاسمان... کە ئەڵێ ئەم گەلە کەوتە حەوا، واتە ئەم گەلە بەرزکرایەوە بۆ ئاسمان هەڵدڕا.

(٢) لەم بەیتەدا: مەبەست لەوەیە کەی کەسێکی چەورە و هەرچی و پەرچی بۆ سەرۆکی دیاری ئەکرێت... هەروەک ئەوەی چەرمی ئێستر چۆن کەوای لێ دروست ئەکرێ؟.

(٣) لەم بەیتەدا بەمەبەستی جوانکاری تیلنیشان لە شیعرەکەدا بەکارهاتووە و ئەمەش لەو پەندەوە وەرگیراوە کە ئەوترێ: کوێر تا ئەمرێ بەتەمای چاوە.

مـەگـرە دەسنوێژت بەزەمـزەم، مـەبڕە دەسـتی بێ نەوا
ڕامەکێشە قوڵفی کەعبە مەی، مەخۆ هێند بۆ دەوا[1]
ڕیشی پان و ئیـشی خـوارت بەسـیـە تاکـەی مـردنە
دەس لە دنیـا بەردە نەخـتێ لێـمـەدە سـاز و نەوا[2]
بۆ (ریا) سوننەت ئەکەیت و واجیباتیش تەرک ئەکەی
خـواردنت مـاڵی حـەرامـە؛ بەسـیـەئیـشی نارەوا[3]
پێ بەئاغـرنێ بەئەرزا (ئەم ئەرزەیە باب و برات)
شاو گەدا بوونە زەوی، ئینجا چییە کیبر و هەوا؟[4]
دوژمنم ئەدوێ لەمن سـەیری وتاریشم ئەکـا
بوو بەئەستێرەی سەما، (ئەسعەد) لە پڕ کەوتە حەوا[5]

١٩٧١

(١) زەمزەم: ئاوی زەمزەم کە لە کانیاوێکی نزیک کەعبەوەیە و حاجیەکان بۆ پیرۆزی لەگەڵ خۆیاندا بەدیاری ئەهێن و پێشکەشی خەڵکی و دۆستانی خۆیان ئەکەن.

– بێ نەوا: مرۆڤی داماو و بێ دەسەڵات و نەدار.

(٢) ساز: ئالەتێکی مۆسیقایی وەتەرییە.

نەوا: نەوا ئاوازی سازەکەیە.

(٣) لە دەفتەری دەستنووسی (٥)دا ئەو بەیتە بەمجۆرەش نووسراوە،

بۆ (ریا) سوننەت ئەکەیت و ڕوو لە واجب لائەدەی
خـواردنت مـاڵی حـەرامـە، بەسـیـە ئیـشی نارەوا

(٤) ئاغر: بەباشی، بەهێمنی، بەجوانی... لای ئێمەنی ئەو ترێ: عاقڵ و ئاغربە.

ئەو بەیتە لە دەفتەرە دەستنووسەکەشدا بەمجۆرە نووسراوە:

نەختێ ئاغر پێبنێ بەئەرزا ئەم ئەرزەیە باب و برات
شاوگەدا بوونە زەوی، ئینجا چییە کیبر و هەوا؟

گەدا: بێ نەواو سواڵکەر.

کیبر: لووت بەرزی و خۆ بەشت زان.

هەوا: لێرەدا بە مەبەستی ئارەزوو دیت واتە: ئەوانەی خواست و ئارەزووی لووت بەرزیان لە کەللە دایە.



(٥) سەما: ئاسمان.

ئەو بەیتە لە دەفتەری دەستنووس (٥)دا بەمجۆرەش نووسراوە:

دوژمنە ئەدوێ لەمن سـەیری وتاریشم ئەکـا
بوو بە بەمانگی صەفی، ئەسعەد لە پڕ کەوتە حەوا

– صەفی– صەفی: خاوێن و ڕوون، یاخود زۆرجار بەواتای ئەوەدێت کە لەگەڵتەو پاڵپشتەو دڵسۆزتە.

لەو بەیتەدا شاعیر باسی ناحەز و دوژمنانی ئەکات کە چۆن هەمیشە چاودێری نووسینەکانی ئەکەن، تا شتێکی لێ بدۆزنەوە و چاڵی پیلاندانانی بۆ هەڵکەنن... بەڵام وەک خۆی ئەڵێ: ئەسعەد وەک مانگێکی تریفەدار و بێگەردەو یاخود وەک ئەستێرەی درەوشەداری ئاسمانە، چونکە پاک و ڕووناکە، ئەوەتا ناحەزان زەفەریان پێنەبرد و سەرکەوت و بەرزبووەوە.

***

(بارك اللّه) ئەی قـــەناعـــەت بوویە ویّلاّشم وەها
حەپسی نەفست کردووە، کردت هەموو دەردم دەوا[١]
دوشـــمنم کـــوێر و کـــەڕە بۆ بیـــستن و بینینی حـــەق
نایفـــرۆشم عـــیـــزەتم بۆ گـــێـــتـــیـــیـــەکی بێ وەفـــا
فـــائیـــدەی پارە چیـــیـــە؟ وا بوویە قـــاروونی جـــیـــهـــان
ناوی بەد ناوت ئەبێ، ڕۆژێ، حەیاو شەرمت نەما[٢]
خـــۆی لە دز شـــاردۆتەوە، حـــورمـــەت بلّێ با دەرکـــەوێ
کـــەس بەپولێ نایەوێ بێتن بکا ســـەیر و صـــەفـــا[٣]
لێـــدە تەپڵ و دەف، وەرە ئەم کۆڕەیە، بۆ شـــێـــخـــیـــیـــە
ڕیشـــەکەت داهێنە زاهید، بێ، بکە ڕەقص و سەما[٤]
تۆ بلّـــێی بێتن کـــونێ، پیـــاوێکی باشی تیـــا ببێ
دەس بەهەر کـــوندا ئەکـــەم مـــارێکی تیـــایە پڕ جـــەفـــا
دەعـــوەت و سەیرانە (ئەسعەد) لێی حەرامە کاکـەڵێ
عـــومـــری شـــیـــرینم بەتاڵی چوو لەگـەڵ جـــەور و جـــەفـــا

---

(١) وێلاّش: هاوجـووت، هاوڕێ... ئەم زاراوەیە زیاتر بۆ کـاتێ بەکـاردێت، ئافـرەت منداڵـی ئەبێ دوای خودا پێداوی منداڵەکە... وێلاّشێکیشی لەگەڵە... ئەمە بەواتای هاوڕێ دێت.
شـاعیـر لە (عـجـز)ی ئەم بەیتـەدا، سـەروای (وەها)ی کـردووە بە (دەوا) کـە ئەمـەیان زیاتر لەگـەڵ واتای بەیتەکەدا ئەگونجێت.
واتە: لە یەزدانی مـیـهـرەبان بەزیادبێت، قـەناعـەت ڕازی بوون بەو بەشـەی هەیە، بۆتە هاررێم و نەفسی چاوچنۆکی بەند کردووە، ئەوەش چارەسـەری دەردی کردووم و نەیهـێشـتـووە دوای تەمـاعی دنیایی بکەوم.
(٢) قـاروون: ئاماژەیە کە گەنج و سامانی قاروون، کـە پیاوێکی دەوڵەمەند بووە... دەوڵەتی قـاروون: سامانی قاڕوون.
(٣) سەیر و سەفا: بەزموڕەزم... خۆشی و ئاهەنگ.
(٤) زاهید: عـارف؛ خواپەرست، ئەو مـرۆڤەی بەشێکی یاخود هەمـوو تەمـەنی بۆ خواپەرستـی تەرخان ئەکات.
ڕەقص و سەما: هەردوو وتەکە یەکە و بەواتای سوڕدان سەماکردن دێت.



لەم جیـهـانە کـێـیە؛ تاسـەر بێ لە کـەیف و خـۆشیـا
ئەو کـەسـە بێ عـەقـڵـە وا شـادە بەعـەیش و نۆشـیـا
کـــوا حـــوکـــمـــڕانی ســـولەیمان و سکەندەر هەم (تُقْع)
دەوڵەتی قـارونی چی؟ ڕۆیی بەرپێی ناخـۆشـیـا[١]
سواری شێر؛ با کەس نەبێ؛ ترسێ لە دڵ عـالەم بکا
خـــۆی بەنەخـــچـــیـــری بزانێ؛ وا لە خـــانەی بۆ شـــیـــا
مـــاڵی کـــێـــیـــە، بۆ نەوەی، تا مـــاوەیە توولی ببێ
بێ شعوری خەرج ئەکەی، ژینت لە گرد و کۆشیا[٢]
ئەی گـڵـە کـوێربی، وەکـو بویە جـەهەننەم بۆ گـەلێ
پیـــاوی داناو عـــەبقـــەری داوە بە بانی دوشـــیـــا[٣]

---

(١) حوکمڕانی سلێمان و سکەندەر.
- سلێـمان: سـوڵـتـان سلێـمـانی قـانوونی ١٤٩٤-١٥٦٦ سولـّتـانی عـوسمـانی بوو... لە ئەنجـامی هێرش و پەلامـاردانی بۆ سـەر خاک و میـللەتان، دەستی بەسـەر زۆر وڵاتدا گرت بەهۆی ناکـۆکی و ململانێی بنەماڵەوە، کار گەیشتە ئەوەی مستەفای کوڕی ئیعدام بکات.
ئەم پیاوە بەدادپەروەر ناوی دەرکردبوو، لە سەردەمی حوکمڕانیدا پیاوانی شارەزا و ئەدیبانی لە خۆی کۆکردبووەوە:
- سکەندەر: ئەسکەندەری مـەقـدۆنی مـەزن (٣٥٦-٣٢٣) پ. ز، ئەم پیـاوە بەپاشـای مـەزنی مـەقـدونیـای یۆنان ناوبانگی دەرکـردبوو، پیـاوێکی چاونەترس و ئازابوو، لە ئەنجـامی هێـرش و پەلاماردانەکانی خاکی زۆر لە وڵاتانی داگیرکرد ودەستەڵاتی خۆی بەسەریاندا سەپاند.
(٢) خەرج ئەکەی: لە پێناویدا بەختی ئەکەیت، پێشکەشی ئەکەیت.
- گرد و کوشی: هەوڵ و کۆششی سەخت ئەکەیت.
بەواتای ژیانت لە ناڕەحەتی و زەحمەتدایە.
(٣) بۆ گەلێ: بۆ گەلێک، بۆ خەڵکێکی زۆر.
- عەبقەری: بلیمەت.

***

## چاوەکانم نابینایە

دڵ لە سینەم کۆچی کرد، سەد مەرحەبا؛ شوێنی شەباب
لانی بێ شێر مایەوە، عەینی وەجاخی بێ کەباب[١]
دەنگی ناڵەی نەی نەما؛ ئاگر لە بێشە بەربووە
بێ دەوایە؛ دەردم و مەر، جێی لۆمەو عیتاب[٢]
چاوەکانم نابینایە، کەیف و خۆشی باری کرد
مەنزڵی عاشق ڕما؛ ماوە تەختی بێ جەناب[٣]
قیمەتی کوانێ شەرەف بێ؛ با، بەبێ ژین و ژیان
بۆ کەرو گاچی ئەهێنێ (بوربوت) و دەنگی ڕوباب[٤]
مەی لە مەیخانە ڕژا لێسایەوە ئەهلی وەفا
بەختی شوومم، بەرنەکەوتم؛ نۆشیکەم جامی شەراب[٥]
ئەو کەسە تاجی لە ڕەهنی دین ئەنێ پیاوانەیە
نەوکو بۆ دنیا، لە پێناوی بنێ ئەجداد و باب[٦]

١٩٧٢/٥/٢٨

---

(١) شەباب: لاو، گەنج.

- لانی بێ شێر: شوێنی بێ شێر... ئەمە خوازە (مجازە) مەبەست لەوەیە: شوێن و مەنزڵی پیاوی مەزن کوێربۆتەوە.

(٢) لۆمە: سەرزەنشت. عیتاب گلیەیی و گازاندە.

(٣) لە (عجزی) ئەم بەیتەدا بەمجۆرەش نووسراوە:

مەنزڵی عاشق نەماوە، ماوە تەختی بێ جەناب.

شاعیر لەو دێرە شیعرەدا جوانکاریەکی وریایانەی ڕەوانبێژی بەکارهێناوە و لە بواری دژیەکی سلبی (طباق سلبی)یدا هەردوو وشەی (نەماوە، ماوە)ی داناوە چونکە لە (صدر)ی ئەو بەیتەدا لە بری نەماوە، وشەی ڕماوەی بەکارهێناوە و ئەمەیان جوانتریشە، بەڵام دیارە بۆ ئەوەی بوارە جیاجیاکانی ڕەوانبێژی بەکار بهێنیت وشەکەی لە (ڕماوە) کردووە بە نەماوە لەوەش گۆڕینی ئەو وشەیە، بەمەبەستی گوزارەبێژی بێت واتە (المعانی) چونکە... واتاکەی بەتەواوی ئەگۆڕێ.

(ڕماو) شوێنەکەی ئەمێنێ، بەڵام کە نەما هیچ شوێنەوارێکی نابینرێت، ئەگەر وابێت، ئەوا وشەی نەماوە، واتای شیعرەکە بەهێزتر ئەکات.



(٤) بوربوت: ئالەتێکی موسیقایە و وەتەریە.

- روباب: ئەمەش هەر ئالەتێکی موسیقاییە، وەتەریەو زیاتر پەیوەستە بەعەرەبەکانەوە.

(٥) شووم: بێ بەختی- چارەڕەش.

- نۆشیکەم: بیخۆمەوە.

- جامی شەڕاب: پێکی شەڕاب.

(٦) لە ڕەهنی: واتە: لە بارمتەی لە متمانەی، لە بەهای.

***

پێم لە ئاوزەنگی سەفەردایە و غەریب
دەس لە گێتی، ئانێ بەرنادەم عەجیب[1]
نەفسی زاڵم، ناگەڕێ لێم زۆر بەدە
سەرزەنشتی بابکا، پیاوی لەبیب[2]
شوڵی هەڵکێشاوە، لەبێ ئایینی
باوی بازاڕی شکا زەنگ و سەلیب[3]
ئەم نەخۆشەی کەوتە عالەم بێ سووە
چاری ناکا داو و دەرمانی تەبیب[4]
ئاینی ئیسلامییە، ئەژدادی من
مەبدەئم تەنیا (ئەوە) و ئەومە حەبیب[5]
بگرە داوێنی (محەمەد)- د.خ- (ئەسعەد)ا
دێ بەفریای ئومەتی شاهی شەکیب[6]

(١) دیارە ئەم قەسیدەیەی شاعیر لە تەمەنی هەڵکشاویدا هۆنیوەتەوە، خۆی وا دائەنێ بەسەرەو سەفەری کۆتایی ئەچێت، بۆیە زۆر بەتوندی سەرزەنشتی نەفسی دنیایی خۆی ئەکات کە چەندە زاڵمە لە سنووری تەماعی دنیا تێیپەڕاندووە و ناهێڵی یاخود بەرهەڵستی ئەوە ئەکات ڕوو لە ئیمانداری بکات... بۆیە لە ئەنجامدا و بۆ ئەوەی دەست لە خۆشی و بەزمی دنیایی هەڵگرێت داوێنی پێغەمبەری ئیسلام حەزرەتی محەمەد (د.خ) ئەگرێت، چونکە هەر ئەو بەفریای ئومەتی خۆی ئەکەوێت.

- دەست لە گێتی: واتە دەست لە خۆشی و کەیف و موڵک و سامانی ئەم دنیا، شاعیر لەباتی دەست، (دەس)ی بەکارهێناوە.

- ئانێ: چاوتروکاندێ، ساتێ، کورتەکاتێ.

شاعیر کە ئەڵێ: پێم لە ئاوزنگی سەفەردایە و غەریب مەبەست ئەوەیە: ژیانی ئەم دنیا کاتییە و سەفەرێکە مرۆڤی پیا ئەڕوات، کەچی لەگەڵ ئەوەدا هەروەک چۆن مرۆڤ پێ ئەخاتە ئاوزنگی ئەسپەوە و ئەیەوێت بچێتە سەر پشتی ئەسپەکە، ئەمیش وای لێهاتووە پێی ناوەتە ئاوزەنگی ئەسپی دنیاییەوە.

(٢) بەد: ناپەسەند، ناڕێک، ناڕەوا

- لەبیب: مرۆڤی کامڵ و ژیر... عاقڵ و ئاغر... زۆرجار بەکەسێکی لەسەرخۆیی مەوزونیش ئەوترێ.



(٣) شوڵی هەڵکێشاوە: لە سنوور دەرچووە.

- زەنگ و سەلیب: زەنگی کڵێسە و سەلیبی مەسیحیەکانی مەبەستە.

لێرەدا باوی بازاڕی شکا: هونەری دڕکە (کینایە)ی لە بواری جوانکاریدا بەکارهێناوە و لەگەڵ واتاو هەیکەلی شیعرەکەدا ڕێکو گونجاو هاتووە.

(٤) بێ سووە: بێ سوودە و لەبەرکێشی شیعریدا لەکە ئاوێتەی نەمان بووە... بێ سوودە؛ بەواتای بێ کەڵکە و دەستی لێ بشۆ.

- تەبیب- طبیب: پزیشک.

(٥) تەنیا (ئەوە) واتە: تەنیا مەبدەئم؛ ئاینی پیرۆزی ئیسلامە.

- حەبیب: خۆشەویست و واتە پێغمبەر «د.خ» خۆشەویستمە.

(٦) شاهی شەکیب: شەکیب: هێمن و بەئارام- شاهی شەکیب: شاهی ئەوانەی بەئارامن و مەبەست حەزرەتی محەمەدە (د.خ).

***

خۆ لە من تاکەی ئەگۆڕی ئەی ڕەقیب؟
میش و خەرمووری لە بۆ حاڵی ئەدیب[1]
وا لە داخی تۆ دڵم بڕیاریدا
نیشتمان چۆڵ ئەکەم ئەبمە غەریب
با بەبێ کفن و مەلا بمنێنە گۆڕ
ناو ونیشانم نەبیسێ یا حەبیب
نەوکو من مردم بەدەستی چەرخەوە،
باخوا هەم ناخووا ئەهلی سەلیب[2]
چەرخی زاڵم بوو بە کابووس و شەوە
(ئەسعەد)ت خستۆتە بن باری ڕەقیب[3]

---

(١) ڕەقیب: ناحەز، چاودێری کەر، دوژمن.

– خەرموور: مۆرووەکەرانە، موورویەکی شینی درشتە، وا باوە: ئەڵێن: کە ورد بکرێت و دەرخواردی هەرکەسێک بدرێت، عەقڵی لە دەست ئەدات و گەوج و کەر ئەبێت.

شاعیر لەو قەسیدەیەیدا، داخی دەروونی خۆی لە دەست چەرخی کە چ ڕفتار دەرئەبڕێت و لای خۆیەوە بڕیار ئەدات سەری خۆی هەڵگرێت و ڕوو لە چۆڵەوانی غەریبی بکات... دیارە مەبەستی: خۆ دابڕینە لەدنیاو ئەیەوێ لە گۆشەی خانەقا و خەڵوەتگادا بژی...

(٢) لە دەفتەری دەستنووسی چوارەمدا ئەو بەیتە بەمجۆرە نووسراوە:

نەوکو من مردم بەدەستی چەرخەوە
موسەوی هەم عیسەوی، ئەهلی سەلیب

واتە: چەرخی غەددار، ستەمی لە هەمووان کردووە، جیاوازی لە نێوان خواناس و خوانەناس و جوولەکە و فەلەشا نەکردوو.

– موسەوی: جوولەکەکان... ئەوانەی پەیڕەوی تەورات حەزرەتی موسانەکەت

– عیسەوی: مەسیحیەکان ئەوانەی پەیڕەوی ئینجیل و حەزرەتی عیسا ئەکەن

(٣) لە دەفتەری دەستنووسی چوارەمدا ئەو بەیتە بەمجۆرەش نووسراوە:

چەرخی زاڵم بوو بەکابووس و شەوە
زۆرکەست خستۆتە بن باری ڕەقیب

– شەوە: زیندەوەرێکی خەیاڵی و ئەفسانەییە، گوایە: کاتێ ئافرەت منداڵی ئەبێ، گەر هوشیارنەبن



لێی، ئەوا شەوەدێت ئەیخنکێنێ... ئەمەش لەوەوە هاتووە کە شەوە ئافرەتێکی وەجاخ کوێرە و زۆر منداڵی خۆش ئەوێت و دێتە لای ئەو منداڵە ساوایەی تازە لە دایک بووە، بەخۆیەوە ئەیگوشی و لە ئەنجامدا منداڵەکە ئەخنکێ!!

***

باغـەکـەم بێ گـوڵ بووە گـریانمە وەک عـەندەلیب
زامی دڵ وێرانە وا ڕەحـمێ بەحـاڵم کـە تەبیب[1]
چاوەکـەم بێ تۆ بەهارم دوایی کـاتی پاییـزە
سـا، وەرە عـومـرم بەبا نەڕوا حـەبیب
شـۆخ و شـەنگ و نازکی لایەق بووە بۆ شـەتنی تۆ
بۆیە سجدەت بۆ ئەبات موفتی لەگەڵ قازی و نەقیب[2]
عـالەمێ سـووتاوی تیـشکی ڕۆژی ڕووی پاکی تۆن
(ئەسعەد)ی پەروا نەماوە دوور لە ڕووخسارت عەجیب[3]

١٩٤٠

---

(١) دووری و نامۆیی کزە لە جەرگی مرۆڤ هەڵئەسینێت، ئەمە لای کەسانی هەست ناسک کۆشکێکی قـەشـەنگی شـیـعـری لێ پێک ئەهێنێت... شـاعـیـر گـیـرۆدەی دەرو داوی دووری عـاشق و خۆشەویستەکەی بووە.

– عەندەلیب: مەلێکی دیمەن جوانی پەڕ ڕەنگاوڕەنگە.

(٢) موفتی: مەبەست لەو مرۆڤە زانا ئاینییەیە کە پلە و پایەی زانستی گەیشتۆتە ڕادەیەک لە شارەزای ئاین و شەرعدا... (فەتوا) و ڕێنمایی بۆ موسڵمانان دەرئەکات.

– قازی: ئێستە بەدادوەر ئەوترێ، بەڵام ئەوەی لە بارەی قازیەوە زانراوە، ئەو زانا ئاینیەیە کە شارەزای تەواوی لە بوارەکانی ئەحکامی شەرعیە ئیسلامیدا هەیە. بەتاییەت: بۆ کاروباری نێوان پیاوژن... هەر لە مارەکردنی کوڕ و کیژ، تا چارەسەرکردنی هەرکێشەیەک کە لە نێوانیاندا ڕوو ئەدات... هەروەها دەربارەی میرات و گەلێک کاری پەیوەندیداری دی.

– نەقیب: سـەرۆکی هۆز و نەتەوە، پیـاوی گـەورەی نەتەوەکـە سـەرپەرشـتی بەڕێوەبردنی کاروبارەکانیان ئەکات.

(٣) تەتۆن: لە فەرهەنگی دانشگای ژمارە (١) بەم واتایە هاتووە تەتۆن: توتن... لەمە زیاترم بۆ ساغ نەبووە بەڵام توتن لەگەڵ واتای بەیتەدا ڕێک ناکەوێت. ئەگەر (ئەتۆن) نەبێت؟.

***



**لە پێناوی خۆشەویستا**

من لەگەڵ مـەجنونم و دڵ بوو بەجـووتێ عـەندەلیب
ڕۆحەکەم؛ پەروانەیە، کەوتۆتە دوی یاری غەریب[1]
غـەم بەسـەرمـا؛ هاتە بارش؛ نەگـبـەتی جـەرگی بڕیم
بێ کەس و بێ داڵدەشم، ماوم لە دنیادا عەجیب[2]
تووڕەیە؛ مـەعـشـوقـە ئەمـڕۆ، قـوڕ بەدامـان و سـەرم
جووتە مـاری زوڵفـەکـانی، وا لە من بوونە سـەلیب
سـەد کـەڕەت با تیـرە بارانی بکاتن سـینەکـەم
هەر لە پێناوی ئەنێم، پێی لێـبنێ دۆسـتی لەبیب
شیـرەخۆرە (ئەسعـەد)ە مەمکۆڵەکەی سێـوی ئەوێ
ڕۆژ و شەو هاوارییە؛ شیـوەن ئەکاتن بۆ حەلیب[3]

١٩٧١

---

(١) کەم پارچە شیعر و قەسیدەی شاعیر هەیە لە چەند جارێک زیاتر وردەکاری هونەری جوانکاری و گوزارەبێـژی تیـا بەکـارنەهێنابێ، بەڵکو هەندێک جار لە تەنیـا بەیتـێکیـدا پەنای بۆ هونەرەکـانی ڕەوانبێـژی بردووە، لەوبەیتـەدا هونەری جوانکاری پێچەوپەخش -لف و نشر-ی بەکارهێناوە ئەوا مـەجنون کـە شـێت و شـەیدایەو خـودی شـاعـیـرە و لە عـجـزی بەیتـەکـەدا ڕۆحەکـەی بۆتە پەروانە و بەدەوری عاشقدا ئەگەڕێ.

(٢) بارش: باران بارین...

لەو بەیتەدا مەبەست لەوەیە: غەم بەسەرمادا باری...

– بێ داڵدەشم: بێ شوێن و پەناگام.

(٣) ئەم بەیتـە شیـعرەیە، پێویسـتی بەنەرمە هەڵوێستـەیەک هەیە چونکە شاعـیر زۆر جـوان و سەرنج ڕاکێش دیمەنی ناسکی شیـعری پێشکەش کردووین ئەوەتا ئەسعـەد خـۆی کردووە بەمناڵی ساوا و شیرە خۆر، بەڵام ئەم لە تەمەنێکی هەڵکشاوی ژیانیـایە و مەمکی وەک سێوی ئەوێ، بۆیە هەمیشە ڕۆژ و شەو، هاوار ئەکاو شیوەن بۆ ئەو شوێنە ئەکات سەرچاوەی شیردانەو خۆی لەو مەمکۆڵە تورت و پتەو قوتەدا ئەنوێنی کە وەک سێوە لە بواری جوانکاریدا لێکچواندنێکی جوان لە نێوان مەمکۆڵە و سێودا هەیە

***

پێشەنێ کەر بێ قەتاری وا لە قوڕدا گوێچکە تەپ
خاوەنی داماوەتن بێ ڕەونەق و بێ گاڵت و گەپ[1]
هەوری غەم کەوتە سەما بارانی میحنەت بۆ زەوی
قوڕ بەسەر خاکی وەتەن تێی بەربووە جانی بەقەپ[2]
بانگوشم دەس ناکەوێ خانوو ڕماو و بێ کەسم
ڕاستی دەستم بوو شکا بێ کەڵکە یا بەدەستی چەپ[3]
باوەڕم وایە کە نەحس و نەگبەتی عێراقی گرت
بێ موبالاتی لە دین و زاڵمی ئینسانی چەپ
یەک هەزار و نۆسەد و حەفتایە (ئەسعەد) دڵ بەغەم
تەوقە ناکەم دەستی جانی پیسە پەنجەو ناوی لەپ

١٩٧٠/١/١

(١) پێشەن: پێشەنگی؛ پێشڕەوی.
– قەتار: کاروان.
– گوێچکەتەپ: گوێچکە شۆڕ، مەبەست لەوەیە لە ڕۆیشتنندا تەمەڵ و هێواشە.
تەپ: شۆڕ، تەپی دا.
– بێ ڕەونەق: بێ شەوق
گاڵ: دەنگە دەنگ... قیژ و هۆڕ... گاڵت: گاڵی تۆ، قیژوهۆڕی تۆ.
– گەپ: گاڵتەو سوبعەت کردن.
ئەشتوانین هەردوو وشەکە (گاڵت و گەپ) بەواتای گاڵتەوگەپ لێکبدەینەوە، بەڵام ئەمەیان لەگەڵ واتای بەیتەکەدا کەمتر ئەگونجێت و گاڵ بەواتای دەنگە دەنگ و قیژ و هۆڕ و هەراکردن باشتر ڕێک ئەکەوێت.
(٢) جانی: جوانو– بەچکەی ماین، ئەگەرچی لەبواری یاسادا، جانی بەو کەسە ئەوترێ، دەستدرێژی بۆ سەر مافی کەسێکی دی ئەکات... بەڵام واتای یەکەم لەگەڵ بەیتەکەدا ڕێک ئەکەوێت چونکە جانی یاخود جوانو قەپ ئەگرێت دەنا دەستدرێژکەر بوایە، سەرواکە ئەبوو؛ وشەیەکی دی.
(٣) بانگوش: مەبەست لەو مرۆڤەیە کە سەربانی خانووی گڵ بە باگرتێن ئەگێڕێت، بۆ ئەوەی دڵۆپە نەکات.

***



(السلام) ئەی دولبەرا ڕوحم فیدات
دڵ ئەزانێ زۆر دەمێکە وا لە لات[1]
لات و بێ مایەو فەقیر و قوڕ بەسەر
چاوەڕێی لوتفێکتە بیکە خەڵات
سجدە بۆ ڕووت با بەرن ڕوو لامەدە
نوێژی تاریکی نەکەن وا ڕۆژهەڵات
بەردی بن پێت لازمە بۆ پادشا
بیکەنە تاج و بکەونە خاکی پات
بەس بکە خەندە بەحاڵی من ڕەقیب
حاڵی عالەم عارضێکە بێ سوبات[2]
نابینی خەڵکی سوباتێکی نییە؛
هەر وەکو تاسی حەمام دەوران ئەکات
چونکە ڕۆیی عالەمی ڕاست و دروست
بمرە (ئەسعەد) تا زووە بێ دەنگ و مات

١٩٦٠

(١) دولبەر: مەبەست حەزرەتی محەمەدە (د.خ). ناوەرۆکی شیعرەکە ستایشی ڕەوشت و خەسڵەتە جوان و پیرۆزەکانی پێغەمبەرە «د.خ»، بۆیە شاعیر لەو ڕوانگەیەوە نەک هانی موسڵمانان ئەدات ڕووبکەنە بارەگاکەی و خۆڵ و بەردی بن پێی بکەنە سەر سەرو وەک تاجێکی پیرۆز و مەزن سەیری بکەن.
(٢) سوبات: مەبەست لە خۆڕاگرتن و ئارامگرتنە، بێ سوبات: لەسەر بیروڕای خۆی سەقامگیرنابێ.

***

ئاسیاوی سینەکەم خستوویە گەڕ دجلە و فورات
جۆگەیی جۆماڵی ناوێ، غەم ئەوا لافاوی هات(١)
یار سەری کێشا لەکەل، ئەستێرە و مانگیش نەما
خەڵکی سەرسامە ئەمە نیوەی شەوە بۆ ڕۆژهەڵات؟(٢)
ماڵی ئاوابێ، دڵم بۆ عالەمێ خۆی بەخت ئەکا
ڕۆحەکەم ئامادەکرد، نزدیکە دێ جەژنی بەرات(٣)
شەو بەراتی لێئەکەم، ڕەحمێ بەعەبدی خۆی بکات
موستەحەق و بێکەس و بێ داڵدەشم، بێنە بەرات
زۆر دەمێکە؛ ئەم فەقیرە؛ مەیلی سووتانن ئەکا
وا بەئاماڵی گەیی؛ پیرۆزی بێ، ڕێگەی نەجات
(إرث)ی عاشق، شیوەنە؛ یاخود وەکو پەروانەیە
بابسووتێ، چاترە (ئەسعەد) بیێتە خاکی پات(٤)

---

(١) شیعر لای شاعیری بەتوانا خۆی بەدوای بەکارهێنانی هونەریدا ئەگەڕێ و داهێنان لە بنیاتنانی هەیکەلی شیعری ئەهێنێتە کایەوە... ئەو دیاردەیە لەم قەسیدەیەدا ڕەچاو ئەکرێ.
لەو بەیتەدا کە دجلە و فورات کە دوو ڕووبارن و سەرچاوەکەیان کوردستانی تورکیایە و بەعێراقدا تێدەپەڕن ئاشی سینەی شاعیر ئەگێڕێت، بەڵام بەهۆی زەرووریەتی هونەری شیعرییەوە، دجلە و فورات شوێنی خۆیان لە سەرەوای دێرەکەدا بینیوەتەوە، شاعیر لە دەرخستنی لافاوی غەم و پەستیی خۆیدا ئەڵێ:
خەڵکینە جۆگەی برینی جەستەم جۆماڵ و پاکردنەوەی ناوێت، بەڵکو لافاوی غەم ڕایئەماڵێ.
ئاسیاو: ئاش.
– جۆماڵ: پاکردنەوەی جۆگەیەو ئەمەش بەهاریکاری گەلە کۆمەکی ئەنجام ئەدرێت.
(٢) یەکێک لەو هونەرە وردو بەسەلیقەیەی شاعیری شارەزا و ڕۆشنبیر پەنای بۆ ئەبات و دیمەنی جوانی بەشیعرەکە ئەبەخشێت، وێنەی شیعرییە ئەو وێنەیەی خەیاڵی بیسەری شیعرەکەی پێ مەست ئەبێ... ئەوەتا شاعیر لەم بوارەشدا خۆی نواندووە و چەند سەرنجڕاکێش ئەڵێ: یار سەری کێشا و لە درزی دەرگا یاخود لە پەنجەرەوە کە ئەو چواندویتی بە (کەل) دیارە یار لەشەودا ئەمەی کردووە بۆیە بەتیشکی ڕووناکیەکەی ئەستێرە و مانگ ورشە و تریفەیان نەمان... بۆیە خەڵکی لەمە سەرسام بوون و وتیان: ئەمە چییەو چی ڕوویداوە، بەم نیوە شەوە دنیا ڕۆشن بۆتەوە، ئاخۆ ڕۆژهەڵاتووە؟... یاخود عەجایباتێک ڕوویداوە؟.



(٣) جەژنی بەرات: بەرات: مزەو بەخشیش و خەڵاتە.
جەژنی بەرات لەو شەوەدا منالان کردوویانە بەپیشەی خۆیان، هەریەکەیان توورەکەیەک یاخود جامێک ئەگرن بەدەستەوە و ڕوو لە یەکەیەکەی ماڵانی گەڕەک ئەکەن و ئەڵێن.

شەوی شەوی بەراتێ
خوا دوو کوڕ و کچێکتان باتێ
دەست لە کەنو وەبگێڕن
بەشی منالان بنێڕن

خاوەن ماڵێک بۆ ئەوەی ئەو منالانە دڵخۆش بکات نوقوڵ و خورما و مێوژ و و هەندێک جار پارەشیان ئەدەنێ خۆ گەر خاوەن ماڵەکە لە وەڵامدانەوەدا دواکەوێت ئەوا منالەکان بەیەک دەنگ ئەڵێن: دەی بەراتی کەن.
(٤) (إرث): میرات... و (إرث)ی عەشق واتە: ئەوانەی خۆیان لەپێناوی خۆشەویستی عاشقەکانیاندا بەخت ئەکەن.

***

## سەردار و میری بێ سوبات

خۆشی دڵ ئەمڕۆ نەماوە بێ لە شوێنێکی وڵات
(لات) و (عُزّا) پڕ بەشارە ژیر و دانا بوو بەقات[١]
ناکەسی (هاتی) لەگەڵدا بێ بە(کەس) ناوی ئەبەن
ناکەسە عەللامەیە، بەختی بەدی بێت و نەهات
ئەمپەڕە و ئەو پەڕ چاوەکەت کاری نەکات بڕوانە تۆ
نابینێ پیاوێ بناسێ، غەیری لاتێ بێ لەلات
سەیری نەهج و پەیڕەوی هەستانەکەی باوان ئەکەم
گێژ و وێژ و وڕ ئەبم دایما سەرسام و مات
چۆتە سەر کورسی حوکم جەردەی خەبیس و ناعەدل
لایقە بۆ جیلی وا سەردار و میری بێ سوبات[٢]
هەڵپەڕینت بێ؛ لەسەر دووپەت نیشانەی بۆ شیتە
پینەیی ڕانگری، مەلا، سوخمە و کەوات[٣]
کەی بووە، دەستێکی وا هەڵگری دووخەربۆتە
تەفرەیی نەفست نەدا، بتخاتە زیندانی مەمات[٤]
بێ نەوا (ئەسعەد) دڵت با وانەکا مەیلی نەوا
باری کرد، سەیر و سەفا، نەگبەتی میوانە لات

١٩٧٤/٤/٥

---

(١) لات و (عُزّا)- عوزا: دووبتی بەناوبانگبوون، عەرەب بەر لە هاتنی ئاینی پیرۆزی ئیسلام لە کەعبە پەرستوویانن.
- لات: بەنابووت و هەژار و کەم دەستیش دێت.
- بوو بەقات: شتێ گەر بەزەحمەت چنگکەوێت ئەڵێن: قاتی بووە.
(٢) جەردە: چەتە... ڕاوڕووتکەر.
- خەبیس: پۆخڵ، پیس... ناپاک.
- لایقە: شایستەیە.
(٣) سوخمە و کەوا: دوو جلوبەرگی کوردییە و فەقێ و مەلا لەبەریان ئەکرد.



(٤) لە دەستنووسەکەدا خەربۆتە نووسراوە... ئەگەر بەتەنیا بنووسرایە (خەر+ بۆتە) هەڵبەت واتای کەسانی گەوجی ئەدا، خۆ گەر (خەربەتە)بێت بەواتای تێکدان ئەمە لەگەڵ واتای بەیتەکەدا ناگونجێ، بۆیە پێ ئەچێت؛ خەربەتەی فارسی بێت بەواتای کەسانی گێل و گەوج ئەمە لەگەڵ واتای بەیتەکەدا زیاتر ئەگونجێت.
- مەمات: مردن و نەمان، زیندانی مەمات: زیندانی مەرگ و مردن.

شاعیر ئەو قەسیدەیەی لە ١٩٧٤/٤/٥ داهۆنیوەتەوە، ئا لەو ساتەدا ڕژێمی صەدامی بەعسی لە گفت و پەیمانەکانی بەرامبەر کورد پاشکەزبووەوە و بڕیاری ئەوەی دا دیسان شەڕ لەگەڵ میللەتی کوردا بکات و شۆڕشی ئەیلوول نەهێڵێت... ئەوەبوو بەر لە ١٩٧٤/٣/١١ جەماوەری کوردستان بەهەموو چین و توێژەکانیەوە زۆربەی هەرەزۆریان ڕوویان کردە شاخ و باوەشی شۆڕش... شارەکانی سلێمانی و کەرکووک و هەولێر و دهۆک جگە لە کەرکووک: خەڵکێکی یەکجار کەمی تیاماو لەناو ئەو چەندانەی لە شارەکانی کوردستان مابوونەوە کەسانی سەر بەڕژێمی دیکتاتۆری بەعسی بەغدابوون.

شاعیر لەو قەسیدەیەدا... بارودۆخی سیاسیی و ژیانی ئاسایی خەڵکەکە بەجوانی و ڕاستگۆیی دەرئەخات و هەر بەمەش ئەو ڕاستییە ئەسەلمێنێت ئەدەب بەگشتی و شیعر بەتایبەت ئاوێنەی ژیان و واقیعی کۆمەڵە.

دیارە شاعیر لەدوابەیتی شیعرەکەیدا بیروڕای خۆی بۆ ئەنجامی ئەو حاڵەتە بەڕەشبینیەوە دەرئەخات و ئاکامیش وا دەرچوو.

کە کورد دوچاری نسکۆی شۆڕشە مەزنەکەی بوو... ئەو نسکۆیەش بەپێی نەخشەیەی ڕەنگ بۆ ڕێژراو و پیلانی ڕەشی ٦ ئاداری ساڵی ٥١٩٧٥ کە بەڕێکەوتننامەی جەزائیر بەناوبانگە ئەنجام درا.

***

ئەی خودا وا مامەوە مەئیووسی خاکە پاکەکەت
بێ نسیبی زیارەتی (شباکی) شاهە چاکەکەت[١]

با هەتا ڕۆژی حەشر چاوی تەریقی دابخەم
وا بەسەر سەر ناگەمە فەخری کورەی ئەفلاکەکەت[٢]

عالمی سرِ و خەفییاتی ئەتۆ چی من بدەم
ئارەزوو مەندی نمێکی بەحری ئەنوارەکەت[٣]

تەختمە توونی مەدینە پادشاهیم کولْخەنی
پێم ببەخشە تۆز و گەردی خاکی عەمبەر ناکەکەت[٤]

کەی (ملوَّث) بوو بەسەگ دەریا هەتا ڕێگەم نەبێ
بچمە خاکی مەرقەدی پاکی (محمد) ناوەکەت[٥]

(ئەسعەدا) ببڕە زبانت بەسیەتی تەرکی ئەدەب
ئایەتی لاتقنطوا بێ دافعی غەم نامەکەت[٦]

١٩٦٠

---

(١) مەئیووس: نائومێد، بێ هیوایی.
- بێ نسیبی: بەنسیبمبێت... واتە بەزیارەتی بگەم.
- (شباکی) پەنجەرەیەک، مەبەست مەزاری پاکی حەزرەتی محەمەدە (د.خ).

(٢) تەریقی: تەریق- شەرم...
- فەخری کورەی ئەفلاکەکەت: مەبەست پێغەمبەری موسڵمانانە، حەزرەتی محەمەدە (د.خ).

(٣) سرِ: نهێنی.
- خەفییاتی: لایەنە شاراوەکانی بواری ئایین.
- نمێکی بەحری: دڵۆپێک لە دەریای.
- ئەنوار: کۆی نورە: ڕووناکی و بەرەکەتی ئیلاهی.

(٤) گوڵخەنی: تونچێتی.
لەم بەیتەدا شاعیر ئەوەندە پابەندی خۆی بەعەشق و خۆشەویستی پێغەمبەری موسڵمانانەوە دەرئەبڕی بەجۆرێک ئەڵێ تونچینی و ژیان لەناو توونی مەدینەدا کە جێنزرگەی محەمەد (د.خ)یە. لای من پاشایەتییە. بۆیە ڕوو لە یەزدانی پاک و میهربان ئەکات، ئەو تۆز و گەردەی بەنسیب بێت ئەسڵەن لای ئەم خاکەکە عەنبەرناکەو بۆی خۆشی عەبیری لێدێت.



(٥) (ملوَّث): پیس و زۆرجار بەگڵاویش دێت.
شاعیر ئەپاڕێتەوە و داوا ئەکات بەزیارەتی مەرقەدی پاکی محەمەد (د.خ) شادبێت... شاعیر بەراوردێکی جوانی لەنێوان خۆی و ئەو پەندەی پێشیناندا کردووە، کە ئەڵێ:
دەریا بەدەمی سەگ پیس نابێ... واتە: شاعیر ئەڵێ: کە لە ژیاندا هێندە خوا پەرستیم نەکردبێ و لەو سەگەش پیستربم، خۆ بەهاتنم و زیارەتی کەعبە، مەرقەدی پێغەمبەر لە کەدار نابێ.

(٦) لاتقنطوا: شاعیر لە پەراوێزی شیعرەکەیدا نووسیوویە واتاکەی ئەوەیە بێ هیوا مەبە. شاعیر وشە و زاراویەکی نوێی لەم بەیتەدا داهێناوە ئەویش (غەمنامەیە) کە بەشێوەیەکی جوان ڕوونبێژی پێوە دیارەو بەیتەکەی ڕازاندۆتەوە.

***

ئەکەم شوکری هەموو کاتێ خودا شوکرت
خـەلاتم ئاهو ناڵینە خـودا شـوکـرت[١]
لە زومـرەی گـۆشـەگـیـرانا منم بێ کـەس
کـەڕ و لەرزۆک و دامـاوم خـودا شـوکـرت
لەمن پیس و چەپەڵتر کوا لە ڕووی ئەرزا؟
بەڵا ڕەحمەت لە حەد زیادە خودا شوکرت
لـەبن باری گـــــوناها ڕوو ڕەشم ئـەمما
بەدایم هەر ئەڵێم تەوبە خـودا شـوکـرت

١٩٧٢/٢/١٢

---

(١) زۆرجار زمـانی ساکـار و ئاسان، هێز و پێزێکی لەبن نەهاتوو، بەشیعر ئەدات... ئەو ساکـاریە لە دەربڕیندا ڕەوانی و ڕوونی شیعرەکە ئەگەیێنێ و مرۆڤ زوو بەزوو ئاشنای ئەبێت.
شاعیر لەم شیعرەیدا ئەو شێوازەی بەکارهێناوە، ئەمە و سەرەڕای ئەوەی: هەر لە هونەری وردەکاری شیعری بێبەش نییە... ئەوەتا سەروا دوو یاخود دوو سەرروای (التشریع)ی بەکارهێناوە و بریتییە لە (خودا + شوکرت).

***



ئەمکوژێ لەیلا بەعـیـشـوە و چاوی مـەست
مـاری زوڵفی گـەردنی مـەجنونی گـەست[١]
(ئەو) کـە مـەیلی کـوشـتنی ئێـمـەی نەبوو
بۆیە دوشـمن دوو دەستی مەفـتونی بەست[٢]
دیـارە فـکری زۆر خـــــراپە و نـاڕەحـــــەت
گـــرژ و مـــۆنە وا لە پڕ پشـــتـــێنی بەست
چونکە خـــەســـرەو بێ ئەدەب نامـــەی دڕی
عـەیشی شـیـرینی بەتاڵی چوو لە دەست[٣]
تا نەمـــردووی تۆبە کـــە ئەی (ئەسـعـــەدا)
ڕوو لە شەرعی (مصطفی) کە بێرە بەست[٤]

---

(١) عیشوە: نازە...
لەو بەیتەدا ناوی لەیل هاتووە کە مەجنوونی شێت و شەیدا و وێڵی دەر و چۆڵەوانی کرد و شاعیر خۆی بەمەجنون و خۆشەویستەکەی بەلەیلا داناوە و بەمەبەستی جوانکاری لە شیعرەکەدا زوڵفی یارەکەی بەمـار چوانەوە کە جار بەجار بەر گەردنی ئەکەوێت، هەروەک چۆن مـار ئەگەزێ و پێوە ئەدات.
(٢) مەفتونی: شێت و شەیدای، دیوانە.
(٣) لەم بەیتەدا ئاماژە بەشیرین و خەسرەو کراوە و ئەو ڕووداوەی نێوان ئەو دوو عاشقە سەودا سەرەی بەپەند و ئامۆژگاری هێناوەتەوە و ئەڵێ: خەسرەو لە ئەنجامی هەڵەیەکی بچووکی خۆی و دوور لە عورفی عاشقان مامەڵەی لەگەڵ هەواڵ یاخود نامەکەدا کرد، هاوسەری شیرینی بەکارەسات و ناخۆش لە دەستدا.
(٤) بێرە دەست: قسە بکەو هەڵوێست بنوێنەو بڕیاری خۆت بدە.

***

## سەرگوزەشتەی وەڕسبوون

حەق پەرستی پیشـەمـە، نابم بەمـیـری شـاخ و دەشت
خـادیمی مـزگـەوتم و مـەیلم نیـیـە سـەیران و گـەشت[١]
دیـتـنی حــــەق (جنة المأوى)یە بـۆ من نـامــــەوێ
حـوری و غـیلمـان و قـەسـرو مـیـوەیی باغی بەهەشت[٢]
ئاخــــریدێ، دەوڵەت و بێ دەوڵـەتی شـــایی و گـــەدا
قیمەتی کوا خان و مان و مالکی (گیلان) و (ڕەشت)[٣]
تاکــو گــەنجی؛ بەفــیـــڕۆی ئەدەی کـــاتت هەمــــوو
دەسـتەو ئەژنۆ؛ دا ئەنیشی بویە مامـەی شەست و هەشت
بەو نەسـیـمـەی؛ دێ لەلای مـەحـبـووبەوە، من پێی ئەژیم
لازمی (ئەسـعـەد) نیـیـە سـۆزەی بەهار و بای وەشت[٤]

١٩٧١

---

(١) خادمیی مزگەوت: هەر تەنیا مەبەست لە مجەور نییە، بەڵکو بەهەمـوو ئەوانە ئەوترێت خزمەتی مزگەوت نەکەن.

– مەیلم نییە: هەوەس و ئارەزووم نییە.

(٢) حۆری: فریشتەی بەهەشت و غیلمان: لاوی جوان و قەشەنگی بەهەشت.

شاعیر هەڵوێستی خۆی دەرئەخات و ئەڵێ دەرکەوتنی ڕاستی و هەق کە دیارە مەبەستی گەیشتنە بەنووری پیرۆزی پێغەمبەر محەمەد (د.خ) لای ئەو تا ئەوە بەهەشتە...

کەواتە هەق وەکو بەهەشتی خودا پێداوانە... بۆیە دوای ئەوە: هیچ یەکێک لە حۆری و غلیمان و قەسرو میوەی باغی بەهەشتی ناوێت کە یاداشتی پیاوچاکانە و لەلایەن خودای میهرەبانەوە بەمرۆڤی سەر ڕاست ئەبەخشێت.

(٣) ئاخریدێ– ئاخری دێ: کۆتایی دێت.

– گـیـلان و ڕەشت: دوو ناوچەی بەپیت و بەرەکـەتن لە ئێـران و بەبرنجی نایاب ناوبانگیـان دەرکردووە.

(٤) نەسیم: شەماڵ... بایەکی فێنکە.

– بای وەشت: بایەکی فێنکە لە سلێمانی ئەو هەوا سازگار و فێنکەی لە قیبلەوە هەڵئەکات، پێ ئەوترێت: بای وەشت.



ئەی گـەل چ بڵـێم: خـاینی تۆ، دەرحـەقی خـۆشت
غـەمبـاری بەوەی ڕەحمێ نەکا دەرحەقی خۆشت[١]
هەر بوخل و حـەسـەد دەسـتـە جلە پڕ بە بەری تۆ
نابینێ ڕەوا ڕوتبـەیی (شـا) دەرحـەقی خـۆشت[٢]
نۆکــەری بۆ عــــالەمی بێگـانە هەمـــوو دەم
پڕ کـەیفی بەنادانی وەها دەرحــەقی خــۆشت[٣]
هەرچی کــــە ئـەڵێم داخی دڵە دێ لە دەروونم
چەوت و چەمش و پیس و بەدی دەرحەقی خۆشت[٤]

---

(١) خاینی تۆ: خاینی گەل.

(٢) بوخل و حـەسـەد: بەخیلی و حەسوودی، لای کورد هەردوو وشەکە یەک واتا ئەگرێتەوە، بەوانە ئەوترێ: چاویان بەخۆشی و پێشکەوتنیان هەڵنایەو هەمیشە چاویان پیا هەڵئەهێنن.. ئەمانە بەرچاو تەنگ و خۆویستن... شاعیر وێنەیەکی شیعری جوانی پێشکەش کردوە و بەخیل و حەسوودی بەدەستەجل چواندووە و لەبەری خاینانی گەلی کردوون.

(٣) نادانی: نەزانی و گێل و ئاگای لە گۆڕانکاریەکانی دەوروبەر و دنیانییە.

(٤) چەمش: لێرەدا بەواتای مەکر باز، یاخود چاوڕاو دێ.

شاعیر لە سەرجەم بەیتە شیعرەکانی ئەم پارچەیەیدا، بۆ جوانکاری لە دنیای ڕەوانبێژیدا، پەنای بۆ هونەری دوو سەروا (التشریع) بردووە، ئەویش (دەرحەقی+ خۆشت).

***

ئازاری مـــەدە دڵ بەدەمی غـــونچـــەیی زامت
چون دیلە وەها ئێـــتـــە بەدەم دانەیی دامت(*)(١)

عـاشق هەموو وەسـتاوە لە سجدەی خەمی ئەبرۆت
تا شـوعلە ئەدا فـامی قـیـامـەت بەقـیـامت(٢)

بۆ کـووشتنی من تـیری مـوژەو لەشکری گێـسـوت
هاتوونە چەمەن مل کـەچە بۆ ئێـستە کـەلامت(٣)

بەو خـــۆرە کـــە ئێـــوارە لە یاقـــوتی لەبی دا
ڕووناکـە (افق) پۆلی مـەلەک هاتە سـەلامت(٤)

شەت بێ؛ بەمەیی سەقفی سەما بیکەمە پیاڵە
مـەیلی نەکـەمێ غـەیری دەم و دیدەیی بامت(٥)

جورمی چیـیـە وا (ئەسعـەد)ی بێـچارە بەقـوربان
مەنعی ئەکەی ئەمرۆ لە لەب و گەردنی جامت(٦)

١٩٣٧

---

(*) تێکڕا شیـعـرەکە دەستی هونەریی بەرزی شیـعری پێوەیە و گرنگیش لەوەدایە، سـاڵی **١٩٣٧** ئەم شیـعرەی هۆنیـوەتەوە، لە کاتێکدا شاعیـر لە هەرەتی لاویی و خوێن گەرمیـدا بووە و جارێ حزبی برایش پێکنەهاتووە.

١- دامت: لێرەدا مەبەست لە تەپکەو داوە.

واتە: ئازیزەم ئازاری دڵم بەگوفتی دوو لێوت مەدە کە غونچەی زامی: بەدەمی گوڵینی چواندووە، ئەو پاڕانەوەیەی لەبەرئەوەیە کە ئەڵێ:

باش بزانە، پێویست بەو ئازاردانەم ناکات

چونکە من دەمێکە بەو دانەیی داوەت دیلم و خۆم بەدەستەوە داوە...

(٢) شوعلە: مەشخەڵ.

شـاعـیـر وەسـتـایەتێکی زیرەکـانەی لەبواری ڕەوانبـێـژیدا نواندووە و لە نێـوان وشـەی (قـیـامـەت بەقـیـامت) ڕەگـەز دۆزیەکی تەواوی (الجناس التـام) بەکـارهێناوە، (قـیـامـەت)ی یەکـەم بەواتای مەبەست ڕۆژی قـیـامـەت، بەڵام (قـیـامت) مـەبەسـتی هەڵسـانە سـەرپێ و خۆ دەرخسـتنە، تا باڵای بنوێنێ.

(٣) گێسوت: پرچت.



– چەمەن: چیمەن... یاخود سەوزایەکی بەهێز و جوان.

(٤) یاقووت: بەردێکی ئاڵی ڕەنگ خوێنینەو بەهادار و بەنرخە.

– لەب: لێو.

– أفق: شاعیر لە پەراوێزی دەفتەری ژمارە چواری ئەو شیعرەدا نووسیوویە؛ واتای کەناری ئاسمان، أفق؛ ئاسۆش ئەگەیێنێ.

– مەلەک: ملائکە: فریشتەی ئاسمان.

(٥) شەت: (شط) لە ڕووبار گەورەترەو لە دەریا بچوکتر.

– بام: لێرەدا زیاتر بەمەبەستی ڕووناکی بەری بەیان، کازێوە دێت.

شاعیر لێکچوونێکی جوان و ناسکی لە نێوان شەت و ئاسماندا دروست کردووە کە ئەڵێ: (شەت بێ بەمەی سەقفی سەما) هەردووکیان لە شینیدا یەک ئەگرنەوە...

(٦) جورمی چییە؟: تاوانی چییە؟.

– گەردنی جاکت: گەردنی بلووریت... ئەمەش جوانکاریەکی وردی تیا بەکارهاتووە و لێکچوونی نێوان گەردنی شووشەیی لە ناسکی و سپێتیدایە.

***

## ستایشی پێغەمبەر

نزیکی جەژنی قوربانی (محەمەد) خۆم بەقوربانت
بەفریاماکەوە شاها سبەینێ دەست و دامانت[1]

بەری دار و شەقی ناکەم، زەعیف و ناتەوانێکم
شەفیعی تۆ، لە بۆ عەبد و قولەو بەندەی پەرێشانت[2]

زوبانێ کوا بەیانیکا سەراپا موعجیزاتی تۆ
دەسی موسا نەگەییە شوعلەیی چاکی گریبانت[3]

لە (إعجازي نبوَّة) مەسنەدت مەعلوومی عالەم بوو
کە زانی تا قیامەت بەردەوامە حوکمی قورئانت[4]

لە باس خولقی شیرینت خودا فەرموویەتی وەسفت
بە(مازاغ البصر) رشتی بەیانی نووری چاوانت

لە کانی گەوهەری لوتفت، یەکە بێگانە و خزمت
چ ئەولادێکی حەیدەر بێ وەیا عەبدێکی دەربانت

بەئیکسیری مەدینە چاوەکانم وا جەلا داوە
ئەچێتە ناو دڵی (ئەسعەد) تەواوی شوعلەیی جوانت[5]

٦ی ذی الحجە ١٣٩٠ک

---

(١) ڕەگەز دۆزیەکی تەواو لە نێوان هەردوو وشەی (قوربان)دا هەیە... یەکەمیان مەبەستی جەژنی قوربانە و دووەمیان خۆی بەساقەو بەقوربانی ئەکا.
– شاها: مەبەستی پێغەمبەری موسڵمان محەمەدە (د.خ).

(٢) شەفیعی تۆ: بەهاناوە دێت و بۆ ئومەتی خۆت ئەپاڕێتەوە و داوای بەزەیی و لێبوردن لە خوای مەزن ئەکەیت.

(٣) گریبانت: یەخەی چاکەت، یەخەی کراس.

(٤) (إعجازي نبوَّة): مەبەست لەو کارە سەرسوڕهێنەر و موعجزانەیە کە پێغەمبەران، نیشانی ئومەتەکانیانداوە و موعجزەی پێغەمبەری ئێمەش (محەمەد) (د.خ)... ئەو قورئانە پیرۆزەیە کە لەلایەن خواوەندی میهرەبانەوە پێی بەخشراوە و لە وێنەی نەبووە و نییەو نابێ.

(٥) ئیکسیر: دەرمانێکی کیمیاویە وای لە بارەوە وتراوە ژیان بەخشە و جیوە ئەکات بەزیو و مس



بەئاڵتوون، هەروەها لە بواری فیکرییشەوە مەبەست لەوەیە، ئەو مرۆڤە ئەچێتە ژێر کاریگەری کەسێکی مەزن و گەورەوە، ئەگەر کەم و کورتیشی هەبێ، ئەبێتە پیاوێمی کامل...
بۆیە شاعیریش ئەڵێ: بەو ئیحا و کاریگەری پیرۆزی مەدینە چاوەکانم ڕووناکی ئەبینێ، واتا بەپیرۆزی شاری مەدینە کە گۆڕی پێغەمبەر محەمەد (د.خ) لێیە من بەو ئیکسیرە تەواو مەست بووم... ئەمە زیاتر لە بواری خواناسی و سوفیگەریدا خۆی ئەبینێتەوە...

***

## نامەرد هەرگیز مەردێتی نانوێنێ

کۆششت کاری پەسەند بێت و، نەکو فرمانی ڕووت
خاوەنی عیلم و ئەدەب، بەزێڕ و زەڕ مەیکە بەجووت
ئەو وتارانەی قەییم وتراو بەگشتی گەوهەرە
ڕوو لە ناکەس لابدە ئەتواریان مەیکە بەخووت[١]
قەت نەبیستراوە (تەرو) حەماڵی لێهەڵکەوتبێ
یا بەری خڕنووک و زی بێ برسیبە، بیکا بەقووت[٢]
بۆ وتەی شیرینی دوژمن، نەبووە جێی باوەڕبێ
سەد کەڕەت بێتن بەخەندە و ڕووی خۆشی ڕووبەڕووت
من دڵم پڕبوو لە پاڵانتەو درۆی ئەم عالەمە
بۆیە (ئەسعەد) گۆشەگیرە وا لەگەڵ غەم بوومە جووت[٣]

١٩٧١/٧/٢٢

---

(١) ئەتوار- أطوار: لێرەدا مەبەستی هەڵسوکەوت و ڕەوشت نواندن دێت.
- خووت: عادات و ڕەوشت...
(٢) تەرو: دەوەنە، واتا دارێکی کچکەی باریکە.
- حەماڵ: نیرگە، ئەو دارە ئەستوورە درێژیە کە دارە ڕای ژوور و هەیوانیان لەسەر دائەنا.
خڕنووک وزێ: دەوەنێکی بچووکە و بەریکی کەمیکی هەیە لە بەری توو ئەچێت...
- قووت: خواردن- خۆراک
شاعیر ئەڵێ بەری خڕنووک وزێ، هەرگیز برسێتی مرۆڤ تێر ناکات.
(٣) باڵانتە: وردە بەرد و پارچە خشت و زیخ.
ئەم پارچە شیعرەی شاعیر گوزارشت لەو ژان و ئازارانە ئەکات کە شاعیر دووچاری بووە، بەهۆی ئەوەی کەس و خەڵکەکان بەپێی دڵسۆزی و توانای خۆیان لە شوێنی شیاو دانەنراون، چونکە بەرد لە شوێنی خۆی سەنگینە

***



سەد حەیف ئەمڕۆ نییە نەی ماوەتن ساغی ڕەواج
پارە پارەن عالەمێ بۆ پارەیەکی عەینی ساج[١]
دەنگی زەڕ ئەهلی مەعانی خستە گورگە مێشەوە
زەر پەرستانی ولایەت ئابڕۆ بیسێنە باج[٢]
ئەو (ڕەزا) سووکەی کە دوێنێ پادشاهی ئێوە بوو
ئێستە ڕوو ترش و گەدا وامایەوە بۆ تەخت و تاج[٣]
کێ نیکاحی کرد ژنی مێرد دار و دنیای فاحیشە
پیاوی میری (مرتکب) مردن نەبێ چی بێ عیلاج[٤]
ئیشی خالق (ئەسعەدا) بۆ کەس تەواوی حەل نەبوو
پیاوی دوونی کردە شاهو پیاوی دانا بێ ڕەواج[٥]

١٩٤١

---

(١) ڕەواج: باو، بەکارهاتوو... وەک ئەڵێن: فلانە شت ڕەواجی هەیە... واتە فرۆختی هەیە.
- پارە پارە: کۆمەڵ کۆمەڵ... پارچە پارچە، کەرت و پەرت.
- ساج: ئەو تەشتە نیوە بازنگە قۆقزەیە کە لە پلێتی ئەستوور دروست ئەکرێت و بۆ نان برژاندن بەکاردێت.
لەم بەیتەدا ڕەگەزدۆزیەکی تەواو لە نێوان وشەکانی (پارە)دا هەیە و (پارە)ی یەکەم، پارچە و کەرتە و پارەی سێیەم پوڵ و دراوە.
(٢) زەڕ: زێڕ، ئاڵتوون.
- گورگەمیش: بەرژەوەندی ویست، خۆ ویست، بەزمان لووسی خۆهێنەرە پێش.
واتە خەڵکێک کەشت زان بوون کە بەرژەوەندیان هەست پێکرد، ئیتر بەزمان لووسی خۆیان هێنایە پێشەوە و شاعیر پێیان ئەڵێ: دەبڕۆ باجی منافقی خۆتان بچننەوە.
(٣) ڕەزا: مەبەستە ڕەزا شای پەهلەوی باوکی محەمەدی شاهەنشاهی ئێرانەو، و بەبیانووی ئەوەی عەقڵی تێکچووە، ئینگلیزەکان بەدیلی بردیان بۆ دوورگەی (قبرص) و لەوێ کوشتیان.
(٤) نیکاح: مارە بڕی ئافرەت بەشێوەیەکی شەرعی.
- مرتکب: ئەوەی کارێکی ناڕەوا یاخود تاوانێک ئەکات.
(٥) دوونی: پیاوی سووک و سەلیم، نامەرد، کردەوە ناشرین.

دولبـــەری من دەم لەدەم ناوی دەمی ئەغـــیـــارە بۆچ
پیس ئەکا ئەو غونچەیەی نەشکوفتەیەی سەردارە بۆچ(١)
کـۆمـەڵی عـاشق ئەفـەوتێنێ بەناری فـیـرقـەتی
بۆ دەمـاغی دوشـمنی ئێـمـە بڵێ ئەم نارە بۆچ(٢)
ئـەهـلـی دانـا دەوری ڕۆیـی ڕۆژی نـا ئـەهـلانـە وا
بۆ زەڕە هاتوونە زەڕ لەم گـێـتـیـیـەی بێ بارە بۆچ(٣)
حـورمـەت و علم و شـەڕەف باوی لە ناوانا نەمـا
وەعزی چی وا عـیـز ئەدا بردی حەیای ئەم شارە بۆچ(٤)
ئەی بەپەن بی سەرسەری وەک وەعزەکەت کردووە بەپەن
ناپەسـەن لۆقـەت ئەکـرد ئا پێم بڵێ ئەم غـارە بۆچ(٥)
قـیـمـەت و سوودی نیـیـە گـوفـتـارو علمی بێ عـەمـەل
هەر قـەنـاعـەت پادشـایە ناکـەسی بۆ پارە بۆچ
تۆ کـە مـردی (ئەسـعـەدا) با گـەنجی قـاروونت ببێ
خـاوەنی کـفـنێکی ڕووتی ئیکە ئەم بەدکـارە بۆچ

١٩٧٠/٦/٢٠

---

(١) ئەغیارە: ناحەز و نەیارە.
- نەشکوفتەیەی: نەپشکوتوەی.
(٢) فیرقەتی: جیابوونەوە لێی، واتای دوورکەوتنەوەش ئەدا.
- نار: ئاگر.
(٣) جوانکاریەکی ورد لە بواری ڕەگەزدۆزی تەواودا بۆ هەردوو وشەی (زەڕ) بەکارهاتووە... زەڕەی یەکەم بەواتای زێڕ و ئاڵتوون هاتووە و (زەڕ)ی دووەمیش بەواتای دەنگی زەڕەی کەر دێت.
(٤) وەعز: وعظ: ڕێنمای، ئامۆژگاری.
واعیز: واعظ: ئەو پیاوەی ئامۆژگاری ئەکات.
(٥) غار: لێرەدا بەواتای ڕۆیشتنی خێراو پەلە، وەک ئەوەی ئەڵێن: غاریدا، واتا بەپەلە ڕای کرد هەر لەم بەیتەدا ڕەگەزدۆزیەکی تەواو لە نێوان هەردوو وشەی (بەپەن)دا هەیە، یەکەمیان: بەپەنگ کردنە، واتە: ڕیسواکردن و هی دووەمیان (بەپەن) بەبەند واتە کردی بەپەند و ئامۆژگاری.

***



وا ئەبێ جـارێ ببـینێ ڕۆژی ڕووناکی فـەلاح
پڕ بەدڵ ئۆخـەی بڵێ؛! دۆزیمەوە ڕێگەی نەجـاح(١)
شـادمـانی بۆ گـەلێکە خـاوەنی علم و ئەدەب
نەک بەڕەڵا، بێ حەیا، بێ مەزهەب و ئەهلی مـوباح
شـەمـشـەمـە کـوێرە نەبێ کێ ئەبێ ڕۆژی نەوێ
ڕاپەڕە نووستن بەسە فەجری هەموو (قدکان لاح)(٢)
ئەو ژیانەی خـادیمی بێ، تف لە چارەی بێ نەبێ
ژینی ئازادی وەرە گـیـانی برا مـەیدە سـەمـاح(٣)
دەس بەکۆشی دوشمنا (ئەسعەد) نەکەی بێ هوودەیە
مـەخڵـەتێ ئیکە ئەوەن بەو خـائینانە بۆ نەجـاح(٤)

١٩٥٢

---

(١) فەلاح: جوتیار.
- نەجاح: سەرکەوتوو.
(٢) ئەهلی موباح: سەربەستێکی بێ سنوور، ئەو ئازادییەی خۆی بەهیچ یاسا و دابونەریتێکی ئایینی و کۆمەڵایەتیەوە نابەستێتەوە و ئەچێتە خانەی بەڕەڵڵاییەوە.
(٣) سەماح: لێرەدا بەمەبەستی ئەوەیە: لەدەستی مەدە.
(٤) بێ هوودە: بێ کەڵک و ئەنجام... بەفیرۆ چوو.
- مەخلەتێ: هەڵمەخەڵەتێ، لە خشتە نەبرێت.
بەپێی مێژووی شیعرەکە پێدەچێ شاعیر لە ئەنجامی ڕاپەڕینی فەللاحەکانی کوردستان و چەوساندنەوەیان لەلایەن زۆردار و ستەمکارەوە دەروونی جۆشابێت ئەم شیعرە لە دایکبووبێت.

***

وا ئەزانم تاکو ئەمرم هەر ئەخۆم زوخاوو ئاخ
شەرتی کردووە چەرخی بەد، بیدا بەمن هەر دەرد و داخ
شوکری بێ قەصری ئەکەم نەوکو قصورم بێتە سەر
ڕوو لە ناکەس وەر ئەگێڕم ئەمە پیاوت دەشت و شاخ[1]
تەرکی عالەم بۆ نەکەم نەفرەت لە حالّی من ئەکەن
عالەمی هەستی سەراسیمەن بەبێ کەیف و دەماخ[2]
بێ ملاح ئەم کەشتییە تا کەی لە گێژاوا ئەبێ
وەیشومەی شوومی زمانە وشک ئەکا بێستان و باخ[3]
دووکەڵی دڵ ئاهی سینە بوونە خزمم دایما
زامی جەرگم (ئەسعەدا) لازمێتی ناڵێن و ئاخ

١٩٥٩

(١) قەسری: قصر: کۆشک.
– قسروم: قصورم: کەموکورتیم.
ڕەگەزدۆزیەکی ناتەواو لە نێوان هەردوو وشەی قەسر و قسوردا هەیە... هەریەکەیان وەک لە پێشەوە دیاری کرا واتایەک ئەبەخشی.
(٢) سەراسیمەن: سەر لێشێواون، سەرگەردان و وێڵن، واتە ئەوان سەرگەردانن.
(٣) ملاح: مەبەست کەشتیوانە.

***



بوو بەیەک ئەهلی وەجاخ و ناوەجاخ
بەڵکو باوی زۆری سەندووە ناوەجاخ[1]
پۆلیس دەسناکەوێ بۆ خوێندەوار
وا لە دەس میری ئەخۆن زوخاوو داخ
من لەتاو دولبەر؛ دڵم بۆتن بەخوێن
بولبولیش ئەگری بەسەرچوو گوڵ لەباخ
شەمعەکەت کوژایەوە، پەروانە کە[2]
بێن بەگەل ڕووبکەینە دەشت و کێوو شاخ
عاشقی بێ کەس؛ بیابانە هەوارو مەنزڵی
تاوەکو جارس نەبێ عالەم لە دەنگی ئۆف و ئاخ[3]

١٩٧١

(١) وەجاغ: ڕەسەن و ئەسڵ، ئەسڵ و فەسڵی هەیە.
ناوەجاغ: نارەسەن و نائەسڵ و فەسڵ.
ئەم بەیتە جوانکاریەکی دروست و سازی تیایەو دوو وشەی (وەجاغ و ناوەجاغ) لە خانەی دژیەک (طباق)دا خۆی ئەبینێتەوە.
(٢) شەمعەکەت: مۆمەکەت، شەمع: مۆم.
(٣) جارس: بێزار، بێ تاقەت، وەڕسبوون.

***

قەت نەبوو خاڵی ببێ، سینەم لەئێش و دەرد و داخ
یاخود دڵ بێدەنگ ببێ ئانێ لە ناڵین و لە داخ
قووەتی چاوم نەماوە، هێزی ئەژنۆشم بڕا
تازە بوومە کودەک و مەیلی ئەکەم سەیران و باخ[١]
نەفسی پیسم، بوو بەشەیتان و قەراری لێ بریم
مامەوە لەم گێتییە، بێ کەیفم و هەم بێ دەماخ[٢]
گەه لەدەس ئەولادی بلّح و گەه لەتاو پیری و بەلا
چاوەڕوانی مەرگم و وا لە سینەم ئاخ و داخ[٣]
شوکری تۆ یارەب کە ئاخر شەڕ نەبووم
خادیمی ماڵی حەقم، چیمە لە شای دڵ پڕ لەداخ
هەستە (ئەسعەد) نیوەشەو دوعا بکە بەڵکو خودا
بتگەیێنێتە حەج و دەرچی لە ئەهلی ناوەجاخ

(١) کودەک: مناڵ.
(٢) قەراری لێ بریم: ئارامی لێهەڵگرتم.
– بێ دەماغ: بێ کەیف، بێ شەوق... هەندێک جار بەواتای بێ مێشک و نەزان و گەوج دێ.
(٣) بلح: بێ کەڵک، کار ناپەسند و ناشیرین.
ئاخ و داخ سەرچاوەیەکی بەهێزی لە دایکبوونی شیعرە، شاعیر سەرەتا پڕ بەسینەی داخ لەدەست ڕۆژگار نەخوات و دواتر شوکری یەزدان ئەکات کە دوایی تەمەن لە خواپەرستی و چاکەدا سەرف کردووە و تەنیا دوعای ئەوە ئەکات، خودا زیارەتی مەرقەدی محەمەد (د.خ) پێ ڕەوا ببینێ بەوەش لە خەڵکە خراپەکار و نا ڕەسەنە کە جیا ئەبێتەوە.

***



## ستایشی ئاینی

ئاگری پڕ سۆزی عەشقە سینەکەم سووتا ئەبەد
بگرە دەستم؛ سەروەرم، تۆ (قل هواللّه أحَدْ)[١]
هەر مەرام و مەقسەدم لێبووردنی تاوانمە
دیلی نەفسی پیسم و موحتاجی (الله الصمد)[٢]
هەوری بێ پایانی لوتفت، بۆ هەموو کەون و مەکان
بارشی گوڵشەن ئەکاتن؛ بێ حساب و بێ عەدەد[٣]
با خراپ و ناپەسندبم، ئۆممەتی شای ئەنبیام
(ئۆممەتی) فەرموویەتی هەر (ئوممەتی) یارەب مەدەد[٤]
وا لە زومرەی ناکەسانم؛ ئەی خودا بمکەی بەکەس
شوعلە وەربێ؛ ڕۆح و قەڵب و ڕوو لەگەڵ گۆڕ و جەسەد[٥]

١٩٧٢

(١) ئەبەد: هەمیشە.
لەم بەیتەدا (قل هواللّه أحَدْ) لەبواری جوانکاری و هونەری شیعرییەوە خۆی لەبواری تێهەڵکێشدا ئەنوێنی و تێهەڵکێش- تضمین- بۆ خۆی وەستایی و زیرەکی و سەلیقەی وردی ئەوێت، چونکە دەست و بیری دارشتنی شیعری شاعیر ئازاد نییە و پابەندی وەرگرتن و دۆزینەوەی ڕستە یاخود دەستەواژەیەکە بەجۆرێک لە ڕووی واتا و سەرواوە لەگەڵ تێکرای شیعرەکەدا بگونجێت.
(٢) مەرام و مەقسەد: مەبەست و خواستە.
(٣) بێ حساب و بێ عەدەد: بێ ژماردن... نەسەرەتای هەیەو نەکۆتایی.
(٤) یارەب مەدەد: هاوار و هانا بۆ خودا بردنە...
(٥) لەزومرەی: لە دەستەی، لە تاقمی. لە کۆمەڵی.

***

**تالعم وەک (جەد) نەبوو، ئەستێرەکەم بێتن بە (جەد)**
**دەستی کورتم (مەد) نەبوو وەک حەرفی عیللە بێ بە (مەد)**[١]

**ڕێی خراپیم بۆ نەگیرا بچمە ڕیزی عاشقان**
**دەرکی عەیش و عوشرەتم لێ داخراوە بوو بە (سەد)**[٢]

**یار لە ڕاوی (کەو) کەوی بوو من لەگەڵ غەمدا کەوی**
**ئەو شەوی بۆ بوو بەڕۆژ و من کە ڕۆژم بوو بە (بەد)**[٣]

**چاکی لێ هەڵ کردووە مەحبووبە سینەم (چاک) ئەکا**
**یارەبی پیرۆزی بێ خوێنی دڵی داوە لە (خەد)**[٤]

**حەڵقە حەڵقەی جەرگ و سی داوە لە موژگانی ڕەشی**
**مەزبەحە شوێنی نەما کوشتارەکەی دەرچوو لە (حەد)**[٥]

**تارەقیبم بێ لە دیوانا قسەم ناچێتە سەر**
**ئەو وتەی لا ڕەددەیە من کە وتارم بوو بە (ڕەد)**[٦]

**گوێز بەگومەزدا مەکە (ئەسعەد) قسەت بێ قیمەتە**
**هەر دەمە پیاوێ لە ناوایە هەموو وا بوو بە (بەد)**

**١٩٥٧**

---

(١) یەکێک لە نهێنیە گرنگ و بەهادارەکانی شیعر، ئەو شارەزایی و سەلیقەیەیە کە شاعیر لە هۆنینەوەی شیعرەکەیدا دەری ئەخات و کارێکی مەزنی هونەریی پێشکەش ئەکا.

لەم قەسیدەیەی شاعیر... لە هەموو بەیتەکانیدا هەست بەو سەنعەت و هونەروەریە ئەکرێت بەتایبەت لە بواری ڕەوانبێژیدا، یەکجار بایەخی پێدراوە.

– جەد: بەچەند واتایەک دێت وەک، ڕاستی، بەخت و شانس.

لەم بەیتەدا (جەد) ڕەگەزدۆزی تەواوە هەردوو وشەی (جەد) هەمان پیتن و هەریەکەشیان بەواتایەک دێت، لە (جەد)ی یەکەمدا کە ئەڵێ تالعم وەک جەد نەبوو، واتا، شانسم وەک بەختێکی باش نەبوو، تا ئەستێرەی بەختم بدرەوشێتەوە، بۆیە (جەد)ی دووەم بەواتای حەقیقەت و ڕاش دێت...

دیسان هەردوو وشەی (مەد) ڕەگەزدۆزی تەواوە و مەدی یەکەم مەبەست: دەستی درێژە... واتا توانا و دەستەڵات ئەگرێتەوە، کەچیس (مەد)ی دووەم بەواتای درێژکردنەوە دێت...

(٢) سەد: سَدْ: بەربەست.

(٣) کەو: باڵندەیەکی جوانی ڕەنگ خۆڵەمێشی یا سپییەو بەرگەردنی بەخاڵی ڕەش ڕێژراوە و لە



شاخەکانی کوردستاندا زۆرە.

– کەوی: ماڵی بوون... ڕاهاتن، هۆگربوون.

– بەد: خراپ... ناپەسند، نادروست، بێ فەڕ.

واتە: یار لە ڕاوێکدا زوو خۆی بەدەستەوە داو هۆگر و ماڵی بوو... کەچی من بووم بەهاودەمی غەم.

(٤) سینەم (چاک) ئەکا: سینەم توێ توێ ئەکا.

– خەد: بەواتای ڕووت و گۆنا...

(٥) مەزبەحە: مذبحە: قەسابخانە... شوێنی سەربڕینی ماڵات.

– دەرچوو لە حەد: لە سنوور دەرچوو، لە ئەندازە دەرچوو.

(٦) ڕەددەیە: لێرەدا بەواتای پێچدادانەوە

– ڕەد: وەڵامدانەوە... بەرپەچدانەوە

***

وا بزانم تا قـــیـــامـــەت هەر ئەچێـــژم داخ و دەرد
گـەھ لە بەندیخـانەدا، گـاهێ لە دەشت و شـاخ و بەرد
بۆ سـیـاسـەت دەم ئەبەم زەهرێکە دێتـە ناو دەمم
تەرکی کـە ئەم باسـە پیسـە دوشـمنە بۆ پیـاوی مـەرد
خـوێندەواری زۆرگـرانە نەوکـو کـاغـەز نووسـە بەس
پاکی و دینداریـیـەو شـەرم و حـەیا بێ تۆز و گـەرد
دەس لە عـەشـقم بەرئەدەم تاکـو بژیم ئاسـوودە سـەر
ئەو دلێـرەی مـوبتـەلایە هەڵ ئەکـێـشێ ئاهی سـەرد
نەوکـو من ملوێنەها کـەوتن لەبن خـاکـا ڕزین
قوڕ بەسەر (ئەسعەد) نەبوو پیاوێ ببێ بێ داخ و دەرد[*]

بانە- ١٩٤٢

(*) لە کۆتایی ئەم پارچە شیعرەدا نووسراوە- بانە- ١٩٤١ ناوەرۆکی بابەتەکە، لە دنیای سیاسەت و دەردوو دووی تێکۆشان ئەدوێ... شاعیر (ئەسعەد مەحوی) ساڵی ١٩٤١ بەدەسیسەی ناحەزانی کورد و سیخوڕەکانی ئینگلیز و ڕژێمی پاشایەتی عێراق لە دەمەو ئەدرێت و لەگەڵ چەند ئاوەڵێکدا لەسەر تێکۆشانی ناو کۆمەڵەی برایەتی لە شاری سلێمانی ئەگیرێ و ڕەوانەی حەویجەی نزیک شاری کەرکووک ئەکرێت، پاش ماوەیەک لە زیندانی بەواستە بەرئەدرێت و دواتر هەر لە ئەنجامی چالاکی حزبایەتی و تێکۆشانی کوردایەتی دیسان لەگەڵ شێخ لەتیفی حەفید لەلایەن حکوومەتی پاشایەتی عێراقەوە ئەمری گرتنیان دەرئەچێت و ئەوانیش بەڕێنمایی شێخ مەحموودی حەفید و چاوساغی کردنی پیاوە دڵسۆزەکانی حەپسەخانی نەقیب ڕوو لە کوردستانی ئێران ئەکەن و ئەم شیعرە لە شاری بانە ئەهۆنێتەوە و گوزارشت لە ئازار و ژانی ڕابردووی تێکۆشان و ئاییندەی ژیانی ئەکا.



وەڵامی نامەیەکی شێخ لەتیفی شێخ محموودی نەمر[*]

دڵ لە زیندانی غـەمـا بوو نامـەکـەت ڕزگـاری کـرد
بوو بەمـەرهەم زامی جەرگ و سینەکـەی تیمـاری کرد
بۆ مـژینی غـونچـەیی لێـوت سـەراسـەر بوومـە دەم
مل شکاوە بۆنی زەرف و کـاغـەزی دڵداری کـرد[١]
سـروەیی ڕەحـمـت کـە جـوولا هەوری تاڵی دایە بەر
باغی طەبعم هاتە جیلوە تۆزی حەسرەت باری کرد[٢]
گوڵ چییـە؟ بولبول چییە؟ شـەمعی چی پەروانە چی؟
مـوبتـەلا بوو دڵ بەعـەشـقت عـاشـقی دڵداری کـرد[٣]
هەر بژی ئەولادی حـەیدەر یادی دێرینت ئەکـەیت
ڕاسـتـە دڵ ئاوێنەیە بۆ دڵ کـە بیـری یاری کـرد
تۆ (لطیف)ی شـاخ و داخ و من بەدەردە داخـەوە
تۆ دڵت شـایی ئەوێ من حـەپسـە مـەیلی غـاری کـرد
وەک خـەڕەک لۆکـەی وجـوودم بائەدا چەرخی فـەلەک
تاق و تەنیا (ئەسعەد)ە ڕیسوای کوچەی شاری کرد[٤]

١٩٦٩

(*) پەیوەندی ڕاستەوخۆی نێوان بنەماڵەی مەلا وەسمانی باڵخی گەورە کە باپیری مەحوییە لەگەڵ بنەماڵەی شێخ مارفی نۆ دێ باپیری شێخ سەعیدی باوکی شێخ مەحموودی حەفید لەوساتەوە دەستی پێکردووە کە ساڵی ١٧٨٦ ئیبراهیم پاشای بابان مزگەوتێکی بۆ مەلا وەسمانی باڵخی دروستکرد و مەلا وەسمان لەشاری سلێمانییدا نیشتەجێ بوو... ئەو پەیوەندیە زۆرجار بەهەڵبەزوو دابەزدا تێپەڕیووە و لەسەردەمی مەحویدا گەیشتۆتە ململانێیەکی سەخت و ناخۆش، کەچی لە هەندێک کاتدا ئەو ساردیە هێور بۆتەوە و لە جیاتی ململانێ پەیوەندییەکی برایانە هاتۆتە کایەوە و ئەمەش لەسەردەمی کوڕە بچووکی مەحوی مەلاخالیدی مەحوییەوە دەستی پێکردووە و، ڕاستەوخۆ دۆستایەتی و برایەتی هەردوو بنەماڵە لەسەر دەستی شێخ مەحموودی حەفید و مەلاخالیدا گەرم و گوڕ بووەو ئەو حاڵەتە درێژەی هەبووە، بۆیە لەسەردەمی هەڕەتی لاوێتی مەلا ئەسعەدی مەحوی کوڕە گەورەی مەلاخالیدی مەحوی لەگەڵ کوڕانی شێخ مەحموود (شێخ بابا عەلی و شێخ ڕەوف، شێخ لەتیف) گەیشتبووە ترۆپی گەرم و گوڕی تەبایی، تا کار گەیشتە ئەوەی بەهاندان و پشتیوانی شێخ

مەحموودی حەفید، شێخ لەتیفی کوڕی و مەلا ئەسعەدی مەحوی کۆمەڵەی برایەتیان ساڵی ١٩٣٨ لە شاری سلێمانیدا دامەزران و ساڵی ١٩٤٢ هەر بەڕێنمایی شێخ مەحموود هەردووکیان (شێخ لەتیف مەلا ئەسعەد) لە شاری سەردەشتی کوردستانی ئێران ئیدارەیەکی حوکمیان پێکهێنا... ئەو پەیوەندییەی نێوانیان تا کۆچی دواییان بەردەوام بوو... سۆز و پەرۆشی و خۆشەویستی ناوەرۆکی وەڵامی ئەو نامەیەش هەر کوورەی دڵسۆزی نێوانیانەوە بەرز ئەبێتەوە.

(١) مل شکاوە: لای کۆمەڵگای ئێمە وا دانراوە، زۆر مناڵی ساواو تازە لە دایکبوو، بەبۆیی هەندێک بۆن ئەکەوێت و نەخۆش ئەبێ، بۆیە زۆرجار ئەوترێ ئەو مناڵە بەو بۆنە ملی شکاوە... واتە وەزعی خراپە و لە پەلوپۆکەوتووە لەم بەیتەدا شاعیر دیمەنێکی شیعری جوانی خولقاندووە، ئەوەتا ئەڵێ بۆ مژینی غوونچەیی لێوت واتە بۆ ماچکردنێکت کە مرۆڤ دەم بەکارئەهێنیت، کەچی من هەموو جەستەم و سەراسەرم بۆ بەدەم و تۆی پێی ماچکرد... ئەمەش نیشانەی ئەوپەڕی دڵسۆزی و خۆشەویستی و پەرۆشی ئەبەخشێت.

(٢) تۆزی حەسرەت: تۆزی پەرۆش و بیرکردنت.

(٣) موبتەلا: گیرۆدە...

(٤) خەڕەک: مەکینەی لۆکەڕێسی.



نیزاعێکم هەیە جانا لەگەڵ دڵ بێ کەماڵی کرد
منی تووشی غەمی عەشق و زروفێکی بەتاڵی کرد[١]
گەهێ ئەمکاتە مەحبووس و دەمێ ئاوارەبی شاران
بەخۆڕایی منی سووک و کەنەفت و بێ جەماڵی کرد[٢]
بە (با) چوو عومری شیرینم، بەناخۆشی هەموو ژینم
لەبن باری سیاسیدا، منی تووشی حەماڵی کرد
نەبۆ (خۆم) و نەبۆ (قەوم) و نەبۆ (قیبلەم) نەبوو قەولی
وتاری پیسی بێگانە منی بەم جۆرە حاڵی کرد[٣]
خووا گرتوو درۆزن تۆ لە بازاڕی سیاسی چی؟؟
وەکو (بابا) بەحیلە عالەمت فێری دەڵاڵی کرد[٤]
خەزێنەی زانیاریدا بەخەرمووهرەی نەزانینت
لە علم و مەعریفەت پەردەی دەرونت پۆچ و خاڵی کرد[٥]
فەلەک؛ ڕەحمی نەبوو تاکو بکا لوتفێکی بۆ ئێمە
گەلێ تووشی دەسی پیسی ڕەقیبانی گەماڵێ کرد[٦]
لە میزانی ئەدەب وەزنی نەماوە شیعرەکەی (ئەسعەد)
وەکو سەرخۆشی بەد مەستە وتاری ترش و تاڵی کرد

١٩٦٨/١/١

(١) نیزاعێکم هەیە: کێشە و ململانێ یاخود کێشمەکێشێکم هەیە.
- جانا: گیانا.
- بێ کەماڵی: لێرەدا بەو واتایە دێت، کە کەموکوڕی بەرامبەر نەکردووە، بێ خەوشی کرد.

(٢) گەهێ: جارێک، کەڕەتێک، ساتێک.
- دەمێ: جارێک، کەڕەتێک، ساتێک.
- کەز: پەککەوتن... داماوی.
بێ جەماڵی: ڕەنگ و ڕوخساری لەبەر بڕیم.

(٣) شاعیر لەم بەیتەدا، دەردە دڵیی خۆی دەرئەخات کە چۆن بەهۆی قسەی بریقەداری بێگانەو ناحەزەوە ئەمی دووچاری پەککەوتوو پشت چەمانەوە کرد چونکە ئەوەی کردوویەتی بەکەڵکی خۆی و نەتەوە و

کەسوکاری نەهاتووە، لەواتای ئەم بەیتەدا پەشمەکی پەشیمانی بەسەر خۆیدا هەڵئەدات.

(٤) بابا: پێدەچێ ئەمە ناو و مەبەستی ڕاستەقینە نەبێ (بابا) کینایەیە بۆ کەسێکی دی کە لەو ڕۆژگارەدا خەڵکی فێری فرتوفێڵ کردووە و بەڵکو فێڵبازیشی حەلاڵ کردوون.

(٥) خەرموهرە: مووروو یاخود کوژەکە کەراتە.

(٦) گەماڵ: نێرە سەگی گەورە و زۆرجار بەسەگی پیریش ئەوترێ.



## زەبری ناکۆکی(*)

(هەر نیفاقە) بوو بەخۆرەو کەوتە عومری لاوی کورد
هەر نیفاقە: باعیسی مەهتوکی و بەدناوی کورد[١]
هەر نیفاقە: مانعی زانینی ڕێگەی مەعریفەت
هەر نیفاقە: بوو بەهۆی دواکەوتن و فەوتاوی کورد
هەر نیفاقە: ئابڕوی بردین لە نێو قەوم و گەلان
هەر نیفاقە: بوو بەمیکرۆبی نەمانی کورد
هەر نیفاقە: قەومی ئێمەی خستە دەستی ئەجنەبی
هەر نیفاقە: بووینە عەبدو کۆیلەو ڕووخانی کورد
بێن بەجان و دڵ؛ براله چاری ئەم میکرۆبە کەین
بەڵکو زیندووبێتەوە (ئەسعەد) لەناوا ناوی کورد

١٩٤٢

(*) پێدەچێت شاعیر ئەم شیعرەی لە هەڕەتی لاوی و گەرمەی تێکۆشانی سیاسی کوردایەتیدا هۆنیبیتەوە، سا ئەوە، کاتی خەباتی ناو کۆمەڵەی برایەتی بووە لە شاری سلێمانی، یاخود لەو ساتەدا بووە کە لەگەڵ شێخ لەتیفی حەفیدا ڕوویان لە کوردستانی ئێران کردووە لەسەردەشت ئیدارەیەکی حوکمڕانیان لە ساڵی ١٩٤٢ دامەزراندووە... لەبەرئەوەی ڕۆژ و مانگی هۆنینەوەی شیعرە نەنووسرابوو ئەوە ساغ نەبووە وە، چونکە (ئەسعەد مەحوی) لە ساڵی ١٩٤٢ لە سلێمانی ڕووی کردە سەردەشت... ناوەرۆکی شیعرەکە: باس لە سەخترین دەرد و فایروسی کوشندەی نەهێشتنی هەستی نەتەوەیی ونیشتمانی ئەکات ئەویش نیفاقە و بەمیکرۆبی لەناوچوونی ماف و سەربەخۆیی کوردی دائەنێ... ئەکرێ لە لێکدانەوەی ئەو قەسیدەیەدا، ڕاستیەکمان بۆ دەرکەوێ. کە شاعیر بەورەیەکی بەرز و بڕوا و متمانە بەخۆکردنەوە ڕوو لە جەماوەری نەتەوەی کورد ئەکات و داوایان لێ ئەکات؛ بەهەموان چارەی ئەو میکرۆبە کوشندەیە بکەین، بەڵکو ئەمە خوایە هیوای ئازادی و سەربەخۆیی کورد بژێتەوە.

(١) نیفاق: مەبەست لە کاروچالاکی ناپەسند و نادروستە وەک: ئاژاوە گێڕی و شەڕ نانەوە و دووڕوویی کردن.

- باعیسی: سەرچاوەی، هۆیەکەی.
- مەهتوک: سووک و ڕیسوا.





– بەدناو: ناوی کەسایەتی زڕاوە.

ئەتوانرێت ئەو بەیتە وەک مشتێک لە نموونە، خەروارێک لە ڕووی ناوەڕۆک و هونەری شیعرییەوە هەڵسەنگێنن.

شاعیر بەهۆی دووبارەکردنەوەی وشەی (هەر نیفاقە) و جەخت لەسەرکردنی، بڕوای وایە سەرچاوەی هەموو ئەو دەردو بەڵاو مەینەتیانەیە کە بەسەر میللەتی کورددا دێ، لە ڕووی هونەری شیعریشەوە، جگە لە بەیتی دوایی، سەرەتای هەمـوو (صـدر وعـجـز)ێکی بەیتـەکـانی پێشـوو بەوشـەی (هەر نیـفـاقـە) دەست پێ ئەکـات و ئەو چەند بارە بوونەوەیە گـیـانی بێـزاری و ساردبوونەوەی دروست نەکردووە و جار لە دوای جار وشەکە زیاتر هێز پەیدا ئەکا... هەروەها، ئەتوانرێ بوترێ، شاعیـر پەنای بۆ دوو سەروا بردووە و هێز و پێزێکی باشی بەشیعرەکە داوە.

***



یارەبی ئەی دڵ بەپەن بی وەک منت کـــردووە بەپەن

ئابڕووم زوو زوو ئەبەیت و خۆت ئەکەی گۆیا بەڕەند[١]

عـاشـقـیت ڕیسـواییـە بۆ من فـەقـیـر و قـوڕ بەسـەر

ئەم چل و چۆیەت بەسە شێت و سەفیهی تاکو چەند[٢]

چاوی مـەست و شـیـری ئەبرۆ یەک لە یەک جـادوو ترن

سیحری دەستەی زولفەکانی دڵ ئەخاتە ناو کەمەند[٣]

سـەیری ڕمـبـازی مـەکـەن یارە جلیـد بازی ئەکـا

ئایینی ئەو سـوارە دێ بەسـتـوویە قـۆڵی بازو بەند[٤]

خـادیمی بەر دەرک و بانت (ئەسـعـەد)ی بێ چارەیە

ڕووی گـرژم تێ مـەکـە بەهری خـوا قـوربان ئەوەند[٥]

١٩٥٢

---

(١) ڕەند: پیاوی جوامێر... پیاو چاک.
لەم بەیتەدا هەردوو وشەی (پەن) ڕەگەزدۆزی تەواوە و دیمەنێکی جوانکاری بەشیعرەکە بەخشیوە و (پەن)ی یەکەم بەواتای سووک و ڕیسوا کردن و بەپنگ بوون دێ و (پەن)ی دووەم بەواتای پەند و عیبرەت و دەرس وەرگرتن دێ.

(٢) سەفیهی: سووک و سەلیمی.

(٣) جادوو– سیحر: تەلیسم، جادووگەری، چاووڕاو فرتوفێڵ و کەڵک بازی
– کەمەند: پەت و حەبلێکی درێژە، بۆ شەتەکدانی کەمەر بەکاردێ.

(٤) جلید بازی: مەبەست لەوەیە، بەتوانا و هێزە و خۆی ئەنوێنێ.

(٥) بەهری خوا: بەش و قیسمەتی خوا... واتە ئەو بەشەی خوائەیبەخشێ.

***

## گیروگرفتی ناو کۆمەڵ

سەرم سوڕماوە لەم ڕۆژە؛ تەماشا چەرخەکەی بێبار
دەمێ فەوتاوی نا ئەهل و دەمێ بیری بەدو بەدکار[١]
هەزار و نۆسەد و حەفتاو دوو، ساڵەکەی شوومە
چلەی زستان و بێ (نەوتی) حکوومەت لاژن و غەدار[٢]
وەکو هەڵماتی بێ بار و، بەوێنەی میزی گا چەوتە
عەجەب ماوم، لە گێتییا ئەمانە هاتنە سەرکار
لە زانین و ئەدەب دوور و لەبێ ئەخلاقییا نزدیک
نەزان و قەپگر و هێندپیس و بەد ئەتوار[٣]
دژی گشت ئاین و مەذهەب، وەها بێ ئاین و مەبدەء
لەپەت بەربووە، نهێنی گر، خوار و بێ ئەتوار
نیشانەی ئاخیرەت، هاتۆتەدی سا خودا حافیز
حەیا ڕۆیی لەناوانا نەما حورمەت لەبۆ دینار[٤]
لە حەق (ئەسعەد) مەدە لا، تاکو مردن دێتە میوانت
(منوّر) کە، دەروون و دڵ مەدرکێنە برا ئەسرار

١٩٧٢

(١) نا ئەهل: نارەسەن و ناوەجاخ.
لەم شیعرەدا باسی کۆمەڵێ گیروگرفتی جۆراوجۆری ناو کۆمەڵ کراوە و خۆی لەسەر ئاستی خەمی تاکە کەسی و کێشەی گشتیدا ئەبینێتەوە... دیارە سەرەڕای ئەوەی لەو ساڵەدا بەلای شاعیرەوە بیری بەدو ڕەش پەرەی سەندووە و لەگەڵ بیروڕای ئەمدا نەگونجاوە... ساڵەکەشی سەخت بووە، سووتەمەنیش بەنارەحەتی چنگ کەوتووە خەتاکەی لەپاڵ حکوومەتدا داناوە.
(٢) لاژن و غەدار: لێرەدا بەواتای تێنەگەیشتوو ستەمکار دێت.
(٣) هێند: ئەوەندە.
- بەدئەتوار: کەچ ڕەفتار.
(٤) ئاخیرەت: ڕۆژی دوایی، ڕۆژی لێپرسینەوە، ڕۆژی قیامەت
- سا خوداحافیز: ساخودایە بم پارێزی.

***



گەردوشی گەردوو کە تاکەی ئەدەی جەورو جەخار
ئەی جنی جەرگ و دڵیش ئەگری لە عالەم گیر و دار[١]
سەرسەری و چەورەی جیهانت کردە نوختەی (انتخاب)
زانیارت شێت و شەیدا کردتە پەندی ڕۆژگار[٢]
چیت بەفیردەوس و نیظامی و سەعدی عەللامە کرد
چاوەڕێی نانێکی (جۆ)ن ئێستەش لەبن سەنگی مەزار
کانی گەوهەر کەی بەکەر نەدراوەتن ئا پێم بڵێ:
ئەسپی چاکت شەل نەکرد دایم لەبن کورتان و بار
جەرگی خەسرەو دەرئەهێنی تۆ بەشێرۆیەی کوڕی
چاوی ڕۆستەم کوێر ئەکەی زۆرابە یا ئەسفەندیار
بێمە سەر باسی وەفا، پەردەی حیجابیش لا بدەم
وەک حەیا بۆ فاحیشە نادر بووە ئەمڕۆ لەشار[٣]
چی بدا (ئەسعەد) بەیانی دەردی بێ دەرمانی دڵ
بۆ مەلاقەت نەی بووە بەحری وەرەم وێڵ و شیعار[٤]

١٩٤٤

(١) گەردوشی: لێرەدا بەواتای ئاژاوە و تێکدان دێ.
- جەخار: خەم و پەژارە و مەینەتی.
(٢) إنتخاب: بەواتای هەڵبژێردراو و دەستنیشانکراودێ
(٣) پەردە حیجابیش لابدەم: سەرپۆش و پەچە لابدەم.
- فاحیشە: ئافرەتی ڕەوشت بەدی بەرباد.
(٤) بەحری وەرەم: شاعر لە پەراوێزی ئەم شیعرەدا نووسیوویە: بەواتای دەریای سیلدێ.
وەرەم: لوویی پیس و نەخۆشی کوشندەیە وەک وەرەمی سەرەتانی.

***

له داخی تۆ چی بلێیم چەرخی بەدکردار
هەموو کاتێ ئەهێنیتە دەرێ، پیاوێکی بەد ئەتوار
لە زانین و ئەدەب دوور و لە بێ ئەخلاقییا نزدیک
عەمیل و خادیمش و پیس و بەد ڕەفتار[1]
دزی گشت ئاین و مەذهەب وەها حورمەت و مەبدەء
لە پەت بەربوو نهێنگر خوارو بەد ڕوخسار
هەچی بەردێ هەڵبدەم دێتە خواری بۆ سەری خۆم
کە چونکە وا یەکێکم لەم گروهی چەوت و بەدهەموار
لەهەق ئەسعەد مەدە لا، تاکو ناجسن بێتە میوانت
منەوەرکە دەر و نۆ دڵ مەدرکێنە ئەبەد ئەسرار[2]

(١) عەمیل: نۆکەر و بەکرێگیراو.
خادیمش: ئیشکەری بەردەست، خزمەتگوزار.
(٢) ئەم شیعرە جگە لە دەستکاریەکی کەمی شاعیر هەر لە فۆتۆو دووبارە بووەی شیعری پێشوو ئەچێ، لەگەڵ دەستپیاهێنانێکی کەم.

***



عەینی زستانە دووچاوم، دڵ ئەناڵێ وەک بەهار
ڕەنگی زەردم پایزە هاوینمە بینینی یار[1]
فەسڵی چوارەم، بوو بەیەک عومرم بەتاڵی چوو بەسەر
کەیف و شاییم، فیرقەتەو داخ و خەمە و ناڵیین و زار[2]
دواترە بورجی ئاسمانە، ساڵی کردە دوانزە مانگ
سیانی ئاوە، سیانی گوڵ، سیانی میوە، سیانی نار[3]
سەبعەیی سەییارەیە، سابت وەیا جوولەی ئەوان
جووڵە جووڵی خستە عالەم، ناگرێ سەبرو قەرار[4]
دەم لەدەم، هەردەم ئەنێم، تالاو ئەنێتە ناو دەمم
مەنزڵی پیاوان ئەپرسم، پۆکەرەو پێکی خومار
فارس و تورک و عەرەب، ڕووسیش بەشێکی بردووە
بۆتە ئاردی ناو دڕک، ئەم کوردەیی خەمبارو بار[5]
خۆ بەئەفلاتوون ئەزانن کەودەن و ناتێگەیو
خۆ پەسەند و نۆکەر و بێ قیمەت و بەدکاروبار[6]
هەر ئەبێ خالق دروستیکا گەل و میری وەها
هیچوپووچ و خوێنمژ و بێ ئاین و وێنەو شیعار

١٩٧٢/٨/١٠

(١) لەو قەسیدەیەدا شاعیر جگە لەوەی لە ڕووی فیکرییەوە پەنای بۆ فەلسەفەی ژیان بردووە، بەڵام لەبارەی کاری هونەری شیعرییەوە پەنای بۆ هونەری ڕەوانبێژی بردووەو زیاتر لە شێوەی بەراوردا لێکچوونی بەکارهێناوە... هەر لەم بەیتەدا لەهەر چوار وەرزی ساڵ، چەندین وێنەی جوان و دڵگیری نیشانداوین... فرمێسکی چاوانی بەبارانی زستان و ناڵەی دڵی بەگرمەو ناڵەی هەوری بەهار و ڕەنگی زەردیشی بەخەزان چواندووە کەچی سەیر لەوەدایە وەرزی هاوین کەوەرزێکی گەرمە، بەڵام بەپیت و فەڕە؛ بەجێ ژوانی یاری داناوە.
(٢) فەسڵی چوارەم: لەم شیعرەدا مەبەست لەوەرزی هاوینە ئەمەش لە عجزی بەیتی یەکەمدا ئاماژەی پێکراوە و وەرزەکانی: هاوین و پایزی پاش و پێش خستووە
(٣) شاعیر بۆ خۆی داهێنەرەو دەنگوڕەنگی تایبەتی دیارەو کەمتر بەلای دووبارەکردنەوە و لاسایی کردنەوەدا ئەچێ...

لەم بەیتەدا هونەری پێچەوپەخشی -لف و نشر-ی بەشێوەیەکی جیا لە شاعیرانی پێشووی بەکارهێناوە.

ئەم نەهاتووە پێچەوپەخشی لە یەک بەیتدا بەکارهێنابێ، بەڵکو ئەم بەیتە کردنەوەی واتای بەیتی یەکەمە، ئەتوانین بەئاسانی ئەوە دیاری بکەین وەک ئەوەیساڵ کە دوانزە مانگەو هەرسێ مانگی وەرزێکی تایبەتە بەمجۆرە خستوویەتە ڕوو:

أ- دووچاوی کە عەینی زستانە، بەرامبەر سێ مانگی ئاو و تەڕ و تووشیە.

ب- دڵ وەک هەوری بەهار ئەناڵێنی، بەرامبەر سێ مانگی پڕ گوڵ و گوڵزاری بەهارە.

ج- ڕەنگی زەردیشی وەک گەڵا زەردەکانی پایزە بەرامبەر ئەو هەموو میوە جۆراوجۆرە بەتام و چێژانەی وەرزی خەزانە.

د- هاوینمە بینینی یار واتە: نەبینینی یاری و و بەمەش بەرامبەر گەرماو تینی سێ مانگی هاوینە.

بەمەش شاعیر لە بەکارهێنانی ئەم لایەنی هونەرییە، داهێنانێکی بۆ خۆی تۆمارکردووە.

(٤) پێدەچێت مەبەست لە سەبعەیی سەییارە ئەو حەوت ئەستێرەیەبن کە لەناو کوردەواریدا بەحەوتەوانە ناسراون... ئەمانە بەدەوری خۆردا ئەسووڕێنەوەو لە هەمان کاتیشدا لە شوێنی خۆیان بەدەوری خۆیاندا...

(٥) لەم بەیتەدا شاعیر هەستی نەتەوەیی ئەخرۆشێ و دیمەنی ژیانی پارچە پارچەی خاکی کوردستانی گەورە دەرئەخات کە بەسەر ئێران و تورکیا و عێراق و سوریادا دابەشکراوە و بەشێکیشی ڕووسیای ئێستە و سۆڤیەتی پێشوو بۆ خۆی بچڕیوە... ئەوەتا کوورەی دەروونی شاعیر گڕ و کڵپەی غەم و ئازاری لێبەرز ئەبێتەوە، چونکە کورد وەک ئاردی ناو دڕکانی لێهاتووە.

(٦) کەودەن: گەوج. هێڕ.

***

کۆتری دڵ بوو بەدەم تیری مۆژەی یاری عەیار
زەحمەتە ڕزگاری بێ لەم تیرە تیژەی دەم بەنار[1]
چنگڵی بازی قەزا کەوتۆتە جەرگم (الوداع)
کوا (ئەرەستو) بۆ خووا تیماریکا زامی هەژار
مەعرەضی یارو گوڵە کردم لەگەڵ بولبول گرەو
ئەو لەسەر نەغمەی حەزین و من لەسەر دڵخوازی یار[2]
غونچە بینی لێوی یارم وا لە گۆچوو هەڵوەری
چاکی دانا پیری دڵ مەرجی بەناڵین و بەزار[3]
وا رەفیقم (ئەسعەدا) پەروانەیە هاو قەولمە
ئەو بەسووتن چێ بەشەمع و من لە دەوری کوڵمی یار[4]

١٩٥٢[*]

(١) یاری عەیار: یاری زۆر زان و بەناز و نووز.
- دەم بەنار: مەبەست لە تیرێکی تیژی نووک ئاگراوییە.
(٢) مەعرەضی: پێشانگا... شتێک بۆ بینین و سەیرکردن دابنرێ.
- حەزین: غەمبار.
(٣) لەگۆچوو: واتە قسەو ئاخاوتنی پێناکرێت، وەک ئەوەی ئەوترێت: گۆ ناکات، واتە قسەی بۆ ناکرێ.
(٤) پەروانە: پەپوولە کە عاشقی گڕی ڕووناکی شەوو خۆی پێ ئەسووتێنێ.
- هاوقەولە: هاو قسەمە: قسە و ئاخاوتنمان چون یەکە.
(*) شاعیر لە پەراوێزێکی دەستنووس ئەم پارچە شیعرەیدا ساڵی ١٩٥٢ی لەسەر نووسیوە.

***

ئەی نەفسی ستەم دیدە وەی خادیمی ئەغیار
ئەی پیری غولّام پارە وەی مەعدەنی ئەکبار[١]
کوانێ؟ زەوییەک بشکێ لەبن پەنجەیی پێتا
یاکێو و کەژی بەرزی بەقەد قامەتی ئەغرار[٢]
بۆ عەیب و سزا حازری وەک گوللەی بڕنەو
بێ مەعریفەت و علم و ئەدەب مەحزەنی ئەشرار[٣]
هەریەک لە ڕووا کۆلکە «نەبی» و غاندی سیاسین
ئینجا بەعەمەل مرتکب و پیس و بەد ئەتوار[٤]
نامەی عەمەلی چاکی ئەگەر بێتە ژمارە
(یحلف قاض کهو أنه أصفار)
(ئەسعەد) چ بلّێ یا بەسەرا قوڕ بکە بۆشە
چاری ئەمە نابێ بەهەموو عالەمی ئەنوار

١٩٦٣

---

(١) خادیمی ئەغیار: ئەغیار بەزۆر واتا دێ، بەلاّم لێرەدا واتای: بێگانە ئەبەخشێ... وەک ئەوترێ خزمەتکاری خەلّکی یاخود خزمەتکاری بێگانە.

(٢) بەقەد قامەتی ئەغرار: لێرەدا بەواتای بەقەد بەژن و بالاّی جوان و خڕ بوودەر دێ.

(٣) گوللەی بڕنەو: گوللەی ئەو تفەنگە بەناوبانگەیە بەناوی تفەنگی بڕنەوەوە ناسراوە.

(٤) کۆلکە نەبی: وەک ئەلّێ کۆلکە خوێنەوار واتە نیمچە خوێندەوار، کۆلکە نەبی، واتە هەریەکەیان خۆیان بەکۆلکە پێغەمبەر دائەنێن، کەوا نییە.

- غاندی سیاسی: مەبەست لە سەرۆکی ڕزگارکەری گەلی هندستان مهاتما غاندی یە کە سیاسیەکی مەزنی جیهانی بوو، بڕوای بەچارەسەری کێشەکان بوو، بێ ئەوەی توندوتیژی و خوێن ڕشتنی بەکاربهێنرێت.

***



هەستە ئەی بادی سەبا خێرا بڕۆ وێنەی تەتەر
جەژنە پیرۆزە بکە لەو یارە وا کەوتۆتە دەر[١]
تێر و پڕ بمژە دەمی تا مەستی غونچەی گولّ ئەبێ
ڕۆژ و شەو دوعا بکە با تاجی شاهی کاتە سەر
سەیری کە چیم پێ ئەکا دوشمن لەسەر شێخ و مەلا
قیمەتی جانی نییە؟ چونکە هەمە خوای بانی سەر[٢]
پیرو پەڕپووتم وەها تابی غەمی حەپسیم نییە
با بڕەنجێنێ دلّم ئەم حوکمە خۆ ناچێتە سەر[٣]
چاو ی کوێرە قاچی شەل دەستی لە ئانیشکا شکا
قوڕ بەدامانا ئەکەن هەر کوچە کوچەو دەر بەدەر
دلّ شکانی بێ نەوا زۆری هۆی مەهتووکییە
ئاخری نەمرودییە هەم قەومی عادە قوڕ بەسەر[٤]

---

(١) بادی سەبا: (با) یاخود شنەی بەری بەیانا.

- تەتەر: ئەو کەسەی نامە ئەبا و ئەهێنێ.

(٢) جانی: ئەوکەسەی تاوان ئەکا... قیمەتی جانی نییە: تاوانکار بەو تاوانەی کاریگەری و بایەخی نییە.

(٣) پێدەچێ شاعیر ئەم شیعرەی لە دواتەمەنەکانی ژیانیدا هۆنیبێتەوە و پیروپەکەوتە و دوچاری پەڕپوون بووە و تین و توانای گرتن و بەندێتی نەماوە... ئەم وشەی حەپسیە: ئاماژەیە بۆ ئەوەی شاعیر لەسەر خەباتی کوردایەتی و چالاکی سیاسی و حزبایەتی سالّی ١٩٤١ لەلایەن دەستەلاّتدارانی ڕژێمی پاشایەتییەوە لەشاری سلێمانی گیراوەو بەبەندێتی ڕەوانەی بەندیخانەی (حەویجە)ی نزیک کەرکووک کراوە و گەلێک ئازار و ئەشکەنجە و ناڕەحەتی بینیوە.

(٤) مەهتووکییە: سوک و سەلیمی و ڕیسوا بوونە.

***

## وەرامی نامەی قازی محمد(*)

قـەت نهـێنی خـۆ مـەڵێ ڕیسـوا ئەبیت و دەر بەدەر
نەچییە نادی مونکیران و نەبیە باری پیاوی کەر[1]
بۆ زەمـانە ئەبیـە عـیبـرەت سـوور و ڕەش هەڵگێـڕەوە
خاوەنی حیکمەت نییە هەرگیز بەخیل و بار نەبەر
سـەیری شـالیـاری بکە (دارا) ئەزانی قـاضـیـا ؟
بۆ نەمـا وا مـایەوە خـۆی و گـەلی بێ تاج و سـەر
سەربەخۆ تێهەڵمەچۆ (ئەسکەندەری ڕۆمی) ئەڵێ:
ئەی (ئەرەستـو) چی بکەم تاکو بژیم بێ دەردی سەر
پێـیـوو شـاها چەند ملووکێ بێنە کـایە باش ئەژی
هۆزەکـەت لەم گـێـتـیـە ئـاسا هەمـوو بێ دەردی سـەر

سەردەشت ١٩٤٢

---

(*) زۆرجار شیعر لای شاعیر ئەبێتە هەڵوێست و وەک ئامرازێکی جۆرەکانی تێکۆشانی سیاسی و هەوڵدان بۆ بەدیهێنانی مافەکانی میللەت... شاعیر لە ساڵی ١٩٤٢ دەربەدەری ئێران ئەبێ و لەگەڵ شێخ لەتیفی حەفیدا ڕوو لەسەردەشت ئەکەن و هەستی نەتەوایەتی شاعیر هانی ئەدا، بەشیعر وەڵامی ناوەرۆکی نامەیەکی پێشەوای کورد و سەرۆکی کۆماری میللی کوردستان شەهید قازی محەمەد بداتەوە.

(١) شاعیر لە دیوانە چاپکراوەکەیدا نووسیویەتی مەبەست لەم بەیتە ئەوەیە: کەس فریوت نەداو بەفرتوفێڵ نەچیتە ژێر رکیف و بەردەستی فارسەکان.

***



ئەشکی سوورم بۆ غەم، مزەی ئاشی سینەی خستە دەر
ئاهی حـەسـرەت ناکـمـە ڕیشـەی دڵـی هێنامـە دەر
بۆ گـەڵا ڕێزانی عـومـرم ڕەنگی ئاڵم بوو بە بەی
بەختی شوومم بەرگی نەگبەت بارییە، کردوویە بەر[1]
کـوا حـەیاتی ئێـمـە سـەیری ئەم ژیانە مـردنە
دەرکراوو بێ کەس و مەهتوک و ڕووت و قوڕ بەسەر
بووینە ژێر پووکـاو وەلێ پیـرێژنێکی باوەژن
نەحس و نەگلیسـە بەدایم دڵ ئەخاتە پڕ خـەتەر[2]
بەسـیـەتی ئەی چەرخی بەد تاکـەی بەناکـامی بژی
گـوێرەکەت کردووە بەشاهو شاهت کردۆتن بەکەر[3]

١٩٤٣

---

(١) گەڵاڕێزانی عومرم: مەبەست لە پایزی تەمەنە واتا ژیان بەرەو هەڵچوون چووە و ئیدی توانای بەردەوامی نەماوە.

– بەی: بەهێیە: واتە ڕەنگی ئاڵم وەک ڕەنگی بەهی زەردبووە... نیشانەی کۆتایی ژیانە.

(٢) ژێر پووکاو: دیارە مەبەستی ئەوەیە: بەجۆرێک لە پەلوپۆ کەوتووە و پووکاوەتەوە، کەڵکی پێوە نەماوە.

– نەحس: نەگبەت، شووم ئەمە بۆ ژمارە بەکاردێت کە چاوەڕوانی لایەنی باشەی لێناکرێ.

(٣) گوێرەکە: گولک.

***

وا لەبەر چقڵ و چەویلە، جێی نییە، گوڵ بێتە دەر
هەر لەدەس نادانە، وا دانایە، بوونە دەربەدەر[١]
هەر کەسە ئەگری، بەیارت زوو پەشیمانی ئەبێ
خزم و خوێشیکت نییە، ڕاست و ڕەوان و بێ زەرەر
زەردەواڵە خاوەنی ئێشە، بەهەنگی تێمەگە
شەهدی نەبۆ توو، نییە وریابە ئەی دڵ باخەبەر[٢]
دوو زمانی، بەسیە؛ تاکەی، دوژمنی پیس و چەپەڵ
سەیری وێنەت، بوویە کوولۆی ئاهی سینەی پڕ شەڕەر
دەسبڕینی خەڵکی، بەسیە مەحکەمەی عولیا هەیە
شێخی مل پان و زلە، ئوباڵی ڕۆژت دێتە سەر[٣]
مەستی عەشقی حەقبە، هایو هویە بێ سەمەر
مەگرە (مار) و مەیکە سواڵ و ڕوکەشەمعی پڕسەمەر[٤]
ئەو کەسە شێخ و مەلا یاخو مەلا زادە نەبێ
نارمێنێ ئایینی، ناچێتە ڕیزی پڕ خەتەر
خوا یەکێ، لادا، لە ڕێ، ئینجا بەکەس نایێتەڕێ
بێ شعور و سەرسەری و بێ نرخ ئەبێت و بێ خەبەر
گەر نەدا جلوە لە دڵدا، نووری پێچوونی خودا
فائیدەی چی، شاڵی پشت، جیبەیی مێزەر بەسەر[٥]
نەفسی پیسم تابەکەی باوەش بەدنیادا ئەکەی
تۆزێ ئینسافت ببێ، وەختە ببیتە دەربەدەر
بێ دەماغە بولبولی «ئەسعەد» لە تاوی بێ گوڵی
بۆیە وا داماوە دڵ، مەحزون و لات و قوربەسەر

---

(١) شاعیر ناونیشانی بۆ ئەم قەسیدەیە دانەناوە و پێدەچێت، لە گەرمەی خرۆش و جۆشدانی خەباتی سیاسیی کوردایەتیدا لە دایک بووبێ و هەر لەو سەردەمەشدا دەربەدەری کوردستانی ئێران بووە و خۆی دیلی و زیندانی ڕژێمی پاشایەتی عێراقەوە نەداوە.
لەسەرجەم ناوەرۆکەکەیدا دەردەدڵی خۆی لەدەست کەسانی هەلپەرست و خۆویست دەرئەبڕێ و گیانی



وره بەرزی و بەرخودانیش پەیڕەو ئەکا.
(٢) شەهد: هەنگوین.
لەم بەیتەدا شاعیر بەدڵنیاییەوە ئەڵێ: کەسی نالەبار و خراپ هەمیشە زیانبەخشە و چاوەڕوانی چاکەی لێ ناکرێت، هەروەک چۆن زەردەواڵە «ژەنگەسوورە» ئازار و ئێش ئەگەیێنێ و نابێت ئەی دڵ، چاوەڕوانی هەنگوێنی لێ بکەیت.
(٣) مەحکەمەی عولیا: بەمەبەست لە دادگای ڕۆژی دوایی و حساب و لێپرسینەوەی ڕۆژی قیامەتە.
(٤) بێ سەمەر: بێ بەر، بێ بەرهەم.
شاعیر وێنەیەکی واتا بەخشی ناسکی پێشکەشکردوین و ئەڵێ:
بەدەستی خۆت (مار) مەگرە کە سوور ئەزانی زیانت پێ ئەگەیێنێت و پێتەوە ئەدات... بۆ ئەوەی ناچار نەبی بۆ چارەسەرکردنی ڕووبکەیتە کەسانی نادروست و داوای یارمەتیان لێ بکەیت، چاکتر وایە ڕوو لە نووری پێغەمبەر (د.خ) و ئایینی پیرۆزی ئیسلام بکەت، هەر ئەویشە بەرهەمی هەیە و بەفریات ئەکەوێ.
(٥) ئا لەم بەیتەدا کرۆکی مەبەستە سەرەکیێکەی شاعیر ئەدرەوشێتەوە و ئاشکرا ئەڵێ: تا نوور و شەوق و میهرەبانی یەزدانی مەزن لە دڵدا شەوق نەداتەوە هیچ شتێکی ڕووکەشی دنیایی وەک شاڵی سەوزی پشتێن و جبەی شان و مێزەری سپی سەرت، بەهاناتەوە نایەت.

***

قەت نەبوو، تووشم ببێ یارێکی پاک و بێ زەرەر
ئەهلی زانین و وەفا؛ خاوەن ئەدەب بێتو سەمەر[(١)]
هەر وەکو (زی) بێ بەرو بێ سێبەرە ئەم عالەمە
نۆکەری نەفسن وەها، پارە پەرست و بێ خەبەر[(٢)]
ڕوو لە هەر لایە ئەکەی، تەعن و توانجت لێ ئەدەن
ئابڕووی حورمەت، نەما؛ ئاوارە بۆتو دەربەدەر[(٣)]
ماڵی یەکتر وەک گەزۆ و مازوو ئەخۆن، سەیری هەیە
وا لە بازاڕی خودا، داماون و دڵ پڕ لە کەدەر
بوونە پیاوی ژن، ئەمەش جۆرە عەزابێکە ئەڵێم:
پیسترینی عیللەتە (ئەسعەد) ئەمە؛ قوڕیان بەسەر

١٩٧٢/٢١/٢١

---

(١) قەت: هەرگیز، هەمیشە.

(٢) زی: دەوەنێکی بێ بەرەو پێشی ئەوترێ (تووترک).

واتە: نە بەرهەمی هەیە و نە ئەشتوانرێ کەڵک لە سێبەری وەرگیرێت. شاعیر مەبەستی لە خەڵکە دەروون نزم و پارە پەرستەکەیە، کە لەبەر تەماعی دنیا ئاگای لە خواپەرستی نەماوە.

(٣) تەعن: طعن: تیر و تەشەر و توانج لەم و لەو گرتن.

***



## پاشە ڕۆژی مرۆڤ

کەڵکەڵە و خولیایی هیچەی کەوتە سەر
زەوقی دونیا بۆ کەسێ ناچێتە سەر[(١)]
مانی ئەمڕۆ بۆشە، مەرگی وا لە دوو
جێ ئەمێنێ دەوڵەتی ناباتە دەر[(٢)]
شاو گەدا مردن هەموو وێنەی یەکن
هەردوولا کفنێکی ڕووتی وا لەبەر
خۆ بەزل گرتن چ سوودێکی هەیە؟
ناو و ناتۆری خراپی دێتە سەر
خۆ پەسەندی، کاری ئیبلیسە نەکەن
ڕۆژی خۆی داماون و لیتە بەسەر[(٣)]
(ئەسعەد) شاییتە ئەمڕۆ بۆ سبەی؟
قوڕ بەسەر شیوەن بکە چیت دێتە سەر

١٩٩٧/٧/١٤

---

(١) کەڵکەڵە: هەواو هەوەس و ئەو ئارەزووەی ئەکەوێتە سەری مرۆڤەوە.

(٢) دەوڵەتی: سامان.

(٣) لیتە: قوڕێکی شل.

- ئیبلیس: شەیتان.

لەو بەیتەدا باس لە دەردی کوشندەی خۆپەرستی و خۆ پەسەندی ئەکات و ئاماژە بەوە ئەدات، ئەوە ڕەفتاری شەیتانە، هەر کەس خۆ پەسەند و خۆ بەشت زان بێ، لە ڕۆژی زیندوبوونەوەدا دەستەو ئەژنۆ دائەمێنێ و مەگەر قوڕ و لیتە بەسەر خۆیدا بکات.

***

ڕۆژی پێنج شەممە سەفەر بوو بەسەقەر
سینەکەم؛ بۆ حاڵی کوردی قوڕ بەسەر[1]
نەگبەتی لافاوی نەحسی هاتەوە
بۆ دڵی ئاوەرەکانی دەربەدەر
چەندە هەوڵم دا؛ نەکەن سەرناگرێ
دەستەو ئەژنۆ دائەنیشین بێ خەبەر
سەد ئەسەف؛ بێ فکرو بیرە ئەم گەلە
ڕەهبەری زانا نییە؛ خاکم بەسەر
چوار تەرەف گیراوەتن، چارە نییە
بۆیە چونگی ئەبێتە؛ میری تاج بەسەر[2]
بیست و یەکی ١٩٧٥ی زاینی بوو
دوایی هات ئەم شۆڕشەش بوو بەزەرەر
بۆ قومار و عارەق و فیکری بێ حورمەت
سەورەیە ئاغا وەرە لیتە بەسەر

١٩٧٥/٣/١٣

---

(١) لێرە هەردوو وشەی (سەفەر) ڕۆیشتن لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی دی لەگەڵ وشەی (سەقەر) مەبەست، شەختە و بەستەڵەکە ڕەگەزدۆزیەکی ناتەواویان دروست کردوون.
بەپێی شۆڕش واتای وردی ناوەڕۆکی قەسیدەکەو ڕۆژی دانانی ١٩٧٥/٣/١٣ کە ڕێکەوتی ئەو ڕۆژە ڕەشە ئەکات مقۆمقۆی دەستپێکردنی هەرەسی شۆڕشی ئەیلوولی ١٩٦١بڵاوبووەوە، پابەندبوونی هەردوو ڕژێمی عێراقی بەعس و شاهەنشای ئێران بەڕێکەوتنامەی ١٩٧٥/٣/٦وە ڕاگەێنراو پیلانی لەناوبردنی نەتەوەی کورد و نەهێشتنی ناوی کوردستان دەستی پێکرد.
بەناوەڕۆکی شیعرەکەدا دەرئەکەوێ، چ ئەو کۆستە سەختە چۆن کسپەی لە دەروونی شاعیر هەڵساندووە.
(٢) چونگی: ئەگەرچی بەواتای نێوان، بەڵام شاعیر مەبەستی لەو کەسە هەلپەرست و خۆویستانەی کوڕی ڕۆژگارن و وەک کەری ناو جۆگەوان و لە هەر کوێوە (با) هەڵبکات، بەو بارەدا شەن ئەکەن.



نەخۆی عارەق و خۆبکەی بەکەر
ڕیسوا ئەبیت و پیس و دەربەدەر
لەوەش خراپتر، قومار کردنە
ژن دۆڕاندن و نامووس بردنە
ساخووا، خۆم و دۆست و ئەولادم
نەکەی بەپەند و لۆمەی پسادم

١٩٧٣/٦/٢٥

***

نانەوێ عەزمم بەحەپس و بەرگی گوێنی جانەوەر
شار و دێهاتم بسووتێ گەنجی ببنە دەربەدەر[1]
هەوڵی (استقلالی) کوردە چۆتە کەللەی سەرمەوە
کەڵکەڵەو خولیایەکە هێزێ نییە بیکاتە دەر[2]
هەر ئەبێ ئەم حوکمە بدرێ سەربەخۆیی دەس کەوێ
ڕۆڵەیی زەحمەت کەشانێ تاجی شاهی کاتە سەر
ڕوو ڕەشی و بێ حورمەتی بۆ ئەو کەسانەی خائینن
ئەی فرۆشن ئەم گەلەی داماوو دیلەی قوڕ بەسەر
(ئەسعەد) و یارانی وا لە کەرکووکان ئەسیر
بێ کەس و بێ مەلجەئو داماوون و دڵ پڕ کەدەر[3]

١٩٤١/٧/١٠

---

(١) شیعری نەتەوەیی و نیشتمانی لە بواری خەباتی سیاسی و حیزبایەتیدا ئەبێتە چەکێکی سەخت و کاریگەری هەڵویست نواندن و بەرخودانی هەمیشەیی ئەم شیعرە لە خانەی شیعری بەرگری کوردیدا خۆی ئەنوێنێ، شاعیر لە کاتێکدا، لەسەر خەباتی کوردایەتی لە بەندیخانەی حەویجەی کەرکووک لەلایەن ڕژێمی پاشایەتی عێراقەوە زیندانی ئەکرێت و شیعرەکەش لە دایک ئەبێ.
هەر لەم بەیتەدا وەرەی بەهێز و بەرزی شاعیر بەرامبەر دوژمنانی کورد و کوردستان دەرئەکەوێ.
(٢) شاعیر بیروباوەڕی خۆی کە سەربەخۆیی کوردستانە لەم بەیتەدا ئیعلان ئەکات و بەدنیای ڕائەگەێنێ.
(٣) بێ مەلجەئو: بێ پەناو پشتیوان.

خۆشەویستی ئەی براله، بەینی شاو مسکینە دوور
بۆ عەفیف و ژیر و زانا، پارە؛ نابێتە کولوور[١]
مەسکەنی ڕووخاوە دڵ کۆچی یەکجاری ئەکا
لادە؛ لیٚم؛ ئەی نەفسی بەد ئینجا بەس بێ، لوورەلوور[٢]
هەر خەفەتباری فیراقی دووری یارم ئێستەکە
ڕۆشنا کوێرە، نابینم؛ چ نزدیک چ دوور[٣]
هەوری لەعنەت دارژاوە، وازە دەرگایی درۆ
ڕوو ڕەشە، ڕۆیی کە ئەیدا، شوعلەیی وێنەی بلوور[٤]
کەس نییە دەستمکەوێ، نەختێ سکاڵای لابکەم
بمرە (ئەسعەد) باریکرد، پیاوی پیاوانەو وەقوور[٥]

(١) مسکێن: لە لادێدا ئاغاو مسکێن هەیە... لێرەدا مسکێن: مەبەست لە خەڵکە ڕەش و ڕووتەکەیەو بەچینی دووەمی گەل دائەنرێت و زەحمەتکێشە.
- عەفیف: مرۆڤی چالاک.
- کلوور: سامان: وەک ئەوترێ: هەموو کلووری دنیام هەبێ یاخود هەموو سەروەت و سامانی دنیام هەبێ.
(٢) لوورەلوور: مەبەست دەنگ و هاواری گورگە... وەک ئەوترێ: گەلە گورگەکە بەلوورەلوور هاتن.
(٣) فیراق: جیابوونەوەی دوو هاوسەرو دۆست.
(٤) لەعنەت: جوێنێکی پیسەو بەکەسانێکی بێ ویژدان و بێ بەزەیی ئەوترێ.
- شوعلە: مەشخەڵ.
ئەم بەیتە بەواتای ئەوەدێت کەسانی درۆزن هەمیشە دەمیان کراوەیەوە و هەوری نەعلەت جوێنبارانی ئەکات.
(٥) وەقوور: پیاوی بەوەیقار... کەسێک، ڕێزی خۆی ئەپارێزێ و ئاستی خۆی بۆ مەبەستە شەخسیەکان ناهێنیتە خوارێ.

***



قایمەی زۆرە درۆ یەغمای ئەکا شاهو وەزیر
بێ بەشە لەم نیعمەتە عەللامەو پیاوی فەقیر[١]
ڕەغبەتی وا سەندووە، ناوی سیاسی لێنرا
حاکمی دابەش ئەکا سەد لەسەد بۆ جوان و پیر[*]
ڕەسم و وێنەگر کەرە چەپڵەی بەگوێ بۆ لێ ئەدا
هەڵپەڕە زۆرناژەنت با بیژەنێ بابای ئەمیر
ئەم دەهۆڵەی دەوری گێتی لێ ئەدا تا سەر نییە
ڕۆژێ بۆ میر ئەی کوتێت و ڕۆژێ بۆ مامەی گزیر[٢]
دینی شا بوو سەر نەوی کرد (ئەسعەدا) قلب الأسد
چون درۆزن بێ سوباتە ڕووی سپی لێ بوو بەقیر[٣]

١٩٤٠

(١) قایمە: قائمە: لیست.
- یەغما: تێکدانی تەخت و تاراج و نەهێشن ئەگرێتەوە.
- نیعمەتە: نعمت: بەخششی بەکەڵکی خودایی.
- عەللامە: زانا.
- پیاوی فەقیر: لێرەدا مرۆڤی بەسزمانی مەبەستە.
ئەم دوو بەیتەی؛ شاعیر بەدەستخەتی خۆی لەسەر دیوانە چاپکراوەکەی نووسیووە و ژمارەی بەیتی (١، ٢) لەسەر داناوە.
(*) ئەم دوو بەیتە شاعیر بەدەسخەتی خۆی لەسەر دیوانە چاپکراوەکە نووسیویەتی و ژمارەشی لەسەر داناوە.
(٢) شاعیر لەم بەیتەدا ئاماژەی بۆ جەنگی دووەمی جیهانی کردووە مەبەستی لەو خەڵکە هەلپەرستەیە، کە هەر جارە دەهۆڵ بۆ لایەک ئەژەنێ و ڕۆژێ پشتگیری و حکوومەتی عێراقی ئەکات و لێرەدا بە (میر) ناوی ئەبات ڕۆژێکی دی ڕوو لە مامەی گزیر ئەکات و مەبەستی ئینگلیزە.
(٣) بێ سوبات: ثبات: کەسێک لەسەر بیروباوەڕ و کارەکەی خۆی سوور نەبێ.

## بانگی یەکسانی

کەی ئەبێتن؛ پێگەیێنێ نیشتمانی؛ لاوی ژێر
تا وەکو ڕزگاریکا گەنجی؛ لە بەند و داو و گیر
تاجی عزەت کاتە سەر، شێرانە نەعرەی لێبدا
دەربکا بێگانە و بیکاتە شایی؛ جوان و پیر[١]
ڕۆژ بریسکەی با لە شاخ و گوڵ بێنێتە دەر
گەل بەخۆشی؛ بێت و بڕوا، هەروەکو سوڵتان و میر
ئەو حەلە هەر کەس لە ماڵی خۆی بەشیرینی ئەڵێ
سەد سوپاس، ڕاستە نەماوە؛ کۆتەو زنجیر و تیر
کەس بەسەر کەسدا نەچێ، قاپی قەناعەت کەینەوە
با بەسەرچێ، دەوری پیسی مردنیش بێنێتە بیر[٢]
ئەم وتارەم پووچ و بێ مەغزە لە بۆ ئەم عالەمە
سیلمی چی؟ یەکتر ئەخۆن و خاینن گەورەو گزیر[٣]
بارك اللّه (ئەسعەد)دا حەق بێژی و هەم گۆشەگیر
بۆیە دێ؛ لەو مەنزڵەت بۆنی گوڵ و عەتر و عەبیر[٤]

---

(١) تاجی عیزەت: تاجی دەروون بەرزی.
– نەعرە: دەنگی شێر، نەڕەی شێر.
(٢) بابەسەرچێ: با نەمێنێ.
– بێ مەغزە: بێ ناوەڕۆکە، بێ واتایە.
– سیلمی: سلم: ئاشتییێ.
(٣) شاعیر لەم بەیتەدا کە ئەڵێ: سیلمی چی؟ یەکتر ئەخۆن...
ئەمە لە ڕەوانبێژی، بواری گوزارەبێژیدا درکە (کنایە)یەکی پڕ واتای بەکارهێناوە یەکتر خواردن بەواتای دژی یەکن و یەکتر ئەفەوتێنن.
(٤) بارك اللّه: لێرەدا بەواتای دەم خۆش و ئافەرین دێت... کە شاعیر لەگەڵ خۆی ئەدوێ کە لەگەڵ ئەو ژیانە گۆشەگیرییەی دوای گەڕانەوەی لە سەردەشت بۆ خۆی هەڵبژاردووە، بەڵام لە ڕاستی وتن بەردەوام بووە و هەر ئەوەش وای کردووە مەنزڵی لای خەڵک بەڕێزەوە تەماشابکرێت شوێنەکەی جێنزرگەی باوانی بووە، بۆنی گوڵی جوان و عەترو عەبیری لێ بێ.



بیگەیێنە ئەی صەبا خصوصی پڕ لە ڕاز
بەو حەبیبەی بێ نەزیرەی خونچە زارەی دیدە باز[١]
وا لەبەر دەردی فیراق و خادیمی خاکی دەری
ئاهی حەسرەت گۆڕی غەم دەرکی جەفالێم بوونە واز[٢]
دوور لە ئەرزی (یثرب)ە عەیش و غەمم ناڵاننە
شین و گریە، پیشەمە چیمە لە دەنگی عود و ساز[٣]
چونکە حەسرە گەوهەری بەحری ئیلاهی هەر لەتۆ
بۆ هەمموو داماوییە دائیم ئەبێتە چارەساز[٤]
(ئەسعەدە) پێویستی سایەی ڕەحمی تۆیە ئەی شەفیع
پێم کەرەمکە غەیری تۆ مەئوانییە بۆ شوێنی ناز[٥]

١٩٥٦

---

(١) نامەی خصوصی: نامەی تایبەتی.
– بەو حەبیبە: مەبەست پێغەمبەر (د.خ) محەمەد مستەفایە.
– بێ نەزیرەی: تاکی نییە، بێ وێنەیە.
شاعیر ئەم شیعرەی بەدڵێکی بێ گەرد و ئیمانێکی بەهێزەوە لە ستایشی پێغەمبەری مەزنمان محەمەد مستەفا (د.خ) هۆنیوەتەوە.
(٢) دەردی فیراق: مەبەست لە دووری نێوان شاعیر خۆیەتی و گیانی پاکی پێغەمبەرە (د.خ).
– ئاهی حەسرەت: ئاهی پەرۆشییە.
– جەفا: ئازاد و دەردی سەری.
(٣) لەم بەیتەدا مەبەستی ناخی دەروونی شاعیر دەرئەکەوێ، لەبەرئەوەی لە خاکی پیرۆزی (یثرب) واتە مەدینەی منەوەرەکە کەعبە و گۆڕی پێغەمبەری لێیە، ژیانی بۆتە گریە و شین وناڵێن... بۆیە خۆشی بەزموڕەزمی ئاهەنگی عود و سازی لەبیر نەماوە.
(٤) حەصرە: واتە ئەوشتە هەر لەوەدا ئەبینرێ.
واتە: میهرەبانی و بارانی ڕەحمەتی خودا هەر لە پێغەمبەردا (د.خ).
حەسرە و هەر ئەمە ذاتی پیرۆزیشی بەهانای هەموو داماوێکەوە دێ و چارەی دەردی ئەکات.
(٥) سایە: سێبەر
– ڕەحمی: بەزەیی.

- ئەی شەفیع: هەر هانا بردنە بۆ ذاتی پاکی سەروەری هەموو جیهان محەمەد مستەفا (د.خ).
- پێم کەرەمکە: پێم ببەخشە.
- غەیری: تەنیا
- مەئوا: پەنا.

واتە: ئەسعەد و پێویستی بەوەیە: لە سایەی بەزەیی میهرەبانی ذاتی تۆوە بژی و بەو بەخششەی پێشکەشی ئەکەیت، شوێنی نازی بۆ دابین ئەکرێ، چونکە تەنیا ذاتی پاکی تۆیە پەنای بۆ بەرێ.

***



عاشقی یارێکی بلّحم بێ شعور و گێژو وێژ
وا لەبن دەسیا ڕەقیبی بێ حەیاو گوێ درێژ[1]
خۆی بەدۆست نیشان ئەداتن دوشمنی کوردانەیە
جەردەیەو ناکەس بەچەو میللەت فرۆش و زۆر بوێژ
سەیری بێ بارو بەد ئەتواری و هەموو شکڵی بکە
هەر دەقیقەی بۆ کەسێ زۆڕناژەنەو گۆرانیبێژ[2]
سا خوا ڕەحمێ بەحاڵی بێکەس و داماوی من
تاوەکو ڕزگار ئەبم لەم ڕێگەیەی هەوراز و لێژ
ڕوو لە قیبلەی (مصطفی) یارەبی (ئەسعەد) لانەدەی
خۆم لە بیر و خۆت لە بیرم دەرنەکەی تالالە نێژ[3]
بانگەواز کەن کۆ وەبن یاران بەگەل نوێژم بکەن
بەڵکو مەعفوبم بەبۆنەی بەحری پڕ ئەنواری نوێژ[4]

١٩٧٠/٧/١٠

(١) بلّح: ناشیرن و ڕەزاگران.
- بێ شعور: بێ هەست و بیرکردنەوە.
- ڕەقیب: نەیار و ناحەز.
- گوێ درێژ: کەر.
(٢) بەد ئەتوار: هەڵسوکەوت ناپەسندو ناشیرین.
- شکڵ: شێوەی بیچم و دەم و چاو ئەگرێتەوە
(٣) ڕوو لە قیبلەی مستەفاکەم: ڕوو لە کەعبە بکەم.
(٤) مەعفو: خودای مەزن لێم خۆش بێ.

دیم لە بەرگی مردوانا نەو نەمامێکی کەساس
دەستە ئەژنۆ عاجز و شەرمندە و بێ دەنگ و باس[١]
نەختە نەختە چوومە لای و پێم وو نووری چاوەکەم
تۆ چی و ئەم حالّە چی؛ بۆچی وەها بردووتی تاس[٢]
پێمی فەرموو من فریشتەی خوێنەوارێکم فەقیر
بێ کەس و بێ مەلجەئو داوەتن عەینی پەڵاس[٣]
پێم وو: ناشێ بەختی شوومی ئێمەی بێچارە بی
هێند سەراسیمەو پەرێشانی لەناو جن و (أناس)[٤]
ئارێ، ئارێ دەردی بێ دەرمانییە ئەم عالەمە
وا لە گێژاوی بەڵادایە کەسیفیشەو کەساس[٥]
نابینی بۆتن بەشا، چەورەی وڵاتان و گەدا
هاتە گۆڕێ قوڕ بەسەر قانوونی چەوت و بێ ئەساس[٦]
کوێوە چوو دەریای ئەدەب بۆ (ئەسعەدا) وشکایی هات
گەر کەسێ مابێ برا فەوتاوییە بیر و حەواس[٧]

١٩٦٩

---

(١) دیم: بینیم.
- نەونەمام: مرۆڤێکی لاوی تازە پێگەیشتوو.
(٢) پێم وو: پێم ووت: زۆرجار لەلایەن خەڵکی ئەسڵی سلێمانییەوە ئەو (ت)یە لە ئاخاوتندا ئەخورێ و ناوترێت.
- بردووتی تاس: ئەوترێ: تاس بردویتیەوە و شاعیر بۆ زەرورەتی شیعری بۆی هەیە جێگۆڕکی بە وشە بکات.
(٣) عەینی پەڵاس: هەر وەکو پارچە بەڕەی کۆن.
(٤) پێم وو: پێم وت. لەبەر پێویستی کێشی شیعری ئەو (ت)یە خواوە.
- شووم: نەگبەت.
- جن: جنۆکە.
- أناس: مرۆڤ.
بەپێی کاتی دانانی شیعرەکە کە ساڵی ١٩٦٩یە و بەهۆی ئەو دوو بەرەکی و شەڕە ناوخۆیەی باڵی



بەسەر قەزییەی شۆڕشی ئەیلوولدا کێشابوو، زۆرکەس بەرەشبینییەوە ئایندەی کوردی هەڵ ئەسەنگان، بەڵام شاعیر لە ڕێی شیعرەکانییەوە، ئەو ڕەشبینیە ڕەت ئەکاتەوە و ئەو نەگبەتیەی لەو ڕۆژانەدا بەسەر کوردا هاتبوو، لەبەردەم ورەی بەرزی بڕوا بەخۆو قەزییەی ڕوای کوردا هەر ئەبێ چارەسەربکرێت و پێویست بەسەرسوڕمان و واق وڕمانی پیاو چاکان و نۆکەر و بەکریگیراوان ناکات... لێرەدا شیعر هەڵوێستەو مەشخەڵی ڕێگا ڕووناکەرەوەی میللەتە.
(٥) کەسیف: پیس و پۆخل.
(٦) چەورە: بەکەسانی هیچ و پووچ و بێ بەها ئەوترێ.
(٧) حەواس: هەست و مەبەست لە پێنج هەستەکەی مرۆڤە بیستن، بینین، چێشن، گەیاندن، بۆن، بەڵام لێرەدا و لەناوچەی سلێمانی ئەوترێ، حەوا سم نییە، واتە: تاقەت و ئارەزووم نییە.

تەماشا عەیبی خۆکەم؛ قەت ئەبینم ئیکە عەیبی کەس
ئەگەر دنیام بەنێ نالێم، عەزیزم ئیکە بۆ من بەس[١]
سکەندەر، شەرق و غەربی گرت، تەماشاکە نەبوو تێربێ
هەتا میوانی بۆ مەرگ و بەتەنیا مایەوە بێ کەس[٢]
ئەوا حەربی سێیەم نزدیکە، عالەم نەخشەیی تێکچێ
لە بازاڕی خیانەتدا؛ بمێنێ کەللەزل، بێ دەس
ئەلای هەر کەس؛ ئەچی، بۆ هەرشتی موشکیلە ئەمڕۆ
ببێ مەردێکی وا بێتو بەڕووخۆشی بڵێتن هەس[٣]

بەیتەکە خۆی لەم واتایەدا ئەبینێتەوە: بۆ چارەسەری کێشەکانت، بۆ لای هەرکەس ئەچی بەپیرتەوە نایەت و نالێت... باشە و چارەی تۆ لای منە.

(١) بەنێ: بدەنێ.
ناوەرۆکی شیعری ڕەسەن، پشت بە بەها بەرزو پیرۆزەکان ئەبەستێ، شاعیر لەم بەیتەیدا، بەنەوازشێکی تەواو، دان بەخەوشەکانی خۆیدا ئەنێ و ئەڵێ: تا من خۆم ئەو کەموکورتیانەم هەبێ، پێویست نییە، بەدوای عەیب و عاری کەسدا بگەڕێم... بۆ گەر هەموو سامانی دنیام بدەنێ نالێم: دەی هی دیم بدەنێ و هەر تەماع سواری کەللەی سەرم بێ!.
(٢) سکەندەر: ئەسکەندەری مەقدونی.
(٣) ئەلای: بۆلای.
- هەس: هەیە.

***



(ئەردەشێر) و (بابوک) و (بەهمەن) نەماوە نەفسی پیس
خۆی لەخوم یا (خومانی) (شا)ی دارای چوو لەکیس[*]
تاجی بوو ئەیخاتە سەرسک، شیوەنی فرزەند ئەکا
کەیف و شادی، بێ دەوامە، حەسرەتە بۆ دڵ، ئەنیس[١]
پایی لەنگم، نابڕێ قۆناغی دوور و ناڕەحەت
مەر خودا ڕەحمێ بکا، بمخاتە سەر ڕێگەی سەلیس[٢]
کێ لە مێژووی عالەما، بیستوویەتی جیلی وەها
بێ وەفا، بێ مەبدەئو، بێ بارو وا تەبعی خەبیس[٣]
گەر یەکێکی بیخەیە؛ بەحری سپی، ئەیکاتە ڕەش
بۆ دەوا دەسناکەوێ ساغ و سەلیمێک و نەفیس[٤]
ئەی قەناعەت چەندە بەرز و باش و خاوەن قیمەتی
زەڕەیەکی تۆ ببێ، نایدەم بەتاجی شاو ڕەئیس
چیم بەسەرهات (ئەسعەد)! چیم دی لە ماوەی ژینما
(نوح) بەسەد ساڵەوە نەیدویە کاتی وا نەحیس[٥]

١٩٧٢

(*) دنیای شیعر بەربڵاو قووڵە و تا لێی وردبیتەوە، واتاو چێژی نوێی لێ هەڵئەهێنجی... شیعر لە هەموو دەرگاکانی ژیان ئەدات و ئەرکی شیعریی بەجێئەهێنیت... لەم قەسیدەیەدا ڕووداوە مێژوویەکان وەک پەند و عیبرەتی زەمانە ئەهێنیتەوە یاد و ئاماژە بەو پاشا و سەرکردە مەزنانەی مێژوو ئەدات، چۆن لەگەڵ ئەو هەموو دەستەڵاتەیاندا تا سەر نەژیان و تەنیا ژیانی زیندوێتی بۆ کاری باشەیە.
- خۆی: ئەو.
- لەخوم: لەهەش... ڕەنگێکی شینی گیراوەیە.
(١) فرزەند: منداڵ... بەچکە.
- ئەنیس: یارو ئازیز و هاودەم.
(٢) پایی لەنگم: قاچی خوار و گێڕ.
- مەر خودا: مەگەر خودا.
- سەلیس: نەزمونیان ڕەوان... بەڵام لێرەدا بەمەبەستی ڕێگای ڕاست و ڕەوانی ئایینی پیرۆزی

ئیسلامە.

(٣) تەبعی: (طَبعْ)... هەڵسوکەوت ڕەفتار.

خەبیس: خبیث: پیس و پوخڵ... دەروون ژەهراوی، دڵ ڕەش.

(٤) سەلیم: سلیم: ساغ.

– نەفیس: نفیس: خاوێن و بەهادار و هەندێک جار کاروچالاکی و شتی دەگمەنیش ئەگرێتەوە.

(٥) نوح: حەزرەتی نوح کە تەمەنێکی درێژی بەسەر بردووە و خۆی و خێزانەکەی لەو لافاوە مێژووییە ترسناکەدا ڕزگاری بوو. بەنموونەی تەمەن درێژی ئەهێنرێتەوە.

– نەحیس: نحیس: نەگبەت– شووم، بەخت ڕەش کاتە نالەبار و چەوتەکانی ژیانی مرۆڤ.

***



دوو زمـانی؛ بەسـیـەتی؛ ئەی نەفـسی پیس
بۆ لەگـەڵ شـەیتـان ئەبیـتـە هاوجـەلیس[١]
غـەیبـەت و فـیـتنە و فـجـوری تابەکـەی
فکری پووچت بـانەدا ڕیس و گـــوریس[٢]
لابدە مـــــەیلت لە گـــێـــتی بێ دەوام
بیـرە سـەر خـولق و ڕەوشـتـێکی سـەلیس[٣]
یـاڕەبی ســـــابت بکـەی ئـاینەکـــــەت
لەم دڵەی؛ پڕ وەس وەسەی پیس و خەبیس[٤]
ســەد ســەلامت بۆ عـــەلەیکی لێ ئەکــەم
تا ژیانم شـــایی، بێ، نەڕوا لەکـــیس[٥]

---

(١) هاوجەلیس: هاوبەش هاوکار...

(٢) فجور: کاری ناپەسەند و بەدڕەوشتی وەک ئەوترێ فسق و فجور.

– تابەکەی: تاکەی؟.

(٣) مەیلت: ئارەزووت.

(٤) وەس وەسە: دوودڵی: ڕاڕایی... مرۆڤ کە لەسەر بیرو هەڵوێستێک سەقامگیرنەبێ و هەرکاتە هەڵوێستی بنوێنێت.

(٥) نەروا لەکیس: دەستت نەچێ.

***

شەرمی عالەم بوو بەدیل و سواری بوو بێ شەرمی پیس
بۆتە (عەنقا) حورمەت و بێ حورمەتە گێتی خەبیس[١]
تۆ بڵێی کۆنیش وەها بوو بێ گەلی بێ یارەکەم
غەیری لۆتی نەی بووە مەردێکی ژیر و هاوجەلیس[٢]
ڕوو پەڕەی مێژوو درۆیە چاکەیی ئێمە بڵێ:
خۆش نییە دڵ قەت بەباسی شاهو میرێکی سەلیس
نویزەیە بێت و بەیانی حاڵی ئەم خەڵقە بکەم
بەردە بارانم ئەکەن وا ئەم خەنە بن دارو لیس[٣]
چاکی ئێمە نادرە، چاکی خۆ و هەڵکە برۆ
بەسیە تەفرە (ئەسعەدا) عومری عەزیزت چوو لەکیس[٤]

١٩٧٠

(١) عەنقا: مەلێکی ئەفسانەییە، ناوی هەیە و بەدەنی نییە، ئەڵێن: ئەگەر بەسەری هەر مرۆڤێکەوە بنیشێتەوە، تاجی پاشایەتی لەسەر ئەنرێ.

(٢) لۆتی: کەسانی بێ شەرم و بێ چاوو ڕوو.

(٣) نویزەیە: نبذە: کورتەیەک.

– لیس: تێلا: دارێکی ئەستوورە و درێژی یەک مەتر تا دوومەتر ئەبێ.

(٤) چاکی ئێمە: قۆڵ و مەچەکی ئێمە.

– نادرە: دەگمەنە.



لەگەڵ دەردو بەڵا جووتم، لە کەیف و شادییا بێ بەش
لە زوهد و تاعەتا نیمە بەشێ، سا بەش خودایا بەش[١]
دروست بۆ تاعەت و ئەمما خەجاڵەت مام و بەدکردار
ڕەشی چارەم بکە یارەب بەغونچەی نەو گوڵاڵەی گەش
بەتۆز و گەردی بەیتت مشت وماڵی قەلبی قەڵبم کە
لە قاپی ڕەحمی خۆتا منیش تاکو ئەبم بێ بەش[٢]
بەرێگەی ڕێ ڕەوانا بمخە ڕێگەی (مکە) و (یثرب)
لە نووری عەشقتا جیلوە بسێنێ سینەکەم بێ غەش
ئیلاهی ڕەحم و لوتفێ کە بەحاڵی (ئەسعەد)ی داماو
ببورە لێم گوناهبارم خوایە ڕوو ڕەشم ڕوو ڕەش[٣]

١٩٥١

(١) زوهد: عیرفان: خواپەرستی... پشت لە دنیاکردن و ڕوو لە قیامەتە و دوورکەوتنەوەیە لە هەموو شتێکی ناپەسند و ناڕەوا.

– تاعەت: طاعت: لێرەدا بەمەبەست بەجێهێنانی فەرمایشتەکانی خودای مەزن و ڕێنمایی و ئامۆژگاریەکانی پێغەمبەر خۆشەویستمان (محەمەد) د.خ دێت.

شیعر بۆ خۆی هونەرێکی ناسک و وردە و شاعیریش هونەرمەند... بۆ هێز و پێزی شیعرە لە چنین و سازدانی واتادایە، لەم بەیتەدا شاعیر پەنا بۆ بەکارهێنانی ڕەگەز دۆزی بردووە بەسێ جۆر واتا لە شیعرەکەدا ڕازاندۆیەتەوە... یەکەم: بەش: قسمەتە و دووەم: حصەیە و لە سێیەمدا بەمەبەستی کەرەم و بەخششە.

(٢) قەلبی قەڵبم: دڵی نالەبار و پیسم.

(٣) ڕووڕەشم: خوازەیەو مەبەست لەوەیە: گوناهبارم.

حەیاتم خەرجی غەم کردووە، نەما بۆ کەیف و شادی بەش
لەناو ئەم ئەهلی بێبارە بەجارێ بوومە کوپەی هەش[1]
کە مینی گرتووە لێم، دوژمنی دینم، خوا حافیز
حەیا ناکا؛ لە ئەتواری، ئەبینێ چارەکەی وا ڕەش[2]
بەچی؟... بۆچ؟ ئەم غرورە، ئەی سەگی نەفسی لە پەت بەربوو
بەسیبێ، ئەم وتەی پووچە، خووا پێدراو ئەڵێن: ساوەش[3]
لەگەڵ ئەهلی دڵا؛ بێ دڵ مەحاڵە هەڵبکا ئانێ
ژیانم؛ مردنە دایم، ئەبینم پڕ بەعالەم غەش[4]
حەیا هەروا؛ لە دنیا گەر نەبوو، ئەمجا پەنا بەخوا
ئەبینی بەردەبازت بێ لە ڕێبازا سەری بێ لەش

١٩٧٥/٦/٨

---

(١) حەیاتم خەرجی غەم کردووە: ژیانم لە پێناوی غەمدا بەسەر بردووە.
– کوپەی هەش: کوپەی خەم... یاخود ڕەنگی شینی خۆماوی.
(٢) کەمین: سەنگەری لێ گرتووم خۆی بۆ ناومەتەوە.
– لە ئەتواری: لە ڕەفتاری.
(٣) ساوەش: سا+ وەش: بۆ دەنگ و هاوارێکە بۆ وەستاندنی (کەر) بەکاردێ.
(٤) مەحاڵە: هەرگیز ناشێ و نابێ.
– ئانێ: ساتێ، کاتێ

***



غەزەبناکە لە من یار و ڕەقیبیشە
ئیهانەم زۆر ئەکا پیرو شەبیبیش[1]
لەبەر ڕاستی وتەو تەعن و توانجم
هەموو بێ زارە، لێم پیس و خەبیسیش
لە میری و گەل ئەوەن بێ زاری ژینم
دوعای مەرگم ئەکا، دۆست و تەبیبیش[2]
دڵم پڕ حەسرەت و دەرد و زوخاوە
لەناو ئەهلان، ئەوەندەم دی خراپە
لەبەر چاو و دڵم کەوتووە حەبیبیش
دیموکراتی وەکو یەکبن درۆیە
بەچەوتی تێ ئەگا خاوەن سەلیبیش
لە سەد؛ جاران؛ یەکێ خائین بەگەل بوو
هەموو ئێستا بەگەل وایە لەبیبیش[4]

١٩٧٢/٢١٢

---

(١) شاعیر کەم شیعری هەیە وردەکاری هونەری شیعری تیا بەکار نەهێنابێ، زیرەکانە پەنای بۆ گوزارە
بیرژی لەبواری ڕەوانبێژیدا بردووە.
لەم قەسیدەیەدا لەچەند شوێنێکی (عجز)ی بەیتەکاندا وشەی دژیەک (طباق)ی بەکارهێناوە،
وەک: یار و ڕەقیب: یار و نەیار.
پیروشەبیب: بەساڵاچوو لاو.
– غەزەبناکە: تووڕە و بەقینە.
– ڕەقیب: نەیار، ناحەت.
– ئیهانە: سووکایەتی پێکردن.
(٢) تەبیب: طبیب: پزیشک.
(٣) حەتتا: تەنانەت، هەتا.
– حەلیب: شیر.
(٤) لەبیب: نەزاکەت؛ ژیر.

کـــــون بەکـــــون دەوران هـادی نەمـــــاوە ئـەو دریێغ
هەر مـــەکـانێ بۆی ئەچی شـادی نەمـاوە ئەی دریێغ[1]
ســــەیری چاوو دڵ ئەکـــەم کـــوێرە بینـایی بیلبـــیلە
هەوڵـی چاو بۆ زۆر ئەدەم عـــادی نەمـــاوە ئەی دریێغ
ڕاسـتـیـیـە، دەس ناکـەوێ گـوێ ڕاگـرە شـام و سـەحـەر
ســەد حـەیف غـەیری درۆ ناوی نـەمـاوە ئەی دریێغ[2]
کوردە بۆ بوویە (عـنادی) و (عندی) و (لاأدری) تۆ[3]
هەر حـــەقـــائیق ســـابتـــە باسی نـەمـــاوە ئەی دریێغ
مـــەســـئـــەلەی زانینی ئێـــمـــە بوو بە دینـارو فلوس
پووچە کـە (ئەسـعــەد) گـەنم زادی نەمـاوە ئەی دریێغ

١٩٤٨

(١) هادی: مەبەست لەو مرۆڤە مەزنانەیە ڕێنمایی و ڕێنیشاندەری چاکەن و خەڵکی لە ڕێگای چەوت لائەدەن.
- ئەی دریێغ: ئەی بۆ هاوار و دەستەو دامێن گرتنە.
- دریێغ: لێـرەدا بەمـەبەسـتی ئەوەیە: بەداخـەوە... واتە: ئەی داغ... ئەی هاوار هەروەها بەواتای (ئەسەف)یش دێ.
شاعیر هێندە دڵ پڕ لە حەسرەت و داخە لەم پارچە شیعرەیدا سەروای هەموو بەیتە شیعرەکانی بە (ئەی دریێغ) کۆتایی هێناوە.
- شام: ئێوارەیەکی درەنگ: شێوان وەک ئەڵێ: نوێژی شێوان.
- سەحەر: بەری بەیان... کە دنیا ڕۆشن ئەبێتەوە،
(٣) عنادی: لاساری... سووربوون لەسەر ڕەئی خۆ.
- عندي: لامە.
- لا أدري: نازانم.



هەڵپــەڕە عـــیـــفـــریتـــەکـــەم لێــدە لە دەف
پرچ و قژ داهێنە؟ (مێ) گرتوویە صەف[1]
هـای و هـووی دێـوانـەکـــــــــە بـۆ پـارەیـە
ڕێگەیی ڕاســــتی نەمــــا ڕۆیی شـــەڕەف
ئەی فرۆشن علمی پاکی (مصطفی) (ص)
بـۆ ژن و مـــــــاڵ و منالـی وا ئەســـــــەف
ئـاگـــــــری کــــــوژایەوە ئـاگـــــــر پەرست
هەڵ کـــــرا نووری خـــــووا بوو بەهەدەف
پیسە (ئەسعەد) قەول و فیعلی جەعفەری
ســەبکەرو بێ ئابڕون و بێ شـــەڕەف[2]

١٩٧٠

(١) عیفریت: خێو، دێو.
- صف: ڕێز، ڕێزی گرتووە.
(٢) سەبکەر: سَبْ: جنیو؛ سەبکەر جنێو فرۆش.

دۆستی کەر پیسم ئەکا، دوشمنی عاقڵ نەزیف
قەت نەبوو تووشم ببێ لەم عومرەدا پیاوی شەریف[1]
داخ و دەردم، هێندە زۆرە، ڕۆژی ڕووناکم شەوە
وەک شەوە ڕەش بوو دڵم، تەنیا نشینم بێ حەریف[2]
حاڵ و ئەحواڵم ئەپرسی، وا بەدەستی چەرخەوە
عەسکەری داماوم و کەوتوومە بن حوکمی عەریف
نەفسی زاڵم مونزەویبە، تاکو ئەمری بسرەوە؟
چوو بەسەرکاتی جەوانی، مایەوە لات و نەحیف[3]
ئەمری کوشتن دەرئەکا، یارم خودایە بەرکەوم
زەحمەتە بێڵێ؛ عەدو، بکرێ وەها کاری زەریف
بەسیە؛ تەعنەم لێمەدە، ڕەحمت ببێ نەختێ ڕەقیب
(ئەسعەد)ە غەمخۆری غەم، تەنیا و تاکە، بێ ڕەدیف[4]

١٩٧١

(١) نەزیف: نظیف: خاوێن، پاکژ.

لەم بەیتەدا هەست بەهونەری تێهەڵکیش (تضمین) ئەکەین و ئەمە لەو پەندەوە هاتووە:

دوژمنێکی عاقل سەد دۆستی کەر دێنێ... چونکە مرۆڤ ئەتوانێ گفتوگۆ و هەڵسوکەوت لەگەڵ مرۆڤی ژیر وا بکات، چونکە گوێت لێ ئەگرێ، بەڵام دۆستە نەزانەکە سواری کۆڵی نابەڵەدی ئەبێ و نازانرێت چیی لەگەڵدا بکرێت.

(٢) بێ حەریف: تاکی نییە، بێ وێنەیە.

(٣) مونزەوی: خۆ پەنادە، نەرم بەو ڕەق مەبە، زۆجار واتای گۆشەگیریش ئەبەخشێ.

– نەحیف: زعیف: لاواز و بێ هێز.

(٤) بێ ڕەدیف: بێ هاوجووت، بێ هاوتا.

***



دەم برینارم عەزیزم ناخورێ بۆم نانی ڕەق
موشتەریتم مەمدەرێ ئێسقانی ڕووت و گۆشتی چەق
لێت قبوڵ ناکا خوا بەردی کەم و سەوزەی ڕزیو
ئاو بەبامێدا ئەکا لێی ون بووە ڕەفتاری حەق[1]
ڕامەکێشە دەس لە گەز مەیدزە نەختێ قوماش
بیری بازاڕی سبەینێ کەن هەیە گۆپاڵ و شەق
دادی خۆم هەر وا لە دڵما داد پرسێکم نەبوو
مروەتێ داوا ئەکەم لێم سوور ئەبێ دوو چاوی زەق[2]
میللەت و میری هەموو گورگە لە بۆ پیاوی فەقیر
ڕۆژی نەحسە (ئەسعەدا) بگرە دەس و داوێنی حەق

١٩٧٠/٧/٢٧

(١) بەردی کەم: سەنگی سووک... سا ئەوە کیلۆ غرام بێ یاخود هوقە.

لەم پارچە شیعرەدا... پەنا بۆ بەکارهێنانی (درکە) کینایە براوە و کە ئەڵێ: بەردی کەم ئەمە تیرو تەشەرە لەو بازرگان و دوکاندارانەی لە قورسایی سەنەگەکەیان کەم ئەکەنەوە و بەوەش مافی کڕیار ئەخۆن و هەقی خۆی نادەنێ.

(٢) مروەت: بەزەیی... میهرەبانی.

## چارەنووس

کە شێتی ئەربابی ئێمە چەرخی دوون کردیە خەڕەک
زاوییەی فیکرم لە غەمدا، کەیلە وەک جەرگی سەمەک[١]
گۆی سەرم، کەوتووە لە مەیدانی حەقارەتدا ئەسەف
کوا زەعیمی شەقژەنم، بیخاتە بەردەستی مەلەک[٢]
بەرگی حەسرەتبار ئەپۆشم، گریەو و شیوەن ئەکەم
گەه لەبەر لۆمەی بەد و گاهێ لە دەس چەرخی فەلەک[٣]
شێخی ملهووڕ بوو بەدوشمن، چۆتە بنپێی دولبەرم
فیتنەو نامەردییە و کاری وەکو (باجی مەلەک)
حاڵی (ئەسعەد) چۆنە ئێستە، پێت بڵێم گیانی برا
وا لە گێژاوی بەڵادایە، دڕا کوننەی کەڵەک[٤]

١٩٤٦/٨/٢٠

(١) کەشێتی: لە هەموو دەفتەرە دەستنووسەکاندا کە شێتی نووسراوە، بەواتای خۆش و شادی دێ، بەڵام کە لە وشەکە ورد ئەبینەوە و بەکەشتی واتە (بەلەمی) گەورە ئەخوێندرێتەوە زیاتر لەگەڵ دێری ئەم (صدر)ە شیعریەدا ئەگونجی، کە سەرواکەی خەڕەکە، کەشتی کە شەق و شڕ ئەبێ، پێی ئەوترێ. ئەڵێی: خەڕەکە شکاوە و بۆ زیاتر پشتگیری ئەم بۆچوونەی دوایی، سەروای عجزی هەمان بەیت (سەمەک)ە واتە ماسی: کەواتە ئەم واتایەی دواییان باشتر لەگەڵ سەرجەم واتای بەیتەکەدا ڕێک ئەکەوێت.

(٢) حەقارەت: گەوجێتی، کەرێتی.

- مەلەک: فریشتە.

(٣) چەرخی فەلەک: ڕۆژگاری بێ بار و پشت.

(٤) کوننەی کەڵەک: کەڵەک، چەند تەختەو دارێک لەسەر چەندین کوننەی پڕ لە هەوا دائەنێن. بۆ پەڕینەوەی شتومەک لە ئاوێکی قووڵدا بەکاردێت دیارە کە کوننەکان دڕان، ئەوا کەڵکەکەش ژێر ئاو ئەکەوت واتای ئەم بەیتە لەگەڵ سەرتاپای واتای شیعرەکەدا گونجاوە.

***



دڵ تۆبێ دەمی نەشتەری نیشانە خووا مەرگ
هەم حەپسی دەسی دولبەری زیشانە خووا مەرگ[١]
کوا عەهد و وەفا ئەمڕۆ لەسەر ڕووی زەمینا
هەر بوغزو حەسەد پیشەی ئێشانە خووا مەرگ[٢]
وا شێخ و مەلا پیر و مرید و شەه و دەروێش
بەم حاڵە هەموو سەیری پەرێشانە خووا مەرگ[٣]
نزدیکی ئەوەڵ نەفخەیە وا ناکەسی میری......
دڵ بۆتە وەرەم سینە پەرێشانە خووا مەرگ[٤]
سەیری کە هەتا مەددی نەزەر (ئەسعەد)ی غەمبار
دنیا بەمەسەل خانەیی جاشانە خووا مەرگ[٥]

١٩٦٧

(١) زیشانە: ذي الشأن- صاحب الشأن: خاوەن پلە و پایە.
شاعیر لەم پارچە شیعرەشیدا پەنا بۆ هونەرێکی دی هۆنینەوەی شیعر بردووە... ئەتوانین ئەم شیعرە بەشیعری دوو سەروا (مستەزاد) دابنێین... سەروای یەکەم و سەرەکی (شانە) سەروای دووەم خووا مەرگ کە لەبەیتی یەکەمدا و لە (عجزی) هەموو بەیتەکانی دیدا دووپات بوونەتەوە:

دڵ تۆبێی دەمی نەشتەری نیشانە      خوامەرگ
هەم حەپسی، دەسی دولبەری زیشانە      خوا مەرگ.

(٢) ئێشانە: ژان و ئازار.

(٣) شەه: شاه، پاشا.

(٤) نەفخە: بەواتای خۆ بەزل زان... لە ناخا خۆ گەورەکردن.

- وەرەم: لوویەکی پیسەو مەترسیدار.

(٥) مەددی نەزەر: تا چاو بڕکات.
بەپێی مێژووی دانانی شیعرەکە... شاعیر خەم بەدەست زەمانەوە ئەخوات و مەرگ بەئاوات ئەخوازێ... بەتایبەت بەهۆی ئەو دیاردە نادروستەوە کە پشتگیرکەرانی ڕژێم زۆر تەشەنەی سەندبوو، بڵاوبووەوە، خەڵکی مۆڵگاکانیانی بەنموونە ئەهێنایەوە.

بەقوربانی دەمت بم غونچەیی نەکراوەیی سەرچڵ
لە حەسرەت لێوەکەی ئاڵت ئەوا دەردێ بەجارێ دڵ
لە ئەوجی ئەتڵەسا دەنگی فغان و ناڵەیە ئەبیەم
ئەڵێن شینی گوڵەندامەکە بولبول وا ئەکا بۆ گوڵ[١]
نەوی بەختی بەدەم، دووشەشی هێنا مۆرەیی دوشمن
خەیاڵی خاوە گەر بیکەم ویساڵی خاڵەکەی لامل[٢]
گوڕ و مەگرە عەزیزم پیری دڵ بۆ فاحیشەی دونیا
دەنی هیمەت مەبە لادە لە عەشقی زنجیانی قول[٣]
بەدەم شیری بڕۆی لەیلایە وا جەرگی لەتە (ئەسعەد)
نیشانەی بەختیاریمە کە کفنم کردووە گوڵ گوڵ

١٩٣٧

(١) لە ئەوجی ئەتڵەسا: لە لوتکەی یاخود لە هەڕەتی جوانیدا...
- ئەتڵەس: پارچەیەکی قەشەنگە و سەرنج ڕاکێش.
- ئەبیەم: ئەیبیستم.
(٢) نەوی: هاتە خوارەوە... کزولاوازبوو.
(٣) گوڕ و: منالّ بەگریانەوە ئەتۆرێ.
- فاحیشە: ئافرەتی داوێن پیس.
- زنجیانی قول: مرۆڤی زنج و قولەڕەش.



غەزەبناکە لەگەڵما دڵ
گڕووی گرتووە، ئەڵێن گوڵ[*]
گوڵی چی؟ قوڕبەسەر ئێمە
بەسەر چوو باخەی بولبول
بولبولی بێ کەس ئەناڵێ
لە بۆ وشکی گوڵی سەرچڵ
چڵی بەرزی نەمامی من
وەبەر نایە بەکەیفی دڵ
دڵی سووتاوەتن (ئەسعەد)
لەناو عاشق ئەوە بێ دڵ

١٣٧١ک

(*) دوا بەسەر (العجز إلى الصدر) یان (رد الصدر الى العجز) هونەرێکی بەرز و ناسکی شیعرییە و گەر توانایەکی بەهێز نەبێ شاعیر توخنی ناکەوێت.
ئەمەش لەوەوە دێت تەنیا یەک وشە یاخود چەند وشەیەکی جیا لە هەردوو شەتری بەیتێکدا یاخود لە کۆتایی عجزی بەیتی یەکەمە و ئەهێنرێتە سەرەتای (صدر)ی بەیتی دووەم... ئەمەش زیاتر بەمەبەستی جوانکاری و ڕازاندنەوەی شیعرەکەیە و لایەنی هونەری پێ بەهێز ئەبێت... شاعیر لەم پارچە شیعرەیەدا پەنای بۆ بەکارهێنانی ئەم هونەرە بردووە و تیاشیدا سەرکەوتووە.

***

خووا ڕەحمێ بەمن کە، دڵ بریندارم دەخیل
خاوەنی نەفسی خەبیس و غەددارم دەخیل[1]
هەرچی هەوڵم دا لە ئەوەڵدا بەکامی دڵ نەبوو
دوایی عومرم کەوتە ئەمڕۆ چەند گرفتارم دەخیل
هەڵکەنن گۆڕم لە هەر لا، دەست ئەکاتە شیوەنێ
ئەی خووا بۆ بوومە وەیلی پیاوی غەددارم دەخیل
مردوو مردوو گریە و زاری ئەکا بێ قیمەتە
ڕۆیی ڕۆیی کەس نەما بێ هاودەم و یارم دەخیل
(الأمان یارب أمان) داماوە (ئەسعەد) (الأمان)
ئومەتی ئاخر زەمانم بلّح و غەددارم دەخیل

١٩٦٩/٧/٢٢

(١) دەخیل: هاوارە بۆ خودای میهرەبان... تاکو بەزەیی بەئوممەتی محەمەددا (د.خ) بێتەوە و پەناو داڵدەی بدات.
دەخیل: هەر بەواتای (الأمان)ی زمانی عەرەبییەو داوای پەنابردنە بۆ خۆ پاراستن... بەلای مرۆڤی خواناس و موسڵمانەوە، تەنیا میهرەبانی هەرە مەزن... خودای گەورەیە.
شاعیر لەم شیعرەیدا بەتەواوی دەستی لە دنیا شتووەو هەر چێکیشی لەو پێناوەدا کردووە بۆخۆی بەغەدری ئەزانێ، بۆیە لە خوای مەزن ئەپاڕێتەوە، لە سێبەری بەزەییدا ڕەحمی پێ بکات و لە سزاو ئازاری ئەو دنیا بیبەخشێت.



شێخی دەسبڕ بۆ وا لە دینی (احمدی) بوو بە بەڵا
عالمی ناتێگەیوو شەرعی هەموو خستۆتە لا[1]
کوڕی زیکری گرتووە گیسکانە دەروێش کۆوەکەن
ڕەشبەڵەک سەیری بکەن کەوتۆتە حاڵی حەلوەلا
صۆفیانی مل وڕوو ڕیشی ڕیبازی درێژ
پێ لە بەرماڵم دەنێ بوونە یەزیدی کەربەلا[2]
هەڵکە لا لە بگرە ڕێگە دەرناچێ کیبر و شەیطەنەت
بۆ زەمانەی فاحیشە با خۆ نەکەی تووشی بەڵا
خۆت قصوراوی مەکە (ئەسعەد) لە بۆ قصر و قصور
ڕۆژی تاریکت لە پێشە ڕێگەیەکی پڕ بەڵا[3]

(١) دینی ئەحمەدی: دینی محەمەد مستەفای پێغەمبەری خۆشەویستمان (د.خ) کە ئاینی پیرۆزی ئیسلامە.
(٢) یەزیدی کەربەلا: مەبەست لەو ڕووداوە دڵتەزێنەیە کە لەناو شاری کەربەلادا ڕوویدا و یەزید بەکوژەر و شەهید کەری حەزرەتی حوسێن کوڕی ئیمامی عەلی دائەنرێت و ئەوترێت: شەهیدی کەربەللا.
(٣) لە نێوان هەردوو (قصر و قصور) ڕەگەزدۆزی ناتەواو هەیە:
١- قصر: کۆشک، تەلار، قەسر.
٢- قصور: کورتی مەبەست لەوەیە کەسێک بەکەموکورتی کار و ئەرکەکەی ئەنجام ئەدات.

ئەی نووری چەمم بێت و ئەمن ڕەهـ گوزەرت بم
ئەم جەژنە کە قوربانە بەقوربانی سەرت بم[1]
شایانی (تحمل) نییە دڵ بێ لەبی ئاڵت......
مەیلێکە فیدای گوشەیی مەیل و نەزەت بم[2]
بێ نووری چەمت نووری نییە نووری چەمانم
قوربانی چەم و ڕێی چەم و خاکی دەرت بم[3]
بۆ دەفعی غەم و غۆصەی دڵ مەکتەبی تۆیە
بمنێرە سەرەو دەفتەری خۆت با نەفەرت بم
میحرابی منە تاقی دوو ئەبرۆی کەوانت
تەقدیری بکە تاکو ئەبەد سەجدە بەرت بم
شادە هەموو کەس لەو چەمەن و ڕەوزەیی حوسنە
بێ مروەتییە گیانە ئەمن دەر بەدەرت بم
تا کەی بەتەمای جیلوەی تۆ (ئەسعەد)ی غەمبار
ئەی نووری دڵم فەرموو بەقوربانی سەرت بم

١٩٣٨

(١) چەم: چاو.
– ڕەهـ گوزەر: چاوەڕوانی سەرە ڕێگا.
– لە نێوان هەردوو قورباندا گوزارەبێژیەکی بەهێز هەیە، خۆی لە ڕەگەزدۆزیدا ئەبینێتەوە، قوربانی یەکەم: جەژنی قوربانەو دووەمیان خۆی بەقوربانی ئەکات... خۆی لە پێناویدا بەخت ئەکات.
ئەم شیعرە بەدەنگی زوڵاڵ و بەسۆزی دەروێش عەبدوڵڵای دەف ژەن لە ساڵانی چلەکانی سەدەی بیستەمدا بەگۆرانی لەگەڵ دەفدا وتراوە.
(٢) گۆشەی مەیل و نەزەر: بەتیلەی چاو تەماشاکردن.
(٣) لە (صدر)ی ئەم بەیتەدا: ١– نووری چەمت: بێ جوانی یار ٢– نووری نییە: شەوق و ئارەزووی نییە ٣– نووری چەمانم: نوور و تیشکی چاوەکانم.
لە (عجز)ی بەیتەکەدا: ١– قوربانی چەم: قوربانی چاوتبم ٢– ڕێی چەم: ئەو ڕێگایەی تۆ بەتیشکی چاوانت ڕووناکی ئەکەیتەوە.



## غەم پەرست

بۆ ئەبێ، تەنیا لەناو ئەم هۆزە من ئاوارە بم
بێ کەس و بێ هاودەم و مەنفوری ناو ئەم شارەبم[1]
عیزەت و حورمەت نەما، بۆیە، نەما خاوەن وەفا
کوا شەرەف، کەس نایەوێ، با ئیکە من بێ کارە بم
سەر زەنشتم بۆ ئەکەن گۆشە نشینی خانەقام
لێمگەڕێ تا مردنم، با حەپسی ناو ئەم غارەبم[2]
عەیب و عارم زۆرە، لا بێ قیمەتە گێتی پەرست
تاکو ماوم، چاکە با بێ سەروەت و سەییارە بم
زۆر شکور ژینم برا شاهانەیە، سەربەست ئەژیم
نەک وەکو پیاوی دەنی بۆ پارە پارە پارەبم[3]
خێوەتی سینەم ڕما ئەستوونەکانی تێک شکا
(إرثي) مەجنونە خەڵاتم؛ واجبە پەتیارەبم[4]
دیارە مردن وا لە بەرما، دەوڵەتیش چڵکی دەسە
ڕازقی عالەم یەکە، بۆ کێ ئەبێ غەمبارەبم[5]
دەستگیرم دینە، ڕێگەم نەقشییە و باکم نییە
دوژمنم هەڵماوە سێتو جووتەکەی سێدارەبم[6]
دەردی دووری یارییە (ئەسعەد) کە بۆتە غەم پەرست
ناعیلاجم، هەر ئەبێ، مەفتونی ژێر ئەم بارەبم[7]

١٩٧٢

(١) مەنفور: مرۆڤی نەفرەت لێکراو، یاخود کەسی بێز لێکراو.
ناوەرۆکی ئەم قەسیدەیەی شاعیر ئاماژەیەکی دەلالی بەهێز و پێز هەیە کە پەردە لەسەر غەم و ئازار و ئاواتەکانی شاعیر هەڵ ئەداتەوە و خواستەکانی ڕابردو ئێستەی بەئایندەوە گرێ ئەدات.
(٢) خانەقا: زاراوەیەکی ئاینی سۆفیگەریە و مەبەست لە شوێن و ماڵی خوایە و ئەو مزگەوتە و شوێنی خواپەرستییە و تایبەتە بەو خواپەرستانەی لەسەر ڕێبازی نەقشبەندین و زاراوەی تەکیە شوێنی ئەو خوا پەرستانەیە کە لەسەر ڕێبازی قادرین.

(٣) دەنی: کەسی دەروون نزم و سووک.

لە نێوان هەرسێ وشەی (پارە)دا ڕەگەزدۆزی وەک هونەرێکی گەورەی شیعری بەکاری هێناوە.

١- پارە: مەبەست لە پوڵە

٢- پارە پارە: پارچە پارچە... یاخود ئەتوانین قووڵتر بیلێین: هەر پارە هەر پارە.

(٤) پەتیارە: بەڕەڵڵاو پەتەری.

لە (صدر)ی بەیتەکەدا جوانی بایسیکی ناسکی تیا ئەبینرێ کە مرۆڤ چێژی مۆسیقایەکی دڵ ڕاکێشەری شیعریی لێ وەر ئەگرێ.

(٥) دەوڵەتیش چڵکی دەسە: ئەمە لە هونەری ڕەوابێژیدا درکە (کنایە)یە و مەبەست لەوەیە: پارە و سامانی دنیا وەک چڵکی دەست وایە وتا سەر بۆ کەس نامێنی و فریای ئایندەی ناکەوێ.

- ڕازقی عالەم: مەبەست لە خوای میهرەبانی تاک و تەنیایە.

(٦) ڕێگەم نەقشییە: مەبەست لە ڕێبازی سوفیگەری نەقشبەندییە و مەولانا خالیدی نەقشبەندی ڕابەرایەتی کرد و لە کوردستاندا وەک تازەکەرەوەی ئەم ڕێبازە سەرپەرشتی کرد و بڵاوی کردەوە... ئەویش پاش ئەوەی سەفەری هیندستانی کرد و لەسەر دەستی شێخ عەبدوڵڵا دەهلەوی مۆڵەتی تەریقەکەی پێبەخشرا...

شاعیر هێندە بڕوای پتەوی بەئایینی پیرۆزی ئیسلام و ڕێبازی نەقشبەندی هەیە... دڵنیایە لەوەی بۆ ئایندەی ئەو دنیای هەڵبژاردووە ڕاسترین و باشترین ئیمانە.

(٧) مەفتون: عاشق و شەیدا، شێت و شەیدا، وێڵ و سەرگەردان.

***



جانا بەسەرت قەستەم ئەمن مائیلی ڕووتم
فەوتاوی فیراقی لەبی شیرین و برۆتم[١]

وەک مورغی قەفەس پەستە دڵم دوور لە دڵی تۆ
بۆ ئەو دەمەیە لەم دەمەدا نەختێ بزووتم[٢]

بیستوتە لە دەم سینە پڕی حەسرەتی یارە
ئەی مەردی خووا توبی خووا بیکەرە جووتم

ئوستادی ئەزەل دەرسی غەمی عەشقی بەمندا
وا بوومەتە پەروانە برا مائیلی سووتم

هێناوییە نەسیم؛ موژدە ئەڵێ: کاتی سەحەر گا
فەرموویە وەرە (ئەسعەد)ە کە مائیلی جووتم[٣]

١٩٤١

---

(١) جانا: گیانە.

- قەستەم: سوێند.

وشەی ڕووتم: ڕەگەزدۆزی تەواوە و دوو واتا ئەبەخشێت:

١- ڕووتم: دەموچاوت.

٢- ڕووتم: تەنیاو بە (مطلق).

(٢) وشەی (مورعنی) بەهەڵە لە بەشی یەکەمی شیعرەکاندا چاپکراوە، چونکە وشەکە (مورغی)یە... واتە وەک مەلی بەندی ناو قەفەس.

لە (عجزی) بەیتەکەشدا وشەی (دەمە) ڕەگەزدۆزییە و لە یەکەمدا ئەو (دەمە) مەبەست هەردەمی یار و خۆشەویستەکەیە و لە دووەمدا ئەو (دەمە) واتە: ئەو کات و سەردەمە.

(٣) نەسیم: شنە (با)ی بەری بەیان.

بەرداو بەرد و غەریبم بڕوانە ڕەنگی زەردم
لێوی ئاڵت شاهیدە بۆ چاوی بازت مردم[١]
مشاری دانی کێ بوو بەفری کوڵمی شەق کردی
ڕەبی خانەی خراپ بێ وا جەرگی کون کون کردم
حەکیمی حازق وتی: سەوزە بەیەزدانی پاک
ماچی خاڵی سەر گۆنات شفایە بۆ گشت دەردم[٢]
بۆ ڕەنگ و دەنگت قوربان شێت و شەیدا و سەحراویم
ماڵی تۆ و دڵ وێران بێ وەک ئابڕوویی بردم
بەتیری غەمزەی بووتان (ئەسعەد) جەرگی زامارە
وەکو تەیری باڵ شکاو بۆیە کە بەرداو بەردم[٣]

١٩٤٠

(١) لە (صدر)ی بەشی یەکەمی شیعرە چاپکراوەکەی شاعیر وشەی (غەریب) لە پێشەوە بوو، بەڵام شاعیر لە دەفتەری دەستخەتی ژمارە (٤)دا جێ گۆڕکێی بەوشەکە کردووە، بەم شێوەیەی ئێستەی.
– بەرداو بەرد: مەبەست لەوەیە، مرۆڤ لەم بەرد بۆ بن ئەو بەرد براوە، واتە جێ بەخۆی ناگرێت و دڵی داناسەکنێ... سا ئەوە لە چیادابێ یاخود شار، لە ئەنجامی خەباتی سیاسی بێ یاخود کاری شۆڕشگێڕانە.
یەکێک لەو دیاردە بەهێزانەی لە شیعرەکانی شاعیردا هەن؛ بەکارهێنانی وشەو زاراوەی کوردی و کەمتر بیستراوە، ئەمە لەوەیە بۆ ڕۆژی وەک ئەمڕۆ کە چەندین فەرهەنگ هەن زۆر سەرنج ڕاکێش نەبێ، بەڵام بۆ ڕۆژگارێکی وەک ساڵی ١٩٤٠ گرنگە و پڕ بایەخ.
(٢) حەکیمی حازق: ئەو پزیشکەی سووتاوی تیمار ئەکات.
(٣) شاعیر دوای ئەوەی ئاڵوگۆڕی بەوشەکانی (صدر)ی بەیتی یەکەم کردووە، جۆرە هونەرێکی وردی سەرنج ڕاکێشەری شیعریی بەکارهێناوە جیا لە شاعیرانی پێش خۆی هونەری ئەمبەر و ئەوبەر یاخود دوا بەسەر (رد العجز الى الصدر)ی لە تەواوی هەموو پارچە شیعرەکەدا بەکارهێناوە واتە وشەی (بەرداو بەرد)ی لە سەرەتای صدری بەیتی یەکەم و سەروای (عجز)ی بەیتی کۆتای بەکارهێناوە، ئەمەش کردنەوە و قفڵدانێکی سەرتاپای پارچە شیعرەکەیە و ئەهێنێت هەڵوێستەیەکی هونەریانەی بەرامبەر بنوێنرێ.



(ئەم پارچە هەڵبەستە نووسراوە و نێرراوە بۆ مامۆستای مێژوونووس و شاعیر (ڕەفیق حیلمی) نەمر کاتێ لە شارەوانی بووە لە بەغدا).

بەرە عەرزم صەبا گیانا لە بۆ دانا تری شارم
کراسی غونچە بدڕێنە بیهێنە بۆنی دڵدارم
سڵاوێ تۆ لە حیلمی کە وەرامێ بێنەوە گورجێ
وەکو گورجی بدە نۆشێ بەسینە و جەرگی بیمارم[١]
بەچاوی نێرگست قەستەم بەبرژانگ و برۆی مەستت
کەوا پەستم بەژان و دەردی دووری تۆ گرفتارم
لە ڕیزەی شارەوانی شاری بەغدا بوویە شابازێ
خوا ئازانە بازێ دە تەوازێ بێتە سەردارم[٢]
بریقەی بەرقی جیلوەت چونکە دوورە بۆ دڵی (ئەسعەد)
لە خانەی مەحوی یا تەنیا نشینی بۆتە ئەتوارم[٣]

(١) شاعیر لە پەراوێزی دەستنووسی دەفتەری ژمارە (٤)دا نووسیویە: (ئەم پارچە هەڵبەستە کاتی خۆی بۆ مامۆستای شاعیر و مێژوونووس- ڕەفیق حیلمی- نێردراوە، لەو کاتەدا لە شارەوانی بووە لە بەغدا).
– گورجێ: بەزووی، بەپەلە.
– گورجی: دەمودەست و دەستبەجێ.
(٢) تەوازێ: دوعای بەخشین و لێبوردنە لە خوای مەزن.
(٣) خانەی: مەبەست لە خانەقای مەحوی نەک ماڵ و خانەی... چونکە لە بەشی یەکەمی شیعرە چاپکراوەکەی شاعیردا لە تەکیەی مەحویدا نووسراو دیارە ئەوێک کە موسڵمانێکی نەقشبەندی بێت، ئەوا بێ دوودڵی: زاراوەی خانەقا لە بری تەکیە بەکار ئەهێنێ ئەم دەستکارییەی شاعیر لە جێگای خۆیدایە.
– بۆتە ئەتوارم: أطوار: مەبەست لە پیشەو خووە.

***

ئەوا نووسیم بەخوێناوی دڵی سەد جارە بیمارم
بەیانی حاڵی داماوان لە دەستی چەرخی غەددارم
گوناهی زۆرە ئەم قەومە، فەلەک وا بوونە فتبۆڵێ؟
بەدەم نووکی شەقی گۆڵانەوە خستوتە سەردارم[1]
بەکوشتاری عەزیزانم نەما ڕەنگین نەکەی ئەرزێ
بەسە تاکەی زەلیلی بەس بڕێژە خوێنی دڵدارم؟
لەناو مێژووی ئەدیبی (غەرقی گوڵ) کردم بەمێژۆیی
پەرێشانی گەلی ئێمە بەدەس بابای عەییارم[2]
ئەتۆ لۆتی لە ڕوومان کەی ئەوەستی توولە گەر بێڵێ
لەناو گێتییە (ئەسعەد) لەگەڵ گەلدا گرفتارم

١٣٦٦ک

(١) ئەو وشانەی شاعیر بەکاریان ئەهێنێ، واتای ئاسان و ڕوون و بێ گرفت بەدەستەوە ئەدەن... ئەوەتا دڵی شاعیر خوێنی لێ ئەتکێ، ڕوو لە پەروەردگار ئەکاو ئەپرسێ، ئاخۆ ئەم نەتەوەی کوردە هێند گوناهی زۆرە تا فەلەک بەو دەردەت بردووە و وەک تۆپ فوتبۆڵێنی پێ ئەکەن.

(٢) مێژوو: (التاریخ) ڕووداوی ڕابردوی کۆن:

– مێژۆیی: دانەوێڵەیەکی وەک نیسک وایە.

– بابای: بابایەکی... کەسێکی بێ ناوونیشان



خەیاڵی خاڵی موشکین و نیگاهی پەرچەمی یارم
ئەبەخشێ دەردی مەجنوونی بەهۆش و گۆشی بێدارم[1]
پەچە لادە وەرە لەیلا ببینە حاڵی مەفتونت
هەراسانە هەموو عالەم لە ئاهو ناڵەو زارم
لە جەوری چەرخی گەردوون و غەم دەردی فیراقی تۆ
ئەبێ هەر چۆڵ پەرستی بێ لەمەولا پیشەو کارم
نییە مەحرەم بەڕازو ماجەرا تا بێ بەیانی کەم
ئەوی شاراوەیە ئێستا لە پەردەی قەلبی بیمارم[2]
ئەدەن فتوای قەتلی من لە حەق بێژی وەکو (منصور)
لەسەر ڕێی حەق دەبا بمرم بەوێنەی شاهی سەردارم[3]
لە ئولفەت؛ کێ ئەڵێ ئینسانە ئەی هەی لە هیچ کەمتر
لە نیسانا عەزیزم خۆم ئەزانم چەند گرفتارم[4]
خوا مەرگی بدە (ئەسعەد) لەناو ئەم وەحشەتا بڕوا
لەگەڵ هەر کەس ئەبم ئانەن ئەبێتە دوشمنی کارم[5]

١٩٤٠

(١) موشکین: ڕەش.

(٢) ماجرا: ماجەرا: ئەوەی ئەبێ و ڕوو ئەدات.

(٣) فتوا: ڕێنماییکردن بۆ ئەنجامدانی کارێک.

– منصور: مەنسور: مەبەست لە مەنسووری هەلاجە سۆفیی خاوەن هەڵوێستی بەناوبانگ کە تا پەل پەلیان کرد، هەر (أنا الحق)ی وت.

(٤) لە عجزی ئەم بەیتەدا ئاماژە بەمانگی نیسان کردووە سا بەم دوو جۆرە لێک ئەدرێتەوە:

١– مەبەستی لە باری تەندروستی خۆی بێت و لەو مانگەی بەهاردا باشتر خوێن ئەجمێ.

٢– ئەکرێ بووترێ: مەبەست لە درۆی مانگی نیسانە کە لەساڵێکدا، خەڵکی بۆ گاڵتەوگەپ لە یەکی نیساندا قسەیەک هەڵبەستن، بەڵام لەوەیە شاعیر مەبەستی ئەوەبێ کە بەردەوام لای خەڵکی ئێمە یەکی نیسانە.

(٥) ئانەن: هەر ئێستا دەمودەست (فوراً).

## ستایشی پەروەردگار

تەریقم خەیلی پیرۆزە، لە مەجنونانی سەییارم
لە دەشتی بێ کەسی، وێڵ و بەدەردی دڵ گرفتارم[1]
بەهای و هۆی دەروێش و بەپانی سرپیشەکەی سۆفی
خەرۆ نابم، لە بەندەی بەندەگانی حەزرەتی یارم[2]
بەعەبدی کەمترینی خۆی قبوڵکا، ئیکە بەسمە
نییە باکم، ببێ جانا، لە تەعن و زەجری ئەغیارم[3]
حەسادەت با، ڕەقیبم، گۆشەگیر و مونزەوی ماوم
دەبا قوڕکا بەسەر، بوو؛ بەشەریکی باری غەمبارم
لە بەحری پیسی گێتی، عالەمێ کەوتۆتە خنکاندن
بەدەستی تۆوە، داماون سەراسەر نەفسی غەدارم
لە نادی مونکیران دوورم، لە مێزی مەلعەنەت بێ بەش
سوپاسی تۆ ئەکەم، یارەب لە خووی بەد خۆ بکەی جارم
بهێنە بای نەسیم، بۆنی (یثرب) بۆ دڵی (ئەسعەد)
بەویوە بەندە ڕۆحم؛ وا لە ژینی ئێرە بێزارم

١٩٧٢/٨/١٥

(١) خەیلی: زۆر، فرە، گەلێک.
– سەییارم: سەرقافلە و کاروان.
(٢) خەرۆ: دەستخەرۆ، فریودان.
(٣) زەجر: دەرکردن و پەرکردن...
– ئەغیار: نەیار، ناحەز.

ئەم قەسیدەیە، بۆ و بەرامەی هەست و نەستی شاعیری لێ بەرز ئەبێتەوە، ئاماژە بەدۆزینەوەی خودی خۆی لەناو خواستەکانیدا ئەکات.

***



بێ نەسیم تووبی خووا بیهێنە بۆنی دولبەرم
ئەی دولبەرم(*)
ئا بەفریاما کەوە مەردی خووا تۆی ڕەهبەرم
تۆی ڕەهبەرم
لوتفی ئەو زاتە لەسەر هەر کەس کەوێتن ئەو کەسە
سا خوا بمکەی بەکەس داماوم و بێ جەوهەرم
بێ جەوهەرم
پێم ببەخشە مردنێ لەو بەر دەرەی پڕ گەوهەر
گەردەکەی؟ ئیکسیری چاوە؛ مەزبەلەی تاجی سەرم
تاجی سەرم
وا لە تەورات و لە ئینجیلا مەدینە باس ئەکا
شوێنی شاهی ئەنبیایە فەخری عالەم سەروەرم
ئەی سەروەرم
بگرە باڵم (یا محمد) من سەگی دەربانی تۆم
ڕوو ڕەشە (ئەسعەد) لە دیوانی خووا بێ ڕەهبەرم
بێ ڕەهبەرم

١٩٧٠

(*) کەڵەکە بوونی ئەزموونی شیعری لای شاعیری هوشیار و دانە بڕاو لە دەوروبەر و ڕۆشنبیری سەردەم، هۆیەکی سەرەکیە بۆ ئەوەی لە بەرهەمە شیعرییەکانیدا داهێنان بێتە کایەوە... ئەم شیعرەش ئەو نیشانەیەی پێوە دیارەو شاعیر پەنا بۆ جۆرێک لە هونەری مستەزاد بردووە... بەڵام بەتازەگەریەکی جیاواز لەوانەی پێشووی... جگە لە بەیتی یەکەم کە لە (صدر و عجزە) کەیدا سەروای دوایی، بەشێوەیەکی شارەزایانە دووبارە کردۆتەوە و لەسەرجەم (عجز)ی بەیتەکانی دیدا پەیڕەوی هەمان بەرجەستەکردنی هونەریی کردووە... وەک: ئەی دولبەرم، تۆی ڕەهبەرم. بێ جەوهەرم، تاجی سەرم، ئەی سەروەرم، بێ ڕەهبەرم.

دەردی دووری تۆیە، شێخم؛ بۆیە سیس و بێ فەڕم
دوور لە ئەربابی مەعانی هاوملی جەمعی کەرم
گەه وەکو بولبول ئەناڵم، بۆ مژینی لێوی گوڵ
گەه وەکو پەروانە کە سووتاوی کوڵمی ئەحمەڕم[١]
قومریی داماوە و، تەوقی وەفایم ها لە مل
یا کەریم و یا کەریم، عاشقی سەودا سەرم[٢]
هود هودی مژدەی نەهێنا تا بەبەلقیسم بگەم
آصفی چی، قەسری چی بێ مورشید و بێ ڕەهبەرم[٣]
کون کونە (ئەسعەد) دڵی دەنگی نەوای لێوەدێ
شەربەتی مەرگم ئەوێ وا عاجز و قوڕ بەسەرم

---

(١) کوڵمی ئەحمەڕ: کوڵمی ئاڵ.
(٢) یا کەریم و یا کەریم: کەریم: ناوی خودای مەزن و میهرەبانە و ئەو (یا)یە، بۆ هاوار و هانا بردنەبەری خودا... باوە ئەوترێ کە قومری باڵندەیەکی ئێسک سووکە و کە ئەخوێنێ ئەڵێ: یا کەریم، یا کەریم... لەبەر ئەوە وەک مەلێکی پیرۆز تەماشا ئەکرێ.
(٣) هود هود: باڵندەی پەپوە سلێمانکە.
– بەلقیس: بەلقیسی شاژن کە چوو بۆ لای حەزرەتی سلێمان و لێوەی فێری حکمەت بێ.
– آصفی: شاعیر لە پەراوێزی ئەم شیعرەیدا بەمجۆرە واتای آصفی لێکداوەتەوە:
آصفی: ئاسەنی جارییەکی زۆر جوان و بەناوبانگ بووە.

***



بەسە دووڕوو مەبە، نەفسی خەبیسم
قەناعەتکە بەیاری هاو جەلیسم
ڕەفیقم عیلمی قورئان و حەدیثە
سوپاسی حەق ئەوانە وا ئەنیسم
هەتا پیشەم وەها بڕوا وەهابێ
ژیانم شاهییە ناچی لە کیسم
ئەکا لۆمەم، بەنادانی بەشی زۆر
لە هەر لابێ بەهەر دوو گوێ ئەبیسم
ببورە لێم، خوا لوتفی بکە پێم
لە تاعەت کز نەبی تەبعی سەلیسم[١]
ڕەئیسی دونیەوی ئاخر زەلیلە
سەگی قاپی محەمەدبم ڕەئیسم[٢]
ئەزانی خەلق وا، بێ بارە (ئەسعەد)
ئەمن ئانی نییە باری نەفیسم[٣]

---

(١) سەلیس: لێرەدا بەواتای ڕوون و ڕەوان و بێ گەرد دێت.
(٢) مەبەست لە ڕەئیسی دونیەوی: خاوەن و حوکم و دەستەلاتدارانی ئەم دنیایە... ئەو وشەی (ئاخر) شەحنەیەکی بەهێز و گەرموگوڕی بەشیعرەکە داوە و ئاخر بەواتای دوایی نایەت بەڵکو مەبەستی (ئیدی)ەو لە هەمووی جوانتر و پڕ واتاتر ئەوەیە: وشەی (ئاخر) هیچ جێگایەکی گومان و دوودڵی بۆ کەس ناهێڵێتەوە هەڵوێستی و ئیمانی شاعیر بەئاینی پیرۆزی ئیسلام و حەزرەتی (محەمەد) د.خ کە پێغەمبەری ئاخر زەمانە، دووپات ئەکاتەوە.
(٣) ئانی: ساتێک.
– نەفیس: طاهر: خاوێن و باشتر و چاکتر.

***

ئەوەن چەوتم، نییە پرسێ لە حاڵم
کە نەفت و بێ کەس و ئاشفتە حاڵم[١]
ئەجەل دەورم ئەدا، مەرگم نزیکە
خوا لوتفی بکە، بێ دەست و باڵم
نەما دەوری سەعادەت، ڕەنجەڕۆبووم
بەخۆڕایی فڕی عەقڵ و کەماڵم
سەراسیمەم وەکو قەیسم ئەپرسی
بەدەس نا ئەهلەوە وێڵ و عەواڵم[٢]
برا کەوتوومە عەسرێک و زەمانێ
لەبەر بێ ئاینی ڕوویی جەماڵم
حەیا و حورمەت لە پیاوان و ژنانیش
نەما (ئەسعەد) وەکو نەی وا ئەناڵم

---

(١) ئەوەن: ئەوەندە
- ئاشفتە: پەشێو و پەرێشان.
(٢) وەکو قەیسم: قەیس: قەیسی کوڕی ملوەحی عامرییە، بەشێت و شەیدای لەیلا ناسراوە و لە پێناوی بەیەکگەیشتنیدا و کە کەسوکاری لەیلا بەوە ڕازی نەبوون بەقەسیی بدەن... قەیس وەک دێوانە کەوتە دەشت و بیابان.
شاعیر ئازارەکانی ژیانی بەوشەی واتا بەخشی تیشکداری کاریگەر دەرئەبڕێ و هێندە لە دەست جەوری نەهات تاڵ و سوێری چێشتووە، شاعیر لەم شیعرەیدا بەهەناسە ساردییەوە سەیری ئایندە ئەکات.

***



ئەشکی حەسرەتناکە، هێناویەوە هەوری خەمم
تیغی دەستی ناحەزە ڕشتوویەتی ئەمڕۆ دەمم[١]
سەد سوپاسی حەق ئەوا عومرم لە نوێ نووسرایەوە
دولبەرم مەستانەیی، مشتێکی دایە ناو دەمم[٢]
شەق ئەبا ئێستە، ڕەقیبم، ئەم هەواڵەی پێبگا
جەژنی دوو جەژنە، بدە ئەی ساقیا جامی جەمم[٣]
تا وەکو گەنج و بەقووەت بووم، شعورێکم نەبوو
ڕوو کەمە قاپی خوا، ئیکە من دوور لە خەمم
ئەم جیهانەو نەفسی بەد، چی مایەوە، نەیکا بەمن
ناحەقی کوا لۆمەکەر دێتو دەکا لۆمەو زەمم[٤]

---

(١) تیغی: چەقۆ... زۆرجار بە بەمووسی ڕیش تاشینش دێت.
دەمم: خوێنم.
(٢) مەستانە: هەر وەک سەرخۆش.
(٣) جامی جەم: جامی جەمشید، بەو جامە ئەوترێت کە وەک ئاوێنەی هەموو دنیای تیا ئەبینرێت و ئەمەش ئەفسانەیەکی کۆنی ئێرانییە، بەوەی هەرکەس ئەو جامەی لابێت، بەتایبەت پاشاکان، بەو واتایە دێت: ئاگای لە هەموو هەست و نەستی دنیایە...
(٤) زەم: قسەی ناڕاستی پاشە ملە.

***

بەدەس نا ئەهلی ئەمڕۆوە، بەغایەت دڵ پەرێشانم
لە بێبار و، بەد ئەخڵاقی نیهایەت پەست و حەیرانم[(١)]
ئەوی زانیم، لەبیرم چوو، سەراسیمەو سەرف گەندە
محەلی تەعن و لۆمەی ناکەس دیهات و شارانم
هەچی هەوڵم لە گێتیدا، هەموو ڕۆیی بەخۆڕایی
لە عیلم و مەعریفەت دوور و خەجاڵەت ماوی پیرانم[(٢)]
(فمن یعمل) نەبوو کارم (ومن یعمل) هەیە بارم
دەسم ناگاتە داوین و کەمەندی شاهی جانانم[(٣)]
ئەرێژم عارەقی نەگبەت، لەبەر فەرمانەی بلحم
بەفریاماکەوە، شاهم، زەلیلی چەرخی دەورانم
ئەوا ئاواتەخوازی شەربەتی مەرگم؛ بدە ساقی
بەجێماوم لەگەڵ جانا، نەخۆشی دەردی هیجرانم
باخەکەم بوو بەدڕک و توترک و گوژاڵک
ڕەقیب بۆتن بەمیوانم، لە جێگەی دۆست و یارانم
هەناسەمدا بەگژتا نەفسی بەدو بەدخو بۆ حەیا چونت
بەسەرچوو خولقی ئینسانی نەما پەیمانی جارانم
هیوادارم لە لوتفی حەق، نەبێ، بێ بەش ببێ (ئەسعەد)
لەبۆ ئال و سەحابەی (مستەفا)یە قۆچی قوربانم[(٤)]

١٩٧٢/٨/١٨

---

(١) بەغایەت: بەبیرو هۆش و هوشیاریەوە.

ئەمە دەری ئەخات: سەرچاوەی هەڵهێنجانی هوشیاری شاعیر یەک لایەنەنییەو ئاسۆی بیری ڕەنگالەیی شاعیر هەمەجۆرە: سیاسی، کۆمەلایەتی، ئاینی، فەلسەفی.

(٢) هەچی: هەرچی پێویستی هونەری شیعری وای کردووە ئەو ڕایە نەخوێنرێتەوە.

(٣) (فمن یعمل) و (ومن یعمل): ئەمە ئاماژەیە بۆ ئایەتی پیرۆزی: (فمن یعمل مثقّال ذرە شرّ یری ومن یعمل مثقّال ذرە خیّر یراە)... هەر کەس بەپێی کاری باشە و چەوتی خۆی لە ڕۆژی دوایی حسابدا لێی ئەپرسنەوە.

(٤) ئال و سەحابە: مەبەست لە نەوەو یاوەرانی پێغەمبەری خۆشەویستمان محەمەد مستەفایە (د.خ).



وەکو دێوانە شێواوم، وەکو پەروانە سووتاوم
لە دووری چاوی جانانە نەما جەرگ و دڵ و ناوم
(سولەیمەن) هەیکەلی تاکو هەبێ شیوەن ئەکاتن (جن)
خەیاڵی (دێوە) ئەڕوانێ سپێنەو بیلبیلەی چاوم[(١)]
عەصا کون بوو سەری هێنایە دەر فەوجێکی مۆرانە
بەلاشەم شادە دوشمن وەکو توولە ئەکا ڕاووم[(٢)]
نەکەی باوەڕ بەکەس (ئەسعەد) لەناو ئەم حیلەبازانە
فڕوفێڵە درۆیە دانراوە بۆ تەڵە و داوم

١٩٥٠

---

(١) سولەیمەن: حەزرەتی سلێمان کە خودای مەزن توانای بەکارهێنانی زمانی هەموو زیندەوەرێکی پێ بەخشی.

(٢) مۆرانە: جانەوەرێکی وردە و لە بەرگ و پۆشاکی کۆندا ئەژی زیانی پێ ئەگەینێت و کون و کونی ئەکات.

- توولە: بێچووە سەگ بەچکە سەگ.

شاعیر دەردە دڵی خۆی لەدەس زەمانەو فرت و فێڵی خەڵکی چەوت و نالەبار دەرئەبڕێ و هێماکان خاوەنی واتان و دەلا لاتی ڕاستگۆیانەی ناخی شاعیر ڕائەگەێنێت.

***

خەجالەتبە، دڵی بەدخو، لە دووری شای ڕەسول ماوم
لە سورمەی ئەرزەکەی بێ بەش، زەلیلیش و مەلول ماوم
بەدەسنوێژ گرتنم، نوری جەماڵم جیلوە ناسێنێ
لەبەر دووری مەدینە، ڕەنگی ئاڵم بوو بەقول ماوم[1]
نەجاتم بێ، بەمردن ڕۆژی جەژن و کاتی شاییمە
لەناو ئەم قەومە، مەنفور و موحەقەر عەینی گوڵ ماوم[2]
نییە جێ بمگرێتە خۆی، نییە شوێنێ کە ڕووی تێکەم
وەکو هایم لە دەشتی بێ کەسی کەوتوومە چۆڵ ماوم[3]
غولامی خادمی دەرگانەکەی تۆم، یا رەسول الله
شەفاعەتکە، لە حەشرا، بووم، بەدوپیس و خەجول ماوم[4]

١٤ی ذی القعده ١٣٩٣

---

(١) جیلوە: پڕشنگ، درەخشان.

– لەبەر دووری مەدینە: مەبەست لە مەرقەدی پێغەمبەری خۆشەویستمان محەمەدە (د.خ).

– قول: مەبەست لە مرۆڤی پێست ڕەشە... شاعیر ئەڵێ: لەبەرئەوەی لە شاری مەدینەو مەرقەدی محەمەد (د.خ) دوورم، ڕەنگی سوور و ئاڵم وەک ڕەنگی قولە ڕەشەکانی لێهاتووە.

(٢) موحەقەر: نەزان و گەوج.

– عەینی: هەروەک.

(٣) لەعجزی ئەم بەیتەدا وشەیەک هەیە بەدووجۆر ئەنووسرێت و ئەخوێنرێتەوە ئەویش (چۆڵ) یاخود (حۆڵ)... ئەگەر بەچۆڵ بخوێنرێتەوە ئەوا وەک ئێستەی وایە... خۆ ئەگەر بەحۆل واتە گێژو وێژ.. ئەوا دێرە شیعرییەکە بەمجۆرەی لێدێت.

وەکو هایم لە دەشتی بێ کەس کەوتووم و حۆل ماوم

(٤) شەفاعەتکە: بۆمان بپارێرەرەوە... تکامان بۆ بکەو لە گوناهمان خۆش بێ.

– لە حەشرا: واتە لە ڕۆژی لێپرسینەوەدا... ڕۆژی قیامەت.

***



**ئاگات لەمن بێ...**

وەرە جانا؛ پەیامهێنەر، ئەمن قوربانی ناوی تۆم
بدە موژدەی دڵ ئارامم، بەفای نامە و سڵاوی تۆم[1]
دەمت بێنە، شفایا بە، لە بۆ زامی دەروونی من
دڵم مەشکێنە، مەیلێکە جنونی چاوەکانی تۆم[2]
بەڕۆژ و شەو، لە دەرگانەی خودا پیشەم
دوعای بەرزی ملی شووشەی گوڵاوی تۆم
بەعیشوە؛ مەمکوژە جانا، وەرە ڕەحمی بەحاڵمکە
دەمێکە وا لەبەندی حەلقەکانی زوڵفی خاوی تۆم
ڕەقیبم تێمەگە، عالەم جێ دەمی پیسە
لە نێچیرانی خاوێنە، ئەمن نێچیری ڕاوی تۆم[3]
کەمەربەستەی ئەدەب (ئەسعەد) ئەوا وەستا لە خزمەتتا
شەهیدی شیری ئەبرۆی مشتومالی تازە ساوای تۆم

١٩٧٢

---

(١) بەفای: بەفیدای.

(٢) جنونی چاوەکانی تۆم: شێتی چاوەکانی تۆم.

(٣) لە صدری ئەم بەیتەدا... شاعیر یاخود ئەو برایەی دەستنووسەکەی نەقل کردووە بۆ خۆی وێرگولێکی لە نێوان وشەی عالەم و جێ دەمی پیسەدا، دانابوو من ئەو وێرگولەم گواستەوە بۆ بەردەمی وشەی عالەم کە خوێندنەوەیەکی وا تا بەخش ئەدات و هەم لەنگەری موسیقای شیعرەکە وا ڕێکترە...

لەم بەیتەدا جگە لە ڕەوانی شیعرەکە، جوانی بایسێکی ناسک و وردی تیا بەکارهێنراوە و مرۆڤ تا زیاتر بیخوێنێتەوە، چێژی خۆشتری لێ وەرئەگرێت.

***

پێم ئەڵێ: غەم؛ تۆ نەمێنی کێ بخۆم
تۆ لەسەر خوانم نەبی من ڕەنجەڕۆم[١]
حەسرەت و داخی کەسی نا تێگەییوو
کەوتە بینم بۆیە وا بێ ڕەنگ و بۆم
دەوری کاری ئێمە ئەمڕۆ تێپەڕی
لێمگەڕێ چەرخی دەنی بێ کاری تۆم
مەرحەبابێ، گۆڕی پڕ خارو جەخار
ترس و لەرزی تۆیە کە بێ گفتوگۆم[٢]
سەر زەمین و بن زەوی بۆ من یەکە
سووکە بارم، بێت و ڕۆژێ زوو بڕۆم
دولبەرم عاجز بووە، دوشمن گەورە
بۆ پزیشکی تەی ئەکەم ئێران و ڕۆم[٣]
بێ کەس و تەنیایە (ئەسعەد) بێ نەوا
غەم بەفریاما کەوە، من تۆ بخۆم[٤]

١٩٧٠/٧/٣

---

(١) شیعر دەرگاکانی خۆی ئەخاتە سەر گازی پشت، بۆ ئەوەی مرۆڤ بەهەموو ئارەزوو و خواستە جیاوازەکانیانەوە شیلەی چێژی لێ وەرگرن. وشەکان بەجۆرێک شوێنی خۆیان پێ ئەسپێردرێت جەستەی تێکست هەم پتەو هەم ئاسان ئەکات.
ئەم قەسیدەیە، ئەو هەلومەرجانەی تیا ئەینێرێت و وا لە مرۆڤی خاوەن سەلیقەی هونەری شیعری ئەکات هەڵوێستە لە ئاستیدا بکات. ئەم قەسیدەیە، ئەو هەلومەرجانەی تیا ئەبینرێت و وا لە مرۆڤی خاوەن سەلیقەی هونەری شیعری ئەکات، هەڵوێستە لە ئاستیدا بکات.
(٢) خار: دڕک و داڵ... زۆرجار بەزەویەکی سەختی ڕەقەنیش ئەوترێ.
– جەخار: داخ و خەفەت و غەم.
(٣) تەی ئەکەم: ئەگەڕێم بەدوایا: بەشوێندا وێڵم و ئەڕۆم.
(٤) شاعیر ئەوەندە شەیدا و عاشقی ڕاستییە و ئەوەتا زۆر جوان و سەرنج ڕاکێشەرانە ئەڵێ: غەم تۆ چی ئەڵێیت؟.
خوایە گەر بووبیت بەمیوانم، خەفەتبارم ئەکەیت؟ نەخێر وانییە... بەڵکو من پێشوازیی لێ ئەکەم و تامەزرۆی خواردنیم.



من کە بینیم ئەی وەتەن خەڵکی ئەسیرە و دڵ بەغەم
بەرگی ژینم لێ فڕێدا جامی نۆشم کردە سەم[١]
ئیختیاری حەپسی و دەردی سەریم ئەمڕۆکە کرد
بۆ کوڕ و کاڵی گەلم تاکو بنۆشن؛ جامی جەم
گەرچی خوێندەوارەکانم لایەقی دارن هەموو
خود پەسەند و خائینن سەیریان ئەکەم ئەچمە عەدەم[٢]
نەو نەمامێکی شەرەف نایەتە بەر بۆ زاڵمان
دەستی پیسی با نەبێ (ئەسعەد) ئەسیر بێت و بەغەم

١٩٤١

---

(١) سەم: ژەهر.
(٢) ئەچمە عەدەم: لێرەدا بەو جەستە دێت: ئەوەندە لە کوڵی خەبات سارد ئەبمەوە، دێمە سەر سفر.
وەک خۆی شاعیر نوسیویە، ئەم شیعرەی ساڵی ١٩٤١ لە بەندیخانەی سلێمانیدا وتووە... لەو کاتەدا شاعیر چاکی چالاکی سیاسی و خەباتی حزبایەتی بۆخۆی هەڵبژاردووە و بەمەش هەڵوێستەکانی پتەو و قووڵتر ئەکاتەوە شیعرەکە بوونی خەبات و خودی خۆی تیا ئەسەلمێنێ و بۆ خۆی و خەڵک و دەوروبەری ئەو سەردەمە ئەبێتە شایەتی ڕۆژگارە تاڵەکەی.

له داخی تۆ فەلەک شەرتە بەکەس جەورو جەفا ناکەم
هەتا ئەمرم بزانە زامی پیسی تۆ دەوا ناکەم[*]
دەمێکە تەبعی دوونی تۆ دەنی گرتۆتە باوەش خۆی
لەگەڵ ئەم ناکەسی دوونە ئەبەد سەیرو سەفا ناکەم[1]
ئەموستیلەی سولەیمەن بێتە دەس ئێمە گزیر دێنێ
بەتەپڵ و وەلوەلەی دوورو درۆ فکری سەما ناکەم[2]
دەمێکە چاوەڕوانم ئەی ئەجەل بێرە سەر چاوم
هەتا تۆ بی میوانم ڕوو لە یاری بێ وەفا ناکەم
بەغەیری تەفرە (ئەسعەد) کەس نەبوو سوێی بدا پێمان
بەحیلەی حیلەچی جانا ئەمن ڕەقس و سەما ناکەم[3]

١٩٣٧

(*) ئەم شیعرە بەر لە دامەزراندنی حزب (کۆمەڵی برایەتی) وتراوە کە شاعیر یەکێکە لە کەسایەتییە سەرەکی و بنچینەییەکانی ئەو حزبە.

(١) تەبعی دوونی: دەروونی سووک و نزم و چاوچنۆک.
- سەیرو سەفا ناکەم: سەیران و ئاهەنگ ناکەم.

(٢) گزیر: دەست و پێوەند و پیاوی ئاغا...
- سەما: سوڕدان- بادان.

(٣) سوێی: شاعیر بۆخۆی لە پەراوێزی دەستنووسی ئەم بەیتەدا نووسیویە: (سوێی: قازاغ)... پێم وایە ئەمە سوێ نییە، کە ژان و ئازار ئەگەیێنێت وەک ئەوەی ئەوترێ: برینەکەم هاتۆتە سوێ... یاخود منداڵەکەی سوێی بووەوە... بۆیە ئەشێت: سوێی بێ کە لەسوو (فائدە) و قازانج ئەگێنێت.
- حیلە: فرت و فێڵ.
- حیلەچی: تەفرە دەر، هەڵخەڵەتێنەر.



بەختی شومم بۆتە بووم و داد و هەم بێدا ئەکەم
وا لە وێرانەی غەما کەوتم سەرم سەودا ئەکەم[1]
چاوەکەم دەریایی سووره ئاگری دڵ لێم گەڕێ
تا غەواسی تێ ئەخەم دانە دوڕێ پەیدا ئەکەم
وێڵە فیکرم، چوو بەدووی مەحبووبەدا تا دێتە دەر
دەس بەشانەی عەمبەینم پەرچەمی هەودا ئەکەم
موشتەری دووچاوی کاڵم باکی ڕیسواییم نییە
ڕوحەکەم دانا، لە بەیعی ئیکە بۆ سەودا ئەکەم
دوای ئەوە مەفتوونی عیشوەی دولبەری بێ وێنەکەم
چی لە ڕەنگی عارضی ئەملۆدەیی بەغدا ئەکەم
تەفرە ناخۆم قەت بەجادەی سەر شەت و قەصر زهور
هەر لە دەشتی وەیسدا سەد دەستە گوڵ پەیدا ئەکەم[2]
تۆ کە شێخی عاشقانی لۆمەیی (ئەسعەد) مەکە
شاو گەداو دەروێش و صۆفی ئێستە کە شەیدا ئەکەم

١٩٣٧

(١) بووم: کوندە پەپوو؛ باڵندەیەکە بەسەر هەر شوێنێکەوە بنیشێتەوە، دووچاری نەهامەتی ئەبێ.
- داد و هەم بێدا ئەکەم: هات و هاوارمە... ئەمە لە کاتی ستەم و بێ دەستەڵاتیی ستەم لێکراودایە.

(٢) شەت: شط: مەبەست لە ڕووباری دیجلەیە کە بەناو شاری بەغدادا ئەڕوات... ئەو ناوچەیەی خەڵکی بۆ حەوانەوە ئێواران لێی دائەنیشن... لێواری ڕووبارەکەیە کە بەکۆڕنیشی ئەبوو نەواسی بەناوبانگە.
- قەسرو زهور: قصرالزهور: ئەو کۆشک و تەلارە بەناوبانگەی ڕۆژی خویی بوو کە ماڵی پاشای عێراق فەیسەڵی دووەم بوو...
- دەشتی وەیس: ئەو دەشتەیە کە لە شاری سلێمانی تاکو نیوەی ساڵانی پەنجای سەدەی بیستەم خەڵکی شار لە ڕۆژانی یەک شەموان و چوار شەموان و هەینی بۆ سەیران و زیارەتی شەخسی وەیس بۆ ئەو دەشتە ئەچوون کە ئەوسا لە قەراغی شار بوو، ئێستە کەوتۆتە ناو جەرگەی شار و نزیک باخی گشتییە.

مەلا عـەزیزی مـەلا خالیـدی مەحویی باوکم دەربارەی وەیسی سلێمـانی بەمـجۆرەم لێ بیسـتووە:
(مەزاری پیرۆزی ئەم وەیسـەی سلێمـانی کە ژنان و خەڵکی شار بەمەبەستی بەدیهـێنانی مرازیان زیارەتی مـەزاری ئەم پیـاوچاکە مـوسڵـمانە کـوردە ئەکەن... ئەمـەش دەمـاودەم بەئێمە گـەیشـتووە)
دەربارەی وەیس کـە گـۆڕ و مـەزاریان لە زۆر شـوێنی کـوردسـتـانی گـەورەدا هەیە، دانیـشـتـوانی ناوچەکـانیـان بەچاوی پیـرۆز و پڕ بـایەخ تەمـاشایان ئەکەن و زۆرکـەس پێـیـان وایە وەیس هێـمـایە بەسەردارو پێشـەوای تیرە و هۆز و لەڕوانگەی پیرۆزی و بوونی کەسایەتی و پێناسەی کوردی هەموو وەیسـەکـانەوە، سـا لە هەر شـوێنێک بن... وەک گـۆڕی ئەو وەیسـەی لەناوچەی بەردەڕەش و سـەید سادق و ناوچەی کرمانشاه هەن... بەبنەچەو ڕەچەڵەکی پیاوە ئاینییەکانی زەردەشتیان ئەبەستنەوە.
دەربارەی وەیس و دەشتی وەیسی سلێمانی کە شاعیر نایگۆڕێتەوە بەشەقامی ئەبو نەواس و قەسری زهوری بەغـدا... ئا ئەم وەیسـە جێ نزرگـەی بەدیهـێنانی ئاواتی عـاشـقـانی پاک و دڵدارانە و چەن پارچە شیعری فۆلکلۆری و میللی لێی هاتۆتەدی وەک.

با بچـینە سـەر وەیس بەتۆبەکـاری
تۆبە لە گـشـتی غـەیزەر دڵداری
بابچینە سەر وەیس، وەیسی خۆمانە
لەوەیس ئەپرسین خـەتای کـامانە

ئەمـەو بەچەندین ئاوازی بەسـۆزەوەوە ئەو شـیـعـرە فـۆلکلۆریانە بەگـۆرانی وتراون... تەنانەت پێ ئەچێت... ئاوازی ئەڵڵا وەیسی هەر پەیوەندی بەپیرۆزی و گەورەی وەیسی پیاو چاکەوە بێ.



بۆ کـەسـاسی عـاشـقـانە شین و واوەیلا ئەکـەم
بیـری لێـقـەومـاوەکـانی حـەزرەتی لەیلا ئەکـەم
بـوومـە پـیـری چۆڵەوانی وارسی دیـوانەکـەم
ڕەم لە یارانی عـەزیز و سـێـبـەری تەنیـا ئەکـەم[١]
هەوری سـووری نەگـبـەتی دەسـتـوورە گـرتوومـە بەر
وا ئەگـرمـێنێ، ئەڵێی ئەم عـالەمـە حـەمـڕا ئەکـەم[٢]
زاڵـمی ڕووڕەش کـە بـینی قـەبری تـاریکی ئەبێ
بۆ جەهەننەم ڕووبەڕوو، ئەو حەلە من(جنة المأوی) ئەکەم[٣]
دڵ کـە مـەربوطە بەشکلی مـەدرەسـەی ڕەسـامـاوە
ئارەزووی کـێـشـانی وێنە و صـورەتی سـەلما ئەکـەم[٤]
شکڵی بسم الله لەسـەر ڕووی دولبـەرم نوسـیـبـوو بۆ
چاوە زاری نەفـسی پیس و چاوی کـوێری سـا ئەکـەم[٥]
بیـسـتـونێ؛ تەی ئەکـەم بۆ گـۆڕەکـەی فـەرهادی کـورد
مـەیلی بۆنی یاسـەمین و نێـرگـز و شـەهلا ئەکـەم[٦]
جـەرگی خـەسـرەو دەرئەهێنێ، ئاهو ناڵەی کـۆهەکـەن
لێی گـەڕێ شـیـرۆ ئەڵێ ئەم زاڵـمـە حـەمـڕا ئەکـەم
پاشی مـردن ڕۆحی (ئەسـعـەد) بولبـول و پەروانەیە
بۆیە مـەشـقی سـووتن و خـونچـەی دەمی سـەلما ئەکـەم

---

(١) ڕەم: سڵ
(٢) حەمڕا ئەکەم: سوور ئەکەم: مەبەست کوشتن و نەهێشتنە.
(٣) جنە المأونێ: بەهەشتی بەرین... ئەو بەهەشتەی جێی داڵدەی خاوەن ئیمانانە.
(٤) سەلما: خاتوو سەلما؛ ناوی ئافرەتە.
(٥) چاوەزار: ئەمـە بریتـییە لە دوعـاو تکاو نزا و پاڕانەوەی پیـاوچاکـان، تاکو مـرۆڤی لە چاوی پیس بپـارێزرێ یاخود هەندێک پێیـان وایە: کووژەکەی شین یان ناڵی ئەسپ لەبەرچاو دابنرێت... چاوپیا هەڵهێنانەکە پووچەڵ ئەکاتەوە.
(٦) بیسـتون: چیـای بێسـتون لە کـرمـانشـاه... کە فەرهاد لەو پێناوەی بەشـیـرین بگات، پێی وترابوو ئەبێت: چیایەکە کون کات و ئاوی لێدەربێت... بەڵام ئەو بەقوڵنگەکەیەوە خەریکی کونکردنی چیای

بیستون بوون، پیرەژنی فەرهاد کوژ هەواڵی کۆچی شیرینی ئەداتێ و ئەویش لەداخا قوڵنگەکە ئەدات بەخۆیداو ئەمرێ.

***



وا سبەینێ ڕۆژی جەژنە دەست بۆسی یار ئەکەم
خۆ بەقوربانی قەدی شمشادو ڕووی دڵدار ئەکەم[1]
نۆشی ماچی دەم بدە فتوای موفتی تو خووا
تا تەوافی غونچەیی باخ و گوڵ و گوڵزار ئەکەم[2]
چاوەکانم قەت لە گریە زەحمەتە ڕزگاری بێ
تا نەبینێ ڕووی ڕۆژی شۆخی لەنجەولار ئەکەم
چاوەڕوانی مانگی چواردەم با لە بورجی بێتە دەر
کۆمەڵی مەستانە دێن و غەم لە دڵ ئاوار ئەکەم
مورشیدم مەجنونە، پیرم حەزرەتی پەروانەیە
چی لە فێس و جبەو عەمامەی دەستارِ ئەکەم[3]
(ئەسعەدە) ئەڕوا غەمی نەختێ بەباسی ناوی تۆ
هەر بمێنێ باغی حوسن و قامەتی دڵدار ئەکەم

١٩٣٩

---

(١) دەست بۆس: دەست ماچکردن.
بۆس: قُبلة: ماچ.
– شمشاد: دارێکی بەنرخی باریک و ڕێک و بەرزە.
قەدی شمشاد: قەدی باریک و ڕێک و بەرز.
(٢) طەوافی: طوافی: هێمایە بۆ لە دەورگەڕانی مەزاری پێغەمبەر «د.خ» لە کەعبە.
(٣) فیس: فێست... جاران لە جیاتی شەبقە و کڵاو لەسەر ئەکرا و ژنانیش فیسی ڕەشیان لەسەر ئەکرد.

بۆ وەرامی پرسیارم، عەرزی میری پیر ئەکەم
هەر بەگوێی گەورەی بەهۆش و خاوەنی تەگبیر ئەکەم[*]
ژار و ژەنگی ئەم زرووفە دەورەیی ئەقتاعییە
وا لەسەر مالّی فەقیرە کۆمەڵێ تەحقیر ئەکەم[١]
ڕۆژی ڕووناکم ئەبێ دەوری نەزانینی نەبێ
دوشمنی ژوور و دەرم ئەو ساتە کە زنجیر ئەکەم
شۆرشی مسنەد ئەکا بێ قیمەتانی خود پەسەند
بۆ نەمانی داگیرییەت عالەمێ تەنویر ئەکەم[٢]
پرسیارم لێ ئەکەی میرم زەکی (ئەسعەد) ئەڵێ:
کار و فەرمانم بەلاشە خۆ لەناو ژیری ئەکەم

(*) شاعیر ئەم شیعرەی لە وەڵامی نامەیەکی مێژوونووسی مەزنی کورد ئەمین زەکی کە لە ١٠/٥/١٩٣٨ بۆ ناردووە وتوویەتی.

(١) زروف: ظروف: بارودۆخ.

– ئەقتاعی: أقطاعي: دەرەبەگ... خاوەن زەویوزاری زۆری کشتوکاڵ.

(٢) مەسنەد– مسند: پاڵپشت. کۆڵەکە...

– داگیریەت: مەبەست داگیرکەری خاکی کوردستانە.

***



داوێنەکانم هەڵ ئەکەم مەردانە چاری دڵ ئەکەم
سەد کەڕەت با ئابڕوم چێ لەشیشەی مل ئەکەم[١]
فکری خەت و خاڵ و ڕوو، هەم قامەتی دڵدارمە
هەر وەکو دێوانە کە خۆ تووشی ئاهوی سڵ ئەکەم[٢]
بابە پەندو لۆمەیی شارم بکەن باکم چییە؟
بوومە جوتی بولبول و تەعلیمی دەرسی گوڵ ئەکەم[٣]
گەه وەکو پەروانە سووتاوم لە دووری کولّمی یار
گەه وەکو بولبول بەنەغمە ئەم چڵ و ئەو چڵ ئەکەم
بێ حەیای و شێتی (ئەسعەد) با نەڵێ گوڵ چیهرەکەم
سەیری خۆی کە بێ پشوو مەستانە چاری دڵ ئەکەم[٤]

١٩٤٨

(١) لە شیشەی مل: ملی وەک شووشە سپی و ناسک.

(٢) ئاهوی سڵ: ئاسکی ڕەم و سڵکەر.

(٣) تەعلیمی دەرسی گوڵ ئەکەم: بەزمانی گوڵ ئەدوێم.

(٤) گوڵ چیهرەکەم:

چیهر: بەروخسار دێت بەڵام واتای بەسەریەکەوە نەقشی گوڵ ئەکەم.

شین و گریەی غوربەت و نالّەی دلّی زارم ئەکەم
ئارەزووی جەمعیەتی ناو حوجرەکەی شارم ئەکەم[1]
وا لە تەکیەی خالیدی تەنیا لە بەغدا مامەوە
فکری مینا گەردن و غونچەی لەبی یارم ئەکەم
مەسئەلەی شەمع و گولّ ئەمرۆ، لێم مەبرسە شێخەکەم
تا دەوایی دەردی دووری و ئێش و ئازارم ئەکەم[2]
باسی شوعلە و مەشعەلەی کولّمی گولّەندامم مەکە؟
تا تیماری زەخمی کۆنی جەرگی بیمارم ئەکەم[3]
پاسەوانی کۆهی لەیلم باکی ڕیسواییم نییە
لالە تەعنی بەد زبان و پیسی ئەغیارم ئەکەم
(حمد للّه) نۆبەرەی باخم نزیکە بێتە بەر
کۆڵی مەینەت دا ئەنێم و شوکری سەردارم ئەکەم[4]
خوایە بۆ مان هەر بمێنێ شاهی کوردانی عەزیز
وا بەلوطفی گەوهەرینی چاری ئازارم ئەکەم

١٩٣٨

---

(١) شاعیر ئەم شیعرەی لە وەڵامی نامەیەکی مەلیکی کوردستان شێخ مەحموودی حەفید نووسیوە، کاتێک لە تەکیەی خالیدییەی بەغدا ئەبێ شیعرەکە لە ڕووی مێژووی سیاسیی کوردیەوە بایەخی خۆی هەیە. - ناو حوجرەکەی شارم: مەبەست لەوەیە... شاعیر ئارەزووی ناو کۆڕ و کۆبوونەوەکانی حوجرەی فەقیان لە خانەقای مەحوی لە سلێمانی ئەکات کە باسیان لە خەباتی کوردایەتی و دامەزراندنی حزبێکی سیاسی کوردی کردووە.

(٢) لەم بەیتەدا باسی مۆم و گولّ کە هەردووکیان هێمایە بۆ چالاکی ڕۆشنبیری و کاری چاکەی کوردایەتی، ئەمە لای شاعیر بڕاوەتەوە و بڕیاری دەست بەکاربوونی خۆی داوە.
بۆیە ئەڵێ: یا شێخ لەم ڕووە هیچ پرسیارێکم لێ مەکە...

(٣) لەم بەیتەدا شاعیر ئاماژە بەو ستایش و پیاڕاپەرموونانەی شێخ مەحمود لە شاعیر ئەکات... شاعیر ئەڵێ: پێویست بەوە ناکات باسی لێهاتوویم بکەیت، چونکە ئەوەی ئەیکەم ئەرکی سەرشانمە و تیمارکردنی زامی برینی میللەتەکەمە.

(٤) شاعیر بەورەیەکی بەرز و بڕوا بەسەرکەوتنی ئایندەی کوردەوە ئەڵێ: وا ئەو باغەی خزمەتی ئەکەم ئومێدم وایە کە دێتە بەر... مەبەست لە دامەزراندنی کۆمەڵی برایەتییە، کە بەڕێنمایی و هاندان و پشتگیرکردنی شێخ مەحموودی حەفید و حەپسە خانی نەقیب هاتە کایەوە... ئا لێرەوە عەشقە سەرمەدییەکەی شاعیر خۆی ئەنوێنێت.



بۆ پەشێوی حالّی خۆمە گریەو زاری ئەکەم
خوێنی جەرگی پڕ زوخاوم ڕۆژ و شەو جاری ئەکەم
تووشی دەردێکم برا دەرمانەکەی قەت ناکرێ
لەم ئەهالی چەوتەدا داوای وەفاداری ئەکەم
(گا) پەرستی شەرتە ناکەم، کاری هیندستانییە
عەقڵی کۆنی بێ دەماغم ئیکە تیماری ئەکەم
تەربیەت بۆ وەحشیان چۆن ئەبێ جائیز نییە
بێ ئەساسە ئیشی کۆنی من، کە کرداری ئەکەم[1]
ڕۆژی ئەوەڵ (ئەسعەدا) تەقدیرە من ئاوارەبم
بۆ گەڵە جانا لە خۆم و یاری بێ باری ئەکەم

١٩٤٣/١٠/١٥

---

(١) شاعیر لە دواڕۆژەکان و کۆتایی تەمەنی کار و چالاکی حزبایەتی و کۆمەڵی برایەتیدا دەنگی گلەیی و گازاندەی لێ بڵند ئەبێتەوە و لە ئەنجامی ئەو خەتاو خیانەتکارییەی لێی ئەکرێت دووچاری ڕەشبینی ئەبێ... ئەوەتا لە (صدر)ی ئەم بەیتەدا زۆر ڕوون و ئاشکرا ئەڵێ: حەیوانی وەحش کە زۆرجار بەخوازە (مجاز) بۆ مرۆڤی چەوت و نالەبار ئەهێنرێتەوە ئەڵێ:
خۆماندوکردن و بەخێوکردن و پەروەردەکردنی وەحش هەرگیز نایەتە ژێر بار و ماڵی و هۆگر نابێت... دیارە لە عجزی بەیتەکەشدا دان بەوەدا ئەنێت، ئەوەی پێشتر کردوویەتی بێ بنچینە بووە... (ذات) خود لەم شیعرەدا بوونی کەسایەتی شاعیر و سیاسی بەڕاستگۆیی ئەنوێنێ و ئەو ڕاستییەش دووپات ئەبێتەوە ئەدەب بەگشتی و شیعر بەتایبەت ئاوێنەیەکە و ڕووداوەکانی ڕۆژی خۆیانی تیا ئەبینرێت.

ئەی بەقوربانی دەمت بم بولبولی هاو دەردەکەم
دڵ سووتاوی، چاو بەئاوی، شۆخی بەرداو بەردەکەم
هەڵبکێشە ئاهی حەسرەت شاهی عاشق هاتەوە
پایزی کوشتەی گوڵ و هێنانی ڕەنگی زەردەکەم
هەڵوەری غونچەی ئەمەل درکی ئەسەف هاتۆتە دەر
ماڵی وێرانم بەسەر چوو عومری گەنجی دەردەکەم[١]
بێنە گەردوش تا نەمردووم ساقییا جامێ شەراب
با خەیاڵی بۆ سەکەم بۆ چاری ئێشی دەردەکەم[٢]
چونکە خۆشیم قەت نەدیوە گیانی شیرینم نەسیم
بیگەێنە داوێنی مەحبووبە تۆزو گەردەکەم
سیس و موغبەر بوو و جودم وا لە دووری کۆیی یار
بوومە دێوانە هەمیشە ڕوو لە دار و بەردەکەم[٣]
عارەقی میحنەت ئەڕێژم کاکە بۆ بەرزی وڵات
کوانێ: (ئەسعەد) کۆ وەبن جوان و عەزیز و مەردەکەم

١٩٤٢

(١) لە (صدر)ی ئەم بەیتەدا و لەو کەف و کوڵ و جۆش و خرۆشی ورە بەرزی و پڕ هیواییەدا وشەی ئەسەف، داخەکەم یاخود جێی داخە هاتووە، گوللەیەکی گڕاوییەو بێ هۆ خۆی نەنواندوە!... ئالێرەوە کە کوڵ و گەرمی تێکۆشانی شاعیر لە تین و بڵند بوونەوە دایە ئا لەم ساتەدا لە سەردەشتی کوردستانی ئێران لەگەڵ شێخ لەتیفی شێخ مەحموودی حەفید سەرقاڵی بەڕێوەبردنی ئیدارەیەکی کوردی بوون... تروسکەی هیوای بەرەو کزی ئەڕوات و هەست بەتێکەولێکەی تەنگەژەکان ئەکات... بۆیە وشەی (داخ)ی ئاوێتەی شیعرەکەی کردووە.

(٢) گەردوش: چەرخی کەچ ڕفتار.

(٣) موغبەر: غوبار: تەپ و تۆزاوی.



ئەی حەکیمی زامی کۆن و تازەکەم
ئەی گوڵی گوڵزارەکەی شانازەکەم
دەردی دڵ تووشم بووە فریاکەوە
چارەسازی چاکی سینەی وازەکەم[١]
شەمعی ڕووتە بوو بەهۆی سووتانم
مەستی عەشقم، لێدە دەنگی سازەکەم
بولبولی ڕۆحم ئەسیری زوڵفتە
گەیوەتە ئەوجی سەما ئاوازەکەم[٢]
هەزار و نۆسەد و حەفتا و پێنجی زانیی
شیوەن و گریانمە بۆ گەلی کوردی بێ نازەکەم[٣]

(١) چاکی سینەی وازەکەم: یەخە داچەقیوو... یاخود سینە کراوە.

(٢) ئەوجی سەما: هەرە بەرزی ئاسمان... زۆرجار بەحەوتەبەقەی ئاسمانیش ناو ئەبرێت.

(٣) ئەم شیعرە ئەگەرچی مێژووی نووسینی لەسەر نییە بەڵام بەپێی ئەوەی لە دوابەیتیدا باسی داخ و خەفەت و شین و زاری ساڵی ١٩٧٥ ئەکات... بەدڵنیاییەوە مەبەستی ئەو شکستە سەختە بوو کە شۆڕشی ئەیلوول ١٩٦١ لە ٦ ئاداری ١٩٧٥دا بەهۆی ڕێکەوتنامەی دووقۆڵی نێوان سەدام حسین و محەمەد ڕەزا شای ئێران... دووچاری بوو... نسکۆیەکی جەرگ بڕ بەسەر میللەتی کورد داهات.
هاوخەمی و هاو ڕازاری شاعیر بۆ نەتەوەی کورد هەڵوێستی ڕاست و ڕەوانی شاعیر بۆ کورد و کوردستان دەرئەخات

***

غەصبی بەعزێکی دەلیلم، بۆ ئەکاتن یارەکەم
نیازی نازی تازەیە یا خۆش ئەکا ئەغیارەکەم[١]
ئەو کە لێم زویرە بەزۆری تێ نەگا وەستانی دڵ
دەر ئەچێ ڕوحم بەگرژی و مۆنیی دڵدارەکەم
باخەوانی بۆیە خۆشە عەشقی لێوە دەس کەوێ
بێ ببینە بولبول و عەتری گوڵ و گوڵزارەکەم
ئێشکی غونچەم نەگرت ئەمشەو نەسیم تاڵانی کرد
دای لە زاری خستیە زاری چاوەکەی بیمارەکەم[٢]
کەی لە جوان و شەوکەتا گوڵ (ئەسعەدا) وەک لەیلمە
بێ حەیایە گەر بوەستێ ڕوو بەڕوویی یارەکەم

١٩٤٠

(١) غەصبی بەعزێکی دەلیلم: واتە: دۆست و یارەکەم بۆچی هەندێک ڕێنمایی و ڕێنیشاندانم لێ زەوت ئەکات... واتاکەی بەسەریەکەوە تەواو نیشان ئەپێکێ.
– نیازی نازی: لە نێوان ئەو دوو وشەیەدا هاو وێنە یاخود لێکچواندنی ناتەواو هەست پێ ئەکرێت.
(٢) جوانی بایسێکی جوان و ناسک و سەرنج ڕاکێشەر لە (صدر)ی بەیتەکەدا هەست پێ ئەکرێت و چێژێکی بەتامی شیعری ئەبەخشێت... ئەوەتا لۆمەی خۆی ئەکات و ئەڵێ: بەهەر هۆیەکەوە بێت نەمتوانی شەو بەدیار خونچەوە ڕۆژ بکەمەوە و تا بەری بەیان بەچاوی خۆم پشکوتنی خونچەکە ببینم، بۆیە شنەی شەماڵ ئەو دیمەنەی بەسەردا تێپەڕی... ئەمە ئاسۆی بیر فراوانی شاعیر دەرئەخات نابێت مرۆڤ ئەو دەرفەتە لە بارەی بۆی ئەرەخسیت لە دەستی بدات.
لە عجزی هەمان بەیتدا هاوێنە و لێکچوونی تەواو لە نێوان هەردوو وشەی (زاری)دا هەیە... بەڵام لەواتادا جیاوازن ١– زار: گریان– زاروشیوەن ٢– زار: دەم.



مەرحەبا ئەی جەژنی عالەم دوشمنی باوانەکەم
ڕۆژی کەیف و شایی خەڵک و شیوەنی چاوانەکەم
بێ نەوا کەوتوینەوە، دیل و پەرێشان و حەزین
هەڵکەنن گۆڕم لە نووکی گردەکەی (سەیوانەکەم)[١]
تاکو دابگرێ غەم و ئاهو پەژارەم ڕووی وڵات
هەر لە بۆ خاکی پەشێو و بێکەسی لاوانەکەم
کوردەیی کاری دەنی داینی بەدەم بێگانەوە
بوو بەهۆی کوشتار و فەوتی قەومی بێ تاوانەکەم
نا بەجابی و بەد خوویی خۆمانە (ئەسعەد) بێ هەوا
گۆشەگیر و قوڕ بەسەر ماوە دڵەی دێوانەکەم

١٩٤٨/٩/١٩

(١) گردی سەیوان: گردێکی بەناوبانگە و پیرۆزە و کەوتۆتە ڕۆژهەڵاتی شاری سلێمانییەوە و گۆڕستانێکی بەرینە و زۆربەی هەرە زۆری تەرمی پیاوانی گەورەو و بەناوبانگی شار لەم گردەدا بەخاک سپێردراوە و درەختێکی تایبەت بەم گردەوە هەیە و ناوی (دار ئەرخەوان) و خەڵکی بەخوێنی شەهیدانیان داناوە و لەپشت ئەم گردەشەوە گردی شەهیدانی شاری سلێمانییە و تا ئێستەش پیرۆزی خۆی پاراستووە.

مەرحەبا ئەی قاتیلی جەرگ و دڵی دێوانەکەم
تۆ ئەوا شەمع و گوڵی من بولبول و پەروانەکەم[1]
چاوی مەستی فیتنە ئەنگێزت نیشانەی لەیلمە
پۆست پۆشی تۆیە من مەجنوونەکەی کێوانەکەم[2]
بوو بەوەسفی شاری ئەرمەن ڕەنگ و ڕووی شیرینی تۆ
خەسرە و ئاسا ئەو خەمە نێو بیلبیلەی چاوانەکەم
من نەژادم کوردە تۆ عارەب بزانە لا ئەدەم
بۆ نیگاهێکت لە نەهج و پەیڕەوی باوانەکەم[3]
کافری دێمە کلێسە، جوولەکەی دێمە کەنیشت
گەر موسوڵمانی عەزیزم، (ئەسعەد)ی دێوانەکەم[4]

١٩٤٤

(١) قاتیل: کوژەر.
لە (عجزی) ئەم بەیتەدا شاعیر پەنای بۆ هونەری پێچەو پەخشی- لف و نشر- بردووە و واتای بەیتەکەی قووڵ کردۆتەوە، ئەوەتا شەمع -مۆم- بەکلیلی جوانی و واتای پەروانە کراوەتەوە و گوڵ و عاشقەکەی بولبولە... مرۆڤ تا لێی وردبێتەوە جوانی لێ هەڵئەهێنجێت.
(٢) فیتنە ئەنگیز: فیتنە نانەوە.
(٣) هەستی نەتەوەیی شاعیر و بڕوای بەبوونی نەتەوەی کورد و خاکی کوردستان و ئایندەیەکی ڕۆشن، لە زۆرینەی شیعرەکانیدا مەشخەڵێکەو بوونی خودی کەسایەتی نەتەوەیی ئەسەلمێنی... شاعیر شانازی بەنەژادی خۆیەوە ئەکات و ئەڵێ: کورد کوردە و هیچ نەتەوەیەکی دی نییە.
(٤) شاعیر وەک هەموو مرۆڤێکی هەست بزوێن و ناسک لە ئەوین و خۆشەویستی دوورنییە، بەڵکو بۆتە خرۆکەیەکی ڕەسەنی ناوخوێنی... لە بەیتی پێشوودا کوردایەتی تۆخی بێ غەشی دوور لە شۆڤینیەت ڕەگەز پەرستی... لەم بەیتەشدا لە عەشقدا تواوەتەوە ئەوەتا ڕوو لە یارەکەی ئەکات و ئەڵێ: گەر فەلەی ئەوا دێمە سەر دینت و ڕوو لە کلێسە ئەکەم و گەر جوولەکەشی ئەوا پەنا بۆ کەنیشت ئەبم... گەر موسڵمانیشی ئەوا دێوانەکەی خۆتم... دیارە شاعیر ئەزانی یارو نازدارەکەی نەفەلەیەو نە جوولەکە... تەنیا ئەو هەڵوێستەی لەبەرئەوە نواندووە تا دڵنیای کات چارەنووسی خۆی و ژیانی بەوەوە گرێداوە و نەک وەک شێخی سەنعان بکات و لە دوا تەمەنی بەساڵاچووی بۆ جوانێک پشت لە ئایینی پیرۆزی ئیسلام و خواپەرستی بکات.



هەر هیوای باشی لە تۆکەم، عەینی خەیاڵی خاو ئەکەم
من نەخۆش و دڵ پەشێوی، کوردی لێقەوماوەکەم[1]
کەوتەوە بەند و زەلیلی ئەم گەلەی داماوەکەم
ناوی ئێمەش هاتە گۆڕێ وەک بەرەی ماو ماوەکەم[2]
گەه بەدەس تورکان و ڕوس و گەه بەدەس فورس و عەرەب
کۆچە کۆچە دەربەدەر بوو، لاوی دڵ سوباتەکەم[3]
لۆمەیی بێگانە ناکەم، هەرچی ئەیکا حەقیەتی
کاتی ئازادی نزیکە، ڕاپەڕە ئەی چاوەکەم

(١) عەینی: هەر وەک.
(٢) بەرەی ماوماو: مەبەست لەو بەرەیەیە کە ماوتسی تۆنگ سەرکردایەتی ئەکرد و سەرکردایەتی شۆڕشی چینی کرد تا ساڵی ١٩٤٩ سەرکەرتنی بەدیهێنا و کۆماری چینی میللی دامەزراند و لە دنیای سیاسەت و ڕۆشنبیریدا ناسراوە بەخاوەنی شۆڕشی نوێی ڕۆشنبیری... ماوەیەکی زۆر بەتایبەت لە ساڵانی شەستەکانی سەدەی بیستەوە بیروڕای ماوتسی تونع ناوبانگی دەرکردبوو، وە بەدنیادا بڵاوببووەوە.
(٣) هەستی نەتەوەیی شاعیر لەم بەیتەدا بەڕوونی دیارەو باس لە داگیرکردنی خاکی کوردستانی گەورە و دابەشکردنی لە نێوان تورک و ڕوس و فارس و عەرەبدا ئەکات و دڵی بەدەربەدەربوونی لاوانی خەباتگێڕ و کۆڵنەدەر و بەئارامی کورد ئەسووتێ... لەبەرئەوەی مێژووی دانانی شیعرەکە نەنووسراوە، بەڵام دوورنییە کاتی دەربەدەری خۆی و شێخ لەتیفی شێخ مەحموودی حەفید نەبێ کە ساڵی ١٩٤٢ بەرەو سەردەشتی کوردستانی ئێران چوون و هەر لەوێش سەقامگیر بوون... شیعرەکە بۆی نامۆیی و دەربەدەری لێ دێت.

***

بێ کەس و بێ هاودەم و تەنیاو لێ قەوماوەکەم
وا لەناو هۆزێکی بلّح و بۆگەن و فەوتاوەکەم(*)
یەک کوژ و بێ قیمەت و خاوەن دەم و خاین پەرست
خادمی نەفسی خەبیس و جاهل و داماوەکەم(۱)
لۆمەیی بێگانە ناکەم هەرچی ئەیکا هەقیەتی
سەرزەنشتی بێ شعوری کۆمەڵی بەدناو کەم
تۆ بلّێی رۆژێ ببێ ئەسعەد بەئاواتی بگا
تا بژی گشتی بەباشی لاوی دڵ سووتاوەکەم

(*) ئەمە قەسیدەیەکی درێژبوو، بەدەستنووسی شاعیر لە دەفتەری ژمارە سێدا نووسرابوو، ئەوەندە لەلایەن شاعیرەوە دەستکاری کرابوو، هێڵی بەسەر داهێنرابوو، تەنیا ئەو چەند بەیتەم بۆ ساغکرایەوە.

(۱) خاوەن دەم: ئەمە رەگەزدۆزی تەواوە و دوو واتا ئەبەخشێت و هەردوو واتاکە لەگەڵ بەیتەکەو پارچە شیعرەکەدا گونجاو و تەبایە.

أ- خاوەن دەم: واتە: هەر قسەیان هەیە و دەم هەراشن و کردەوەیان کەمە.

ب- خاوەن دەم: بەخوێنرێژ... یاخود خاوەنی مێژوویەکی خوێنرشتن و دوژمنکارین.

بەڵام ئەوەی زیاتر پەسندە و خزمایەتی لەگەڵ بەیت و پارچەکەدا هەیە... واتای (أ)ە.

***



بێکەس و بێ هاودەم و تەنیاو لێ قەوماوەکەم
وا لەناو تیپێکی بلّح و بۆگەن و فەوتاوەکەم(۱)
لۆمەیی بێگانە ناکەم هەرچی ئەی کا حەقیەتی
سەر زەنشتی بێ شعوری کۆمەڵی بەد ناوەکەم
جرتە بۆزی (هێن و هێن) و مل وڕی دوو هینەکە
(با)یی چی (بارانی) چی هیچی نەدیوە چاوەکەم(۲)
خۆ تکا شەرم و حەیا قەترەی لە رووماناا نەما
دومەڵەک سا لێدە دوشمن جارێ دە بەدناوەکەم(۳)
وا بەدەم گریانەوە حەسرەت ئەخۆم بێ فائیدە
بوو بەسیل ئەو حەسرەتە فەوتاوە جیسم و ناوەکەم(٤)
حاڵی (ئەسعەد) زۆر پەرێشانە بەدەس چەرخی غەریب
ئەنجن ئەنجن بوو بەجارێ جەرگی پڕ خوێناوەکەم

١٩٦٨/٥/٤

(۱) هەندێک بەیت و دێری پارچە شیعری پێشوو لێرەشدا دووبارە بۆتەوە، بەڵام لەبەرئەوەی چەند بەیت و دێری نوێی تیابوو بەڕاست زانرا پێشکەشکرێن.

(۲) ئەم (هێن و هێن) و (دوو هینە) کە، درکە- کنیایە-یە و مەبەست لە چوار کەسە. بەڵام ناویان نەهاتووە.

(۳) دومەڵەک: دونبوگ- دنبەگ.

(٤) سیل: نەخۆشی... نەخۆشی دیقکردن.

شاعیر بەو پاش و پێشەی هەردوو وشەی سیل و حەسرەتە، جوانکاریەکی ناسکی بەشیعرەکە بەخشیوە و کاتێک حەسرەت ئەبێتە دیق و سیل... دوو قۆناغی سەرنج ڕاکێشەری ژیانی مرۆڤ دەرئەخات و مەعریفیەکی سانا ئەسەلمێنێت.

چاوەکەم بولبول، ئەوا من بیری حاڵی لێوەکەم
ئارەزووی غونچەی دەم و دوو کوڵمی عەینی سێوەکەم
با تکانی عارەقی گوڵ تۆش و من بێ بەهرە بوو
شیوەن و ناڵەت بکە تا ئەچییە شکڵی دێوەکەم[1]
حاڵەکەم هێندە پەشێوە وەختە دڵ بتوێتەوە
بۆ کەساسی خۆم و تۆ مەجنونی دەشت و کێوەکەم
بۆی کزەی جەرگم پەشێوی خستە نێو یار و دیار
حەفلەیە بەزمە سەما بریانییە بۆ شێوەکەم
بەس دڵم بشکێنە سا توبی خوا ئەی ماه ڕوو
نەختێ کوڵمت دەربخە مەیلی شەرابی سێوەکەم[2]
ئاوی ژەنگاری دەمی بازاڕی هەنگوینی شکان
نرخی چی بێ موشتەری من ڕاوەکەی بێ مێوەکەم
ئەی ڕەقیبی سەگ، گوناهی چی هەیە (ئەسعەد) بڵێ:
هەر بەمەندە بوومە کافر باسی ماچی لێوەکەم؟

١٩٣٧

(١) شکڵی: شێوەی، بچمی.

(٢) لە بەشی یەکەمی شیعرە چاپکراوەکەیدا ماهڕ و نووسرابوو، بۆیە وا بەباش زانرا بە: ماه ڕوو بنووسرێت واتە: شێوەت لە شێوەی مانگ ئەچێ و تریفەئەدا.



لە کونجی بێ کەسیدا تاک و تەنیا وا لە غارێکم
پەرێشانم کەساس و غەم بەباری دووری یارێکم[1]
لە بۆ دنیا گرفتارم بەهیچ نەوعێ بەهیچ نابم
دەمێ ڕیسوایی شاران و دەمێ کوشتەی عەیارێکم
لە بەغدادا لە بۆ ئەرزێ زەیستانی زستانم
لەبن لێفەی پەتۆدا کەفتەکار و لێو بەبارێکم[2]
سبەی خاکم بەسەر دەستم بەدامانی کەسێ ناگا
بەڵا ئەمڕۆ بەڵا لێمدا ڕەدووی چاوی خومارێکم
بەعیشوەلا ملی دەرخست و ڕەنگم بوو بەڕەنگی بەی
لە باجی لێوەکەی ئاڵی هیوای بۆ سەو کەنارێکم[3]
بریقەی بەرقی سینەی دولبەرم هات و خوا حافیز
نەکەن لۆمەم لە تۆقانن بەشی سووتانی جارێکم[4]
وەکو بولبول لەسەر چڵ نۆبەچی گوڵ بووم ڕەقیبی گول
وتی: (ئەسعەد) لە چڵ لادە ئەمن جەلادی شارێکم

١٩٦٩

(١) لە غارێکم: لە ئەشکەوتێکدام شاعیر لە پەراوێزی ئەم شیعرەیدا نووسیویە: ئەم شیعرەم لە ئوتێل سیروان لە بەغدا وتووە... دیارە ئوتیلەکەی بەئەشکەوت داناوە، چونکە یەکێکە لە ئوتیلە میللییەکان.

(٢) زەیستان: ئافرەت کە منداڵی ئەبێ بۆ ماوەی چل ڕۆژ پێویستی بەحەوانەوە هەیە و زۆرجار ئافرەت بۆ ماوەی چەند ڕۆژێک لەناو جێگا و پێخەفدا ئەبێ... شاعیر لە چاوەڕوانی ئەوەی بەڕەسمی زەوی پێبدرێت ماوەیەکی زۆر لەو ئوتێلەدا ماوەتەوە و ئەمەش تەشەرە بۆ ئەو حاڵەت و بارودۆخە.

(٣) بەعیشوە: بەناز.

– بەی: بەهێ... کە ئەڵێ ڕەنگم بوو بەڕەنگی بەی واتە ڕەنگم وەک ڕەنگی بەهێ زەرد هەڵگەڕا.

(٤) لەم بەیتەدا جوانکاری و جوانی بایس لەواتا و هۆنینەوەی شیعرەکەدا هەست پێ ئەکرێت و دیارە تەمەنی ڕێگای نادات جارێکی دی دووچاری نەهامەتی بێت و بەرگە ناگرێت.

وەکو مرواری فرمێسکم بەڕوودا جارییە دایم
هەناسەی سینەیی ڕێشم بلێسەی نازییە دایم[١]
لەتێ جەرگم بەدەم گریانەوە دەردێ جەواهیری
توجاریکم مەتاعم گەوهەر و مرواریییە دایم[٢]
لە بازاڕی موحببەت شەرحی ئەحواڵم لە چاپی دەن
بزانن کێ وەکو من کارو پیشەی زارییە دایم
لەبەر جەهلی گەلم کڕیاری شیعرم نادرە ئەمڕۆ
سەرەف گەندە کە ماوم عیللەتی بێ عارییە دایم[٣]
ڕەفیقی عارە بێ عاری نییە (ئەسعەد) کە تەنیایە
تەماشا بولبول ئاسا پیشەکەم غەمبارییە دایم[٤]

١٩٦٦

---

(١) ئەم شیعرەی شاعیر دوو سەروای هەیە:

أ- سەروایەکی هەمیشەیی دووباتبووەوە کە (دایم)ە.

ب- سەروای عجزی بەیتەکان (آرییە)... ئەم جۆرە هونەرە لە شیعرەدا زۆرجار شاعیر ماندوو ئەکات بەڵام لای شاعیر (ئەسعەد مەحوی) کارێکی ئاساییە و ڕەوان ئاسان هاتووە.

- جارییە: مەبەست لەوەیە فرمێسک بەهەمیشەیی ئەڕێژیت.

- نارییە: ئاگرینە.

(٢) تو جارێکم: بازرگانیکم

- مەتاعم: شتومەک- کاڵ.

(٣) سەرەف گەندە کەماوم: من کە زیادەیەکی گەندەڵ و بێ کەڵک ماوم.

- بێ عاری: بێ چاوڕوو، بێ شەرم، چەقاوەسوو.

(٤) لە نێوان عار و بێ عار: ڕەگەزدۆزی ناتەواو هەیە.

یەکەم: عار: ڕووت و قووت و تەنیا.

دووەم بێ عاری: بێچاوڕوویی.

بەپێی مێژووی لە دایکبوونی شیعرەکە و بارودۆخی ئەوسای کۆمەڵگای سلێمانی شیعرەکە مەغزای سیاسی هەیە.

***



دوور لە زوهد و تاعەتم، نۆشیم عەزابێکی ئەلیم
کەس نەبوو بمکاتە ئەهل و پێمبدا خولقی حەلیم
خوێندەواری و گەورەیی، لێی نابڕی (إرث) و بەشی
ڕۆڵەیی دژیی، نەبێ لایق نییە، بێژی وەلیم[١]
عیلمی باپیرانمە، وەک ڕۆژی بێ هەور و هەڵا
سوودی بۆ من کوا براله، نیمە علمێکی سەلیم
گاڵتە بازارە ئەدەب، ڕووخاوە، وەزن و قافیە
کوانی شیعری (بێ دڵ)و(مەحوی) نەما دەوری (کەلیم)[٢]
ئەو کەسە خۆ هەڵئەکێشێ، وایە باب و جەددەوە
ڕێوییەکە، بێ حەیا، هاوار ئەکا شێری عەلیم[٣]
پرسیاری لێ ئەکەم ڕوو ڕەش وەها (ئەسعەد) ئەڵێ:
هەر لەبەر بێ نوێژییە، ئێستاکە دێز و ڕوو قەلیم[٤]

١٩٧١

---

(١) وەلی: پیاو چاکان... خوا ناس و سەر ڕاست.

(٢) بێ دڵ: شاعیرێکی ناسراوی فارسسە.

- کەلیم: مەبەست لە کەلیمی هەمەدانییە و شاعیری پایە بەرزی فارسییە و شیعرەکانی لەسەر سەبکی هندی داڕشتووە... شارەزایان پێیان وایە، (مەحوی)ی شاعیری کوردیش لە ئاست ئەو شاعیرە لێهاتووانەدایە کە پابەندی بەکارهێنانی هونەری شیعری کلاسیکین و کێش و قافیەی شیعر گرنگە و پێویستە پەیڕەوی لێ بکرێت.

بەپێی مێژووی دانانی شیعرەکە... شاعیر گلەیی لە ڕۆژگارەکە ئەکات کە چۆن چەند گەنجێک پەیدابوون و بەناوی شیعری نوێی و نوێخوازییەوە پشتیان لە کێش و سەروا و هونەری شیعری کلاسیکی کردووە و گرنگ و بایەخی جوانی و چێژ و وەستا کاری هونەری شیعریان فەرامۆش کردووە.

(٣) شیری عەلی: شێری ئیمامی عەلییە کە مەبەست ئازایەتی و چاونەترسی و نەفسیەت بەرزیە.

(٤) ڕوو قەلیم: واتە وەک قەلەڕەش ڕووم ڕەشە.

***

## توانجی ناکەس بەچە

ماری شێخ هۆمەر، یەکێ بوو، ئێستا عالەم مارە لێم
کوا کەسێ بێ لابدا، ناکە بەچەی ئەم شارە لێم[1]
ماری ئەمڕۆ، بێ ڕەزایە، بێ ئیجازەی مورشیدە
شێخ ئەترسێ، بیگرێ، بۆیە وا غەمبارە لێم
زۆر شوکر موحتاجی کەس نیم و کەسیشم لانییە
ناکەسی زۆر و زەبەندە، پڕ بەئێرە باری لێم
خۆم نەبوومە کەس، هەتا باسی کەسێکت بۆ بکەم
چەن کەساسم، خزم و خوێشانیش هەموو بەدکارە لێم
کووڕی کرد، خەم پشتم و شییکردەوە چەرخی دەنی
بێ دەوایی دەردی پیری، بار و هەم سەربارە لێم
چاو کز و بێ هێز و لەرزی و پەریشان و حەزین
دەمدرێژی خان و خانم، عەینی کوورەی (نارە) لێم
تێر بخۆ ئەی نەفسی بەد، نەختێ قەناعەتکە وەرە
سەبری (ئەسعەد) ئەوا داواکەری سەردارە لێم

١٩٧٢/٥/٦

---

(١) مارەکەی شێخ هۆمەر: سەرگوزەشتەی چیرۆکێکی کوردەواری و پەندێکی مەزنی باوانمانە... شێخ هۆمەر یاخود هۆمەرە کوێر پیاوێکی بەساڵاچووی دەروون بەرز و خاوەن بەزیی بووە... ڕۆژێک خۆی و بێڵەکەی (پێمەڕە) بەناو باخچەکەیدا ئەگەڕێ و پوشوو پەڵاش و دڕک کۆدەکاتەوە و ئاگری تێبەر ئەدات و ئەیسووتێنێ، لە یەکێ لەو کۆمەڵە پوشوو پەڵاشەی ئاگری پێوە ناوە. مارێکی تیا ئەبێت و مارە لە ناوەڕاستی پوشەکەدا ئەبێ و دەرفەتی خۆ ڕزگارکردنی نابێ و لەتاو تین و گڕی ئاگرەکە لەسەر کلک بەرز ئەبێتەوە و داوا لە شێخ هۆمەر ئەکات لە سووتاندن ڕزگاری کات.
شێخ هۆمەر ئەڵێ: ئاخر چۆن ڕزگارت کەم؟.
مارە بەپەلە ئەڵێ: بێڵەکەی دەستت درێژکە و منیش بەهۆی دارەکەیەوە ئەپەڕمەوە ئەوبەر.
شێخ هۆمەر بەقسەی مارەکە ئەکات و بێڵەکەی بۆ درێژ ئەکات و مارە بەسەریدا ئەپەڕێتەوە تا ئەگاتە لای شێخ هۆمەر و بەرە، ملی شێخ هۆمەر ئەڕوات لێی ئەئاڵێ...



شێخ هۆمەر ئەڵێ: مارەکە؛ ئەوە چی ئەکەیت، خۆ من چاکەم لەگەڵ کردی و لە سووتاندن ڕزگارم کردی کەچی پاداشتی ئەو چاکەیەم لە ملم ئەئاڵێیت؟! ئەمە پەندێکی مەزنی باوانمانە کە مرۆڤی دڵ و دەروون پاک نابێت بەقسەی لووسی ناحەز و نەیاری هەڵبخەڵەتێت دەنا وەک مارەکەی شێخ هۆمەری لێ بەسەر دێت.
بەپێی ڕۆژی لە دایکبوونی ئەم شیعرە کە ١٩٧٢/٥/٦ و شاعیر لەو ساڵانەدا تاڵ و سوێراوی خەفەتی بەگەرروودا چووە و لەتاو دۆخی میللەتی کورد و کەسانی تازە پیاکەوتە هەر خەفەت و پەژارەی خواردووە... سەرتاپای شیعر پڕە لەوێنەی ئازارەکانی ژیانی شاعیر.

***

ئەڕۆم ئەمڕۆ، ئەوا گیانە لەلاتان[*]
لە دڵتانا بکەن، یادی براتان
سەفەرمە سەد شوکر بۆ ڕێی حجازە
بەئاواتم گەیی؛ ڕۆحم فیداتان
خووا خۆشبە، لە مردووم و لە زیندووم
نەبا لادەن لە ڕێی عەهد و وەفاتان[١]
سەڵاتی حەق، لەسەر تۆ بێ محەمەد
نەما ژینم، کەرەمکە پێم شفاتان[٢]
غوڵام و خادمی ئالو سەحابەم
شەفاعەتکە، لە بووم ئێوە و خوداتان[٣]

١٢ی ذی القعدە ١٣٩٤

---

(*) ئەم پارچە شیعرە لەسەر شێوەی شیعرە بەناوبانگەکەی مستەفا بەگی کوردی هونراوەتەوە کە ئەڵێ:

ڕەفیقان من ئەوا ڕۆیم لەلاتان

(١) عەهد: عهد: پەیمان و گفت دان.

(٢) کەرەمکە: پێم ببەخشە.

– شفاتان: چارەسەری دەرد و بەڵا.

(٣) غوڵام و خادم: بەردەست و خزمەتگوزار.

– ئال و سەحابە: نەوەی پێغەمبەر (د.خ) لەگەڵ یارانی محەمەد (د.خ) مەبەستە.

***



ئەزانن کامەیە (نووری بادە): کۆمەڵی یاران؟
ئەوەی نۆشی (غەزالی) کا (حەسەن) و پیرەکەی جاران[١]
بەسەرهاتی (جونەید) و (بیری) سافی بێن تەماشاکەن
ئەرێژێنێ بەسەریا خووا عەتری وەکو باران[٢]
نییە بادەی وەلیی، وێنەی ئەوەی عاقڵ ئەکا مەجنون
قیاسی قەت لەیەک ناکا، ئەبەد هیچ عالمی شاران[٣]
شەبیهی جەننەت و دۆزەخ، نییە بیکا لە گێتیدا
دەنا کەس بۆ بەخۆرایی ئەبێنن مەستی بەدکاران
ئەوی مەستی حەقیقی بێ لە دوولا مەردی مەیدانە
خووا، بێ بەش نەکەی (ئەسعەد) لەوەی پێبوونەتە پیران

١٩٧٢/٢١/٣١

---

(١) نووری بادە: پێم وایە شاعیر مەبەستی ناوەڕۆکی شیعرە بەناوبانگەی (مەحوی) بێت کە ئەڵێ:

بەنووری بادە کەشفی زوڵمەتی تەقوانەکەم چیبکەم
بەشەمعێکی وەها چاری شەوێکی وانەکەم چیبکەم

(نووری بادە) بەهەردوو واتاکەی: بەرەکەتی شەڕابی ئاڵ یاخود ڕەنگ و ڕووناکی ئاڵی بادە، هەر لە ڕوانگەی خواپەرستی و سۆفیگەریەوە شاعیر لێی دوواوە.

– غەزالی: ئیمامی غەزالی خوالێخۆشبێ سۆفیەکی مەزنەو ساڵی ١١١١ز. لە نزیک شاری تووس (طوس) لە خوراسان هاتۆتە دنیا، ئەم مرۆڤە مەزنە زانستە ئایینیەکانی فەقهو، فەلسەفە و زمانی بەقووڵی خوێندووە و بەسەر کەوتووی تەواوی کردوون... هەر لە هەمان کاتدا ڕووی لە دنیای سۆفیگەری کردووە و چەند بەرهەمی لەو بوارەدا ئەنجامداوە و لەسەر ڕێبازەکەی بەردەوام بوو، و دوایی تەمەنی لە شاری تووس بەسەربردووە لەوێش وەفاتی کردووە.

– حسین: حەزرەتی حسێنی دووەم کوڕی ئیمامی عەلییە خوالێیان ڕازی بێ و کچەزای پێغەمبەر محەمەد مستەفایە (د.خ)... هەتا خەلافەتی یەزید لە شاری مەدینە (یثرب) ژیاوە و دژی حوکمی یەزید وەستاوەتەوە، ئەنجام دۆست و لایەنگیرانی بۆ کۆفە بانگیان کردووە و لە شەڕێکدا لەلایەن سوپای ئەمەوییەوە لە شاری کەربەلا بەشێوەیەکی تراژیدایی لە لە ١٠ی محەرەمی ساڵی ٦١ی کۆچی بەرامبەر ١٠ی تشرینی یەکەمی ساڵی ٦٨٠ز شەهید ئەکرێ، مەبەست لەواتای عجزی ئەم بەیتە، ئەوەیە: هەر کەس خۆی بەبیرو هەڵوێستی ئیمامی غەزالی و حەزرەتی حسین و یاوەرانیان گوش بکات... ئا ئەوە لەواتای نووری بادە ئەگات چییە؟.

(٢) جونەید: شێخ جونەیدی بەغدادی سۆفیەکی مەزن و گەورەی سەردەمی خۆی بووە و سەرکردایەتی ڕێبازی سۆفیگەری کردووە و سێ جار بەپێ زیارەتی ماڵی خواو حەجی کردووە... ئەم زانا پایە بەرزە لە بەغدا لە دایک بووە و هەر لەوێش وەفاتی کردووە.

- بیسری: بەسری: بەصری: بصری: مەبەست لە شێخ حەسەنی بەسری، زانای مەزن و سۆفی بەناوبانگی ئیسلامە... ساڵی ٦٤٢ کۆچی لە شاری مەدینەی منەوەرە لە دایک بووە و قۆناغەکانی خوێندنی ئاینی تەواوکردووە و لە بابەتی حوکمی شەرع و وەعز و حەدیسدا شارەزایەکی باش بووە و سۆفیەکی بەناوبانگی سەردەمەکەی خۆی بووە و ساڵی ٧٢٨ کۆچی لە شاری بەسرە وەفاتی کردووە.

(٣) مەجنون: لێرەدا مەبەست دێوانەیە... شێتی ئاین و خواپەرستی.

***



چەرخی بەد چیت نەکــــرد، دایم، بەهۆزی کـــــوردان
ناوونیـــشـــانت بە (با)داون لەســەر ڕووی جـیـــهـــان[١]
بەش بەشت کــردووینەوە، بۆ مـیللەت و قــەومی عـەجـیب
وەک (عروس)و(عارەب)و(فورس)و(شیمالی تورکەکان)[٢]
بوینە (گـــۆ)ی تەشـــەڕوع وا کـــەوتوینە دەس نادانەوە
هەم وەکــو فــتــبــۆڵ بەدەم نووکی شـەقـینی گـۆڵەکـان[٣]
واحــیـــدێکی بێ مــەقـــیــسین و قــیـــاســێکی نەزۆک
فــاعــیلی بێ عــامل و مــەعــمـولی دەستی دێوەکــان[٤]
بەندەو و خـــزمـــەتگوزاری تۆیە (ئەســـعـــەد) ئەی برا
(هایم) ئاسا، بۆیە کـە، کـەوتووینە شـاخ و کـێـوەکـان[٥]

١٩٤٢ سەردەشت

(١) بەد: ناپەسەند.
- دایم: هەمیشە.
شاعیر گلەیی لە چەرخی بەد ڕفتار ئەکات چۆن هەمیشە دژی کوردە و ناوونیشانی بە (با) داو نەیهێشتووە.
(٢) عروس: مەبەست ڕوسیایە کە بەشێکی کورد و خاکی کوردستانی زەوتکردووە.
(٣) گۆ: بەئاخافتن دێ، گفتوگۆ... دەمم گۆ ناکات
- تەشەروع: مەبەست دەستپێکردنە...
(٤) واحدێکی: کەسێکی: تەنیا یەکێ.
- بێ مەقیس: بێ پێوانە.
- قیاس: پێوانە، ئەندازە.
- فاعیلی: بکەر... ئەوەی کارەکە ئەکات.
لەو بەیتەدا ئاماژە بەوەکراوە تەنیا میللەتی کورد بەهیچ پێوانەیەک مامەڵەی لەگەڵ نەکراوە مەگەر پێوانەیەکی نەزۆک نەبێ...
(٥) هایم: بەتەواوی بۆم ساغ نەبووەوە، بەڵام پێم وایە لە (ها)وە هاتووە ها بگر، هانێ... ها... واتا: ئێمە هەر هانیمانەو بێ ئەوەی هۆیەکەو ئەنجامی بزانین شاعیر ئەم شیعرە لە ئەنجامی دەردی دووری و نامۆ بوون هۆنیوەتەوە.

## شەپۆلی خەم

بهێنە جامێ مەی ساقی بەپێوان
گوڵ و بولبول؛ بەجووتە بوونە میوان[1]
رووناکە کون کونی سینەم هەمیسان
لە شوعلەی شەو چرای کوڵمی جەوانان
هەناسەم لائەدا زوڵفی خەیاتەی
شوعاعی دێتەدەر خۆری بەیانان[2]
بەدەم نووکی موژدەی ئەو چاو غەزالە
پەرێشانە؛ دڵ و جەرگم؛ پەریشان[3]
بەکەیفی من برا؛ باوەڕ مەکەن قەت
لەسەر شانم غەمە بارستی کێوان[4]
ئەزانم بۆچی غەم بۆتن بەجووتم
بەدڵما دێ جودایی ڕوویی خۆبان[5]
ئەوا مرد (ئەسعەد)ی بێ چارە یاران
لەتاو جەورو جەفاکانی ڕەقیبان

**١٩٣٩**

دیارە لە ئەنجامی خەباتی سیاسی و کوردایەتیی لەناو حزبی برایەتیدا دووچاری ئازار و ناخۆشی و ناڕەحەتی بووە.

(١) شاعیر ئەم شیعرەی لە هەڕەتی هێز و توانای لاوێتی و لەناو جەرگەی خەباتی سیاسی و حزبی برایەتیدا هۆنیوەتەوە، ئەمە مێژووی هۆنینەوەکەی دیاری ئەکات کە ساڵی **١٩٣٩**یە.

(٢) شوعاع: چەپکە تیشک ئەگرێتەوە.

(٣) لەم بەیتەدا شاعیر پەنای بۆ خودی هونەری شیعری لە بواری ڕەوانبێژیدا بردووە و لێچوونی بەپێوانە هێناوەتەوە و دەستەواژەی (ئەو چاو غەزالە) لێچوو چاوی غەزالە و لەو چوو چاوی یارەو لێکچوونیش چاوی گەورەو ڕەشە و ئەوزاریش (وەکو)ە ئەمە لەو پەندە کوردیەوە هاتووە:
ئەو چاو جوانەی خوا پێداوەی وەک چاوی ئاسک.

(٤) بارست: بەرزی، قورسایی، قەوارە.

(٥) غەم بۆتن بەجووتم: غەم بووە بەهاودەمم.
– خۆبان: بێ هیوایی...



وەزیر و شاو گەدا و لەیلا ئەسیری تاوی گێسووتن
هەموو بێهۆش و گۆش و مەست و کەجنوون مائیلی ڕووتن[1]
وەرە ناو باخەکە نەختێ خەجاڵەت کە گوڵی مینا
(منور) کە گەلی عاشق لەگەڵ بولبول هەموو جووتن[2]
مەپرسە حاڵی پەروانە، دڵ و جەرگ و هەناویشم
لە بۆتەی عەشقتا سووتاوی شوعلەی چاوی جادووتن[3]
بەغەمزە و نازەوە خۆت خستە حاڵ نەزعەوە یاران[4]
ئەما چا بوو کە زانیم حیلە بازی پیشەوو خووتن
بەشێرۆی و کەسێ ڕۆڵە مەکوژە بابی شیرینت
وتی: باب و کەس و کارم شەهیدی تیغی ئەبرووتن
قوڵنگی نازی شۆخی هەڵ ئەداتن بۆ سەری فەرهاد
هەتا شیرین بناسێ ئەو کەسانە عاشقی ڕووتن
بەماچی لێوی یاری لێوەکەی ڕەنگین ئەکا (ئەسعەد)
نەبا زەردی بکا ئاهی غەمی وەک دووکەڵی تووتن

**١٩٣٢**

(١) گێسوو: پرچ: قژی خاوی شۆڕبووی ئافرەت.
– مائیل: حەز و ئارەزوو.
شاعیر لەم شیعرەیدا بەجوانی هونەرەکانی ڕەوانبێژی بەکار هێناوە... وشەی (ڕووتن) ڕەگەزدۆزی تەواوە و دوو واتا ئەبەخشێت:
١– ڕووتن: دەم و چاوتن...
٢– ڕووتن: تەنیا
وەک ئەوەی ئەوترێ بەتەنیا و هەر ئارەزووی هەیە.

(٢) وەرە ناو باخەکە: مەبەست سنگ و مەمکە.

(٣) چاوی جادوو: چاوی تەلیسماوی، ئەو چاوەی مرۆڤ بۆلای خۆی ڕائەکێشی و پابەندی خۆیی ئەکات.

(٤) غەمزە: سەیر کردن بەتیلەی چاو، چاو داگرتن.

بەسە؟ ئەی دڵ عەزیزم سەر بەکۆشی دووشمنا کردن
لە بۆ ماڵی دەنی دنیا چییە تاکەی حەیا بردن
سەفەر هاتۆتە بەر تێشووی قیامەت هەڵگرە هەڵسە
برۆ گورجێ بەشوێنی ئەو کەسانەی عاقڵ و وردن[١]
لە باغی گوڵشەنی عاشق هەلاڵە هەڵگرێ هەنگێ
شەهید نۆشان ئەرێژن عارەقی عەترین هەتا مردن[٢]
نیشانەی بەختیاری و سەرفرازی دین و دنیایە
لە گۆشەی تاکیا نەفرەت لە نەفسی پیسی خۆ کردن
نەما ئەمرۆ کەسێکی وا وتار و کردەوەی یەک بێ
بخۆ غەم داکە (ئەسعەد) ئەشکی خوێنینت هەتا مردن[٣]

١٩٦٠

(١) گورجێ: دەمودەست، هەر ئێستا، دەستبەجێ.
(٢) گوڵشەن: گوڵجار: گوڵزار.
(٣) ئەشک: فرمێسک.



پایزی دەرد و بەڵا ئەی دوژمنی دڵداری من!
باعیسی بێ ڕەنگ و بۆیی غونچەیی گوڵناری من[١]
وەیشومەی سەردت لق و پۆپی درەختی کردە پووش
بای شوومی شامی تۆیە تاڵ ئەکا ڕووخساری من
بۆ گەلاڕێزانە وا ڕازانەوە ڕەنگی گەڵا
یا لە سیوەیلا هەڵات ئەستێرەیی سەرداری من[٢]
گیانە بولبول، مەرحەبا؛ وا تووشی دەردم بوویەوە
گوڵ بەسەرچوو، قوڕ بەسەر، بوویە دڵەی غەمباری من
سەرد و سەرماکەت نەبێ شێخم خەیاڵی ژن ئەکا
پیرو پەڕبووت (ئەسعەدا) وەک جیسمەکە بێکاری من

١٩٤٨

(١) وەک لە پەراوێزی دەفتەرێکی دەستنووسی شاعیرا نووسراوە:
(لە دەوروبەری ساڵی ١٩٤٨ز، پادشای کوردستان شێخ مەحموودی حەفید، وەڵام ئەنێرێ بۆ مەلا ئەسعەد کە گوایا ژن دێنێ، هەرچەندە بۆ گاڵتە و سوحبەت وای وتبوو، بەڵام مامۆستا وەڵامەکەی وا دایەوە).
- باعسی: سەرچاوەی
(٢) سیوەیل: مەبەست لەناوچەیەکی گرنگ و جوانی کوردستانە لە شارباژێری سەر بەشاری سلێمانی.
بەیتەکە جوانی بایسیکی ناسک و بەهێزی تیا بەکارهێنراوە و سەرنجی مرۆڤ بەلای خۆیدا ڕائەکێشێ لە (صدر)دا ئەڵێ: بۆ گەڵاڕێزانە، واتە: ژیان و ئارام تێکدانە ئەگەرچی بەناوی شادی و دۆستیشەوە بێت، مەبەست لەو هەواڵەیە کە شێخی مەزن پاشای کوردستان بۆ شاعیری ناردووە...
بۆیە... شاعیر گلەیی ئەوە لە شێخ ئەکات: شتی وای لێ چاوەڕوان نەکردووە، بۆیە پەنای بۆ ئەو پەندە کوردییەی دەڤەری سلێمانی بردووە.
کە کەسێک دیاری ون ئەبێ، پێی ئەڵێن: بووی بەئەستێرەکەی سیوەیل... کەچی بۆ بەختی ڕەشی شاعیر شێخ ئەو قسەیەی کرد... ئەمە وەک ئەوە وایە کە لە سیوەیلێک ئەستێرەی بەخت ونە، کەچی ئەستێرەکەی ئەم هەڵات و دەرکەوت.

یارەبی چییە هێندە بەئازارە دڵی من
حەیرانی خەت و خاڵی لەبی یارە دڵی من[١]
سووتاوو پەرێشان و جگەر قیمەو جنراو
شەیدایی قەد و قامەتی دڵدارە دڵی من[٢]
کون کونە سینە بەدەم نەشتەری موژگان
کاول بووە لەم خانە کە بێزارە دڵی من
بۆ باغی ئیرەم دەعوەتی من سوویی نەبەخشی
گیراوی دەسی دولبەری عەییارە دڵی من[٣]
تک تک ئەتکێ خوێنی گەشم لەو موژە کاڵە
جنراوی برۆی حەزرەتی سەردارە دڵی من
پەروانە کەوا دەورم ئەدا شوعلەیی شەمعە
لوتفێکی خووا مەعدەنی ئەنوارە دڵی من[٤]
بۆ ترسی جەزا هێندە بەخوڕ خوێن ئەڕژێنم
بێ عەینی ئەڵێی گەوهەر و گوڵزارە دڵی من[٥]
ئەی وای لە بۆ خاکی مەدینە (ئەسعەد)
بۆ وەصلی ئەوە هار و بەهاوارە دڵی من

١٩٣٠

(١) ئەم شیعرە سەرواکەی لە دوو قافیە (کێش) پێکهاتووە... (آرە+ دڵی من) هەر چەندە لای شاعیر بەتوانا سانا و ساکار دێت، بەڵام خۆ بەستنەوە بەپێکهێنانی دوو سەروا هەم وەستایی و هەم شارەزایی ئەوێ... هەردوو دیاردەکە بەم شیعرەوە دیاری.
- لەبی: لەب: لَبْ: لێو.
(٢) قامەتی: باڵای.
(٣) عەییار: زۆرزان، بەنازو نوز.
(٤) پەروانە: پەپوولە.
- شەمعە. مۆمە.
- مەعدەنی ئەنوار: شاعیر ئەڵێ لوتف و میهرەبانی خودا بۆمن، ئەبێتە کانزایەکی شەوقداری دڵم.
(٥) بێ عەینی ئەڵێی: هەر ئەڵێی: هەمان شت.



ئەترسم ئەی وەتەن لەم جەنگەشا دیل و بێ بەش بین
وەکو دەوری جەهالەت هەر خەریکی حیلەو غەش بین[١]
ئەمان ئەی نەو جەوانینە دەخیلە فرسەتە هەستن
لە ماصەی صوڵحی عالەم بەڵکو ئێمەش خاوەنی بەش بین[٢]
دزی عەیبە بەسە کوشتن زەمانی وەحشیەت تا کەی
لەبەر زوڵم و زەلالەت بۆچی ئێمە پیس و ڕوو ڕەش بین
ئەوانەی حەق شوناسن گەیینە ڕوتبەی عالەمی باڵا
لە ڕێگەی چەوتیا تا کەی برالە گوێ کوتەی وەش بین[٣]
دوورا کفنی حەسرەت بۆ هەموو کوردێ بەدەرزی غەم
کە تەقدیری ئەزەل (ئەسعەد) وەهایە ئێمە بێ بەش بین[٤]

١٩٤٢

(١) ساڵی ١٩٤٢ شاعیر لە ئەنجامی چالاکی سیاسی و خەباتی کوردایەتی دەربەدەری ئێران بوو... هەر لە ساڵی ١٩٤٢شدا جەنگی دووەمی جیهانی درێژەی هەبوو... ئەو بڕوای وابوو کورد لە کاتی جەنگێکی جیهانیدا ئەتوانێ مافەکانی چارەنووسی ئایندەی دیاری بکات... لەبەرئەوەی شیعرەکە ڕۆژ و مانگی بەسەرەوە نەبوو، نەتوانرا ئەو ڕاستییە ساغ بکرێتەوە.
(٢) ئامان- دەخیلە: هەردوو وشەکە هاوار و هانابردنە، تا بەدەم داوا و خواستەکانی شاعیرەوە بچن.
- لە ماصەی سوڵحی عالەم: مەبەست لەو دەستکەوتەیە لە ئەنجامی کۆتایی هاتنی جەنگ و ڕێکەوتنی دنیایە.
(٣) گوێ کوتە: ئەوانەی گوێیان کون ئەکەن سا پیاوبن یاخود ئافرەت.
واتای بەیتەکە: ئەوانەی شارەزاییان لە دۆزینەوەی ڕێگای ڕاست و هەقپەرەستیدا هەیە، هەموویان بەئامانجی خۆیان گەیشتن... بۆیە داوا لە خەڵکانی دڵسۆز و جوامێر ئەکات کە ڕێگای چەوتی بەردەن، چونکە تاکە داگیرکەر و ناحەز و دوژمن بەسەرماندا زاڵ بن و سواری سەرمان بن گوێمان کون کەن و وەک کەر هەر کات بیانەوێ وەش وەشمان لێ بکەن!
(٤) دوورا کفنی حەسرەت: کفن داخ و پەژارە و هەناسە هەڵکێشان بەدەرزی غەم دووریان و کاری تیاکرا.

دەس لە تۆ هەڵناگرم؛ دینی موبین
کوت کوتمکەن، ئەچمە ڕیزی موتتەقین[(١)]
مولحیدی سەگ، تەفرەی کەس بانەدا
مردنی مەردانەبێ؛ قوربانی نامەردێ نەبین[(٢)]
پینەیی لاجانی گەنجە؛ بوو بەپەندی عالەمێ
خادمی شەرعم، لەگەڵ عیلمی یەقین[(٣)]
بوونە عەبدی سەگی خۆ، ئەم عالەمە
لابدە لێم، ئەم بەڵایە، ڕەحمەتەن للعاملین
قەبرەکەم بیکەن بەرەوضە نەیکەن بەنار[(٤)]
دەستی من دامانی تۆ، گەورەترینی مورسەلین

(١) دینی موبین: مەبەست لە ئاینی ڕوون و پاکی ئیسلامە.
– موتتەقین: متقین: خوا پەرستیەکی بەهێز و ڕاست.
(٢) مولحید: کەسانی بێ ئیمان و بێ بڕوا، مەبەست لەوانەیە شەیتان چۆتە دڵ و مێشکییانەوە و بڕوایان بەبوونی زاتی پاکی خودا نییە.
لە نێوان وشەی (مەردانە و نامەرد) چەشنە جوانکاریەکی هەیە، وشەکە یەکەو واتا پێچەوانەیە و ئەمە بەدژیەکی سلبی ناسراوە ئەوەتا ئەڵێ: مردن بەمەردی لەوەی بەقوربانی نامەردێ بێت.
(٣) عیلمی یەقین: زانیاریەکی دڵنیاییانەی ڕاست.
(٤) ڕەوضە: گوڵخانە، گوڵ و گوڵزار، مەبەست لە بەهەشتە کە خۆشترین شوێنە و خودا بەمرۆڤی خاوەن ئیمانی ئەبەخشێ.
– نار: مەبەست جەهەننەمە.
– گەورەترینی مورسەلین: مەبەست پێغەمبەری خۆشەویست و نازدارمانە، محەمەد (د.خ).

***



وەک (تقاعد) وایە دونیا بێ بەشە بۆ ئەهلی دین
نالەبارە دەرحەقی شایی کەران ئەیکاتە شین
ئەو کەسە چاوی تەماعی بڕیە ئەرزی عالەمی
بوو بەتۆزێکی زەوی نەیماوەتن باسێکی ژین
مردنی حەق چەندە خۆشە پێم ببەخشە یا ڕەبی
نامەوێ سەرداری پیس و، نامەوێ زوڵفەینی چین
لێم ئەپرسن (ئەسعەدا) بۆ خواب و خۆراکت نییە
ئاهو ناڵەی حەسرەتم ئێستا بەتەن کەوتۆتە بین[(١)]

١٩٦٩

(١) خواب: خەو، ئارام... سەر ڕەحەت.
– خواب و خۆراک: خەو و خواردن.
– بین: قورگ... بینە قاقا.

## بەهار نامە

بەهار هاتەوە دەشت و کۆ ڕەنگین(*)
دڵی دوشمن شاد دڵی من غەمگین

عاجز و غەمگین دڵم واکرا — بەیەخسیر و دیل براله برا[1]
بۆ گریەی من و شیوەنی بولبول — بەخێر بێیتەوە ئەی بەهاری گوڵ
وەنەوشەو نێرگز درەوشانەوە — بۆ سەری لەیلا وا گەشانەوە
ناڵەی نەی و دڵ کەوتەوە ناوباخ — نازی نازەنین جەرگی کردەداخ[2]

بەخوێنی عاشق دەشت و کۆڕەنگین
بەهار هاتەوە، دڵی من غەمگین

بۆ حاڵی خۆمان گرد ببینەوە — لە کەساسیمان ورد ببینەوە
زرەی پاوانەی پایی جانانە — ڕۆژی بێداری لاوو مەردانە
قاڵیچە سەوزی سەحرا ڕاخرا — دەرگانەیسەرمایزستان داخرا[3]
چرای پەروانە هەڵگرایەوە — بەرۆکی غونچە دادڕایەوە

هاتەوە بەهار دەشت و کۆ ڕەنگین
شین بووە دەشت و ئێمە وا غەمگین

ئەرزی کوردستان هەموو گەوهەرە — ئاوو جۆباری وەکو کەوسەرە[4]
بەلێڵی ئەڕۆن زەڵم و تانجەرۆ — بۆ ئێمە ئەگرین بووینە ڕەنجەڕۆ
وەتەن؛ فەوتاوی پەشێواویتم — دڵ بریناری ناتەواویتم
لە (سەعد ئابادا) قەرارمان درا — بۆیە لە ئێران کوشتارمان کرا[5]

بۆ کەساسی گەل سینەمە غەمگین
هاتەوە بەهار دەشت و کۆڕەنگین

بەرگ غەزایی ئەرخەوان پۆشیی — بادەیی مەستی عاشقان نۆشیی
گوڵاڵە سوورەی سەر کوڵمی یارم — وا گەشایەوە بۆ حاڵی زارم[6]
سومبولی زوڵفی خەیاتەی خاوە — عارەقی عەترە ئەو بەڵەک چاوە
کانی تەقیوون جۆکە سەرکەوتن — زنجی مرواری هەموو دەرکەوتن



داخی گرانم کوردە وا غەمگین
هاتەوە بەهار دەردی من سەنگین

چریکەی بازە لە نزارانا — کناچەی پۆڕە لە گوڵزارانا[7]
قاقبەی کەو یێ لەسەری کێوان — گوڵی گەشاوە نەمامی سێوان
توو خوا ساقی بێنە پەیمانە — موتریب بەیادی چاوی جانانە
لێدە لە ساز و عود و چەقەنە — عاشقان مەستی چاهی زەقەنە[8]

هاتەوە بەهار دەشت و کۆ ڕەنگین
بۆ کەساسیمان ژیرە دڵ غەمگین[9]

برا ژیرەکان، بۆیە غەمگینە — بەخوێنی یەکتر چیا ڕەنگینە
میناو پەسەند و شەوبۆ و قەرەنفڵ — پێم ئەڵێن ئەسعەد مەدە دڵەدڵ[10]
جەنگی عالەمی جەنگی کوردانە — ئیمتیازدەری لاوو مەردانە
کۆششێ ئەوسا گەنجەکانی کورد — ڕزگاری بکەن دڵەی پڕ لە دەرد

داخی سەد داخم کوردە وا غەمگین
هاتەوە بەهار دەردی من سەنگین

١٩٤٧/٤/١

---

(*) وەک شاعیر لە پەراوێزی دەفتەری ژمارە (٤) دانووسیوویە ناوەرۆکی ئەم شیعرە ڕەنگدانەوەی بارودۆخی سیاسی و خەباتی کوردایەتییە، (دوای ڕووخاندنی کۆماری میللی کوردستان) پۆلێ شەهیدان پێشکەش بەکاروانی خەباتی کوردایەتی لە کوردستانی ئێران کراوە و قازی محەمەد و ئاوەڵە سەربەرزەکانی ئەو کاروانەی شەهیدانیان پێکهێنا).
شیعرەکە لە ڕووی هونەری شیعریەوە شاعیر توانا و شارەزایی و سەلیقەی وردی خۆی تیا بەکارهێناوە و جیا لە پارچەو قەسیدەکانی پێشووی ئەم تەرزە هونەرە نوێیەی پێشکەش کردووین.
- کۆ: کێو، چیا، شاخ.

(١) یەخسیر: دەستبەسەر، گیراو، داماو، بێ چارە هەردوو وشەی (برا) ڕەگەزدۆزی تەواون و جوانبێژیەکی بەسەلیقەیان پێکهێناوە لە یەکەمیاندا برا هەر برایە و لە دووهەمیاندا برا: واتە بردیان

کەچی ئەتوانین بەم شێوەیەش بیخوێنینەوە و هیچ لە هێز و پێزی واتاکەی ناگۆڕێ: برا لە برا واتە برا بچکۆڵەکەم برا... برای دووەم لێرەدا بۆ جەختە؛ بەڵام ئەوەی جێی ئاماژە پێکردنە، پێویستە نیوە دێری یەکەم (عاجز و غەمین دڵم) بەیەک هەناسە بخوێنرێتەوە... (وا کرا بەیەخسیر و دیل) بەهەناسەی دووەم بەڵام لە ڕووی واتاوە نەک بڕگە بڕگە.

(٢) جەرگی کردەداخ: جەرگی سووتاند.

(٣) قالیچە: واتە وەرزی بەهار فەرشی گوڵ و گوڵزاری ڕاخست.

(٤) جۆبار: چەم: وەک چەمی تانجەڕۆ... ئاوەکەی لەزێ کەمترە.

– کەوسەر: کوثر: ئاوی کانیاوێکی سازگار و پیرۆزە لە بەهەشتدا.

(٥) سەعد ئاباد: ئەو شارەیە کە حکوومەتەکانی عێراق و تورکیا و ئێران و بەریتانیا و پاکستان، پەیمانێکیان بۆ فەوتاندنی بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی کورد تیا بەست، بۆ ئەوەی لە هەر شوێنێکی پارچەکانی کوردستانی گەورەدا شۆڕش بەرپابوو، بەگەلەکۆمەکێی هەموویان پەلاماری بدەن و نەیهێڵن.

(٦) زۆرکەس پێی وایە ئەم دوو نیوە دێرە شیعری فۆلکلۆریە و تێکەڵ بەگۆرانییە میللییەکان کراوە و ڕەسوڵی گۆیندەبێژ پێشکەشی ئەکا.

(٧) کناچە: ئاوازێکی دڵفڕێنی گۆرانییەکانی ناوچەی هەورامانە.

(٨) چاهی زەقەن: مەبەست لەو چاڵی چەناگەیە یە کە زۆرجار ئەبێتە نموونەی جوانی و سەرنج ڕاکێشانی مرۆڤ.

(٩) ژیر: بەهۆش بەهزر، عاقڵ.

(١٠) قەرەنفڵ: گوڵە مێخەک.



لە پێناوی جودایی یار ئەنێم ڕووناکی هەردوو چاو[*]
لەجێی لالەی کەژ و کێوان ئەنێژم جەرگی پڕ خوێناو[١]
بزانن یاری من ئەو یارەیە زانین ترینی کەس
نەبێتە ئالەتی دەستی ڕەقیبی دوشمنی بەد ناو
لەسایەی لوتفی حەق قاپی قەناعەت بۆ دڵم وازە
(جزاك اللّه) ئەی دڵ وەک منت کردۆتە خاوەن ناو[٢]
لە دنیادا سەر ئەفرازە ئەوی نەفسی لە رستابێ
نەکو چاوی تەماعی لێی خۆڕێ بیکاتە بەند و داو[٣]
بەئامۆژگاری (ئەسعەد) وەرە باوەڕ بکەن یاران؛
نەکەن باوەڕ بەخائین نەت فرۆشێ عەینی چەرمی خاو[٤]

١٩٣٠

(*) شاعیر لەسەر دەستنووسی ئەم شیعرە ساڵی ١٩٣٠ی تۆمارکردووە.

(١) جودایی: جیابوونەوە...

شاعیر لە ئەنجامی هەر هۆیەکەوەبێ، ئەیەوێت لە یارەکەی دوورکەوێتەوە، بەڵام ئەو دوورکەوتنەوەیە سەرچاوەی ژان و ئازارێکی بەسوێی پێ ئەگەیێنێت، ئەوەتا ئەڵێ: گەر ڕووناکی هەر دووچاوم لە پێناوی ئەو جیابوونەوەیەدا داناوە، بڕیارە و بەجێی ئەهێنم و لەجێی ئەو گوڵە جوانە کە بەگوڵە (لالە)ی کوێستانی چواندووە، وازی لێ ئەهێنێت و جەرگی پڕ لە خوێناوی لا پەسند و پیرۆزترە.

(٢) وازە: کراوەیە، لەسەر پشتە.

(٣) سەرئەفراز: سەربەرز...

– لە رستابی: لێرەدا بەمەبەستی پێگەیوو کاملە... واتە ئەو نەفسە بەرزەی شتی پڕوپووچی دنیایی کاری تێناکات.

(٤) چەرمی خاو: چەرمی ماڵاتی بەرزە کە بەر لە خۆشکردنی هیچ کەڵک و قازانجێکی نییە.

نەتیجەی کاری ئێمە وا ئەزانم خوێنەکەی شەوبوو
ئەوی وتراو بینرا بوو خەیاڵێکی پەتی خەوبوو[1]

نەما شوێنی هیوا ڕۆیی بەتاڵی عومری شیرینم
پەنا بۆ هەر کەسێکم برد ڕەقیبی ناپەسەند ئەوبوو

قسەی پووچ و خۆڕایی بەسیەتی مەیکە خوا گرتوو
درۆ ناچێتە سەر بۆ کەس خەزێنەی قاروونی چەو بوو[2]

شکا بازاڕی گەنجینم ئەی فەلەک پەست و پەرێشانم
جەوری صافم نییە ژوور و دەریشم ڕەنگەکەی تەو بوو

دڵی (ئەسعەد) لە سینەی تەنگیا ماوە وەکو بەندی
پیاڵەی زەهرە ئەینۆشم لە دەستی دوژمنی نەو بوو[3]

١٩٦٧

---

(١) ئەم شیعرەی شاعیر لە کاتێکدا هۆنراوەتەوە... شاری سلێمانی بەتایبەت و کوردستان بەگشتی لە دۆخێکی سیاسیی نالەباردا ژیاوە... شۆڕش و سەرکردایەتی بزووتنەوەی سیاسیی کوردی ببون بەدووباڵەوە... ئەو حاڵەتە: تەمی نائومێدی لای زۆر دڵسۆزی نەتەوە و نیشتمان دروست کردبوو... شاعیر پەنا بۆ لایەنی ڕەوانبێژی لە بواری تێهەڵکێشدا بردووە و ئەو پەندەی کە ئەوترێت: خوێن شەوی بەسەرداهات هەقی ناکرێتەوە، ئەمیش ئەڵێت: کار و ماندوبوونی ئێمە وەک ئەوەیە: لە تاقیکردنەوەکەدا سەرنەکەوتین و کورد لە بڕی ئەوەی مافی خۆی بسێنێت کەوتونەتە گیانی یەکتری.
– خەیاڵێکی پەتی: خەیاڵێکی ڕووت.

(٢) خەزینەی قارون: دەوڵەت و سامانی قارون، – قارون: پیاوێکی سامانداری عیبرانیی سەردەمی حەزرەتی موسابووە، خودا لە ئەنجامدا هێناویەتە سەر ساجی عەلی و ئێستە بەپەند ئەهێنرێتەوە... ئەوەتا شاعیر ئەڵێ: ئەوانەی ناڕاستن دوایی سەرمایەکەیان وەک خەزینەی قارونی لێدێت و ئەو سامانە ئەبێ بەچەو
– تەو: لێرەدا بەڕەنگی بۆر دێت، واتە: ڕنگم تێکچووە.

(٣) نەو نوێ، تازە.

***



لوتفی ئێوە هەرچی بوو بۆ وەحشیەت بێ هوودە بوو
تاج بەخشی بۆ عەدو خۆ کوشتنی بێ هوودە بوو[1]

کاری چەوتم لانییە چەوتانە دەستم پێ مەدە
دەستی چەوتە گرتنت ڕۆیی لە دەس بێ هوودە بوو[2]

نەک لە کیست، دەس بچێ، دەستی شکاوت بگرەوە
بۆ دەوایی ژینی مردوو هەرچی بوو بێ هوودە بوو

من وتەم قانوونە خۆ هەدیەو دیاریم گەوهەرە
تا وتەی چەوتت ئەوێ خەرموهرەیی بێ هوودە بوو[3]

شەو بەڕۆژی تێ گەیشتی باعیسی بەختی بەدم
(ئەسعەدا) دۆڕاوە مەرزی ڕەنجی هەموو بێ هوودە بوو[4]

١٩٣٨

---

(١) بێ هودە: ڕنج بەباچوو، دەستشتن لە هەر بیروباوەڕ و کارێکی پراکتیکی ئەگەێنێت.

(٢) لە نێوان دەستی چەوتە و لە دەسی بێ هوودە بوو ڕەگەزدۆزی ناتەواو هەیە... دەستی چەوتە: واتە کارەکانی ناڕێکە و لەدەس بێهوودە بوو: واتە لە کاری بێ ئەنجام ئەگەێنێت.. هەروەها هەموو وشەی (دەست، دەس)ە کانی ئەم شیعرە هونەری ڕەگەزدۆزییان پێکهێناوە و جوانییەکی بەوێنە شیعرییەکان بەخشیووە.

(٣) خەرموهرەیی: مووروە کەرانە، ئەمە بریتییە لە موورویەکی گەورەی شین... گوایە: هەندێک کەس بڕوایان وایە ورد بکرێت وەک خۆراک بەهەر کەسێک بدرێت چیی پێ بڵێیت لە قسەت دەرناچێت و گەوجی ئەکات.

(٤) باعیسی: هۆی یاخود کانگاو سەرچاوەی.
مەرزی ڕەنجی: لێرەدا مەرز بەمەبەستی بەرە، بەرهەم دەسکەوتە واتە بەری ڕەنجی.

واعیزی بێ حورمەت و بەدکاری تۆ
پول پەرست و دوون و بەدرفتاری تۆ[١]
وای لە ئەمنا ، نا پەسەن دەرحەق بەشەر
ماری تۆ، دوپشکی بەدڕوخساری تۆ[٢]
نوێژ بەبێ دەسنوێژ ئەکەی؛ بۆ عالەمێ
کافر و زندیقەکەی بێ باری تۆ[٣]
مێزەری پانت لەسەرنا بۆ فریب
کۆنە دەعبا ، لۆتیی ناوشاری؛ تۆ[٤]
تۆبەکە ، بەسیە دزی، ڕووکە خوا
پارە بۆ کێ دائەنێی، سەرکاری تۆ
بەس لە بۆ دونیای دەنێ شەرمت بەرە
ئەو حەلە؛ مردی، ئەزانی؛ بێ کەس و بێ کاری تۆ
زۆر گەڕا (ئەسعەد) کەوا وێنەت بکا
حیلەباز و سپڵە و سەکساری تۆ[٥]

١٩٧٢/٨/١٧

---

(١) ئەم قەسیدە دوو سەر وایە (اری + تۆ) جۆرە وردەکاریەکی هونەریی پێوە دیارە.
– دوون: چرووک و سووک و سەلیم.
(٢) وای لە ئەمنا: بوی بەجاسووس و لە دائرەی ئەمندایت.
(٣) زەندەق: خوا نەناس.
(٤) فریب: فریو، هەڵخەڵەتاندن.
– کونە دەعبا: ئەمە توانجە و خۆی لە درکە (کنایە)دا ئەنوینێت.
ئەتوانرێت لە باتی دەعبا ، هەر وشە و زاراوەیەکی ناشیرین و سووک بەکابهێنرێت.
(٥) سەکسار: وەک سەگ، لە سەگ چوو.

***



ڕۆژمێری کوڵمی یارە، خۆری لێکردم بەدوو
کوانێ حەسری نەوعی فەردی، ڕۆژی ئێمە بوو بەدوو[١]
ماری زوڵفی، بێ ئیجازەی بوو، لە ناکاو گەستمی
دڵ نەما ، جەرگیش بڕا، دەرچوو حەیاتم زوو بەزوو
سوور و زەردی یاری من بوو، نرخی سێو و بەی شکا
قوڕ بەسەردا با بکا ، میوە فرۆشان دوو بەدوو[٢]
ڕۆحەکەم پەروازەیە، جانانە ئێستا ئیزنیدا
زیارەتیکا عاشقانی؛ قوڕ بپیوێتن عەدوو[٣]

١٩٧١

---

(١) لە سەدری ئەم بەیتەدا، شاعیر وێنەیەکی هونەرمەندانەی شیعری کێشاوە، کوڵمی یاری بەخۆر چوواندووە و، وەک ئەو قسەی ئەوترێت: سوورە سووری کوڵمی دێت.
(٢) بەی: بەهێ... نیشانەی ڕەنگی زەردە.
لەم بەیتەدا هونەری پێچە و پەخش بەکارهێنراوە... ئەوەتا لە عجزی بەیتەکەدا ئەڵێ: سوور و زەردی یاری من بوو، دواتر ئەڵێ: نرخی سێو و بەی شکا... شاعیر زۆر زیرەکانە مامەڵەی لەگەڵ لایەنی هونەریی شیعرەکەیدا کردووە، پەخشەکەی پێش پێچەکە خستووە و ئەم ئاڵوگۆڕکردنە بەجێگا، هێزێکی نوێی بەشیعرەکە بەخشیوە، وا لە مرۆڤ ئەکات زیاتر سەرنجی بدات و لێی وردبێتەوە و چێژ لە واتاکەی وەرگرێت.
(٣) پەروازەیە: پەرەوازە: لێرەدا بەمەبەستی تەرە و تۆ راو دێت واتە ڕۆحەکەم لە شوێنی خۆی نییە.
– جانانە: زۆرزان...

***

ياقووتی جگەر گۆشەم هەستە وەرەوە ئەمشەو
دڵ قوتوی لەبی تۆیە، بێ بیدەرەوە ئەمشەو[١]

دەرمانی هەموو دەردم گەردێکی بەری پێتە
عیسای زەمان ئابێ خۆشم کەرەوە ئەمشەو[٢]

ساقی بەفیدای تۆ بێ گەنجی هەموو گەنجینە
نەختێ لە مەیی کۆنت بێ بمدەرەوە ئەمشەو[٣]

بەزمێکی حەبیبانە خاڵی لە ڕەقیبانە
ئەی دولبەری جانانە لایە کەرەوە ئەمشەو[٤]

توو خوا مەکە مەنعی من ئەی زاهیدی بێ ئەنوار
بێ نووری حەقیقەتمان نەختێ بەرەوە ئەمشەو

بۆ مەجلیسی شۆخانم سەیرێکی گوڵاڵە نم
هاتووم بەدڵ و جانم، جانا وەرەوە ئەمشەو

(ئەسعەد) چییە مەفتوونی دوو چاوی شەهێنیتە
وەستاوە لە بۆ خزمەت فەرموو وەرەوە ئەمشەو

١٩٢٦

---

(١) یاقووت: بەردێکی ئاڵی گرانبەهایە.
– دڵ قووتی لەبی تۆیە: دڵ خۆراکی لێوی تۆیە.
ڕەگەزدۆزی ناتەواو لە نێوان هەردوو وشەکەدا هەیە.
(٢) ئابێ: ئا وەرە: ئاوەرەوە.
(٣) لە نێوان هەردوو (گەنجی، گەنجینە)ە ڕەگەزدۆزی تەواو هەیە... گەنجی یەکەم: بەسامان و پارە و ماڵی دنیا دێت و گەنجینەش بریتیە لە خەزێنەی پڕ لە پارە و سامان.
(٤) لایە کەرەوە: ئاوڕ بدەرەوە و سەیرم بکە.



## خەنافیس

خۆ لەمن بۆچی وەها کردت بەخێو
ئەی خەنافیس، کۆمەڵی ئەرژەنگ و دێو[١]

سەیری وێنەی کەر گەسی نەحست بکە
بوویە عیفریت و ئەدەیتە شاخ و کێو[٢]

زولفەکەت سەر سەر، ئەنێت و بوویە جوو
بێ حەیا، بەرموور لە مل، بۆیە لە لێو[٣]

چاو لە ئەوروپا ئەکەی بۆ مێیەتی
پیشەیی نالایقت خستۆتە نێو[٤]

شیمەیی پیاوانەیی، حەیفێ نەما
خوانی عیلمە، مایەوە بێ نان شێو[٥]

١٩٧١

---

(١) خەنافیس: خونفوس: مەبەست لەو مرۆڤانەیە بەتایبەت پیاوان کە زوڵف و پرچیان درێژ ئەکەن... شاعیر مەبەستی لەو گەنجانەیە کە لە ساڵانی حەفتاکاندا، خۆیان دابووە زوڵف و درێژکردنەوەی قژی سەریان... لەو ساڵانەدا ئەمە باوبوو.
(٢) نەحست: شووم... بەخت ڕەش.
(٣) جوو: جوولەکە.
– لە لێو: لێرەدا مەبەست لە لەیە... ئەو ئافرەتانەی مناڵان ژیر ئەکەن.
لەم بەستەدا مەبەست لەوەیە: هەندێک لە گەنجەکانی ئەو سەردەمە، بێ هیچ بەرنامەیەکی کەڵک بەخش لاسایی ئەوروپاییەکانیان کردۆتەوە و قژە سەر و زوڵفیان شۆڕ کردۆتەوە، کە ئەوەش بۆ ئەوسا و ئێستای دابونەریتی کۆمەڵگاکەمان دیاردەیەکی نامۆیە... ئەوەش زیاتر کاریگەری لە شاعیر کردووە، بەتایبەت کە شاعیر: زانایەکی ئاینی پایە دیداری ئاینی پیرۆزی ئیسلام بووە.
(٤) نالایق: نا شایستە، نەشیاو.
(٥) شیمەیی: بەهاو خەسڵەتە بەرز و بەنرخ و پیرۆزەکانی مرۆڤە.
– حەیفێ: داخ.
– خوانی عیلمە: مەبەست لە خۆراکی فیکری زانستانەیە.

***

بۆ مەدحی ئەتۆ (الفی) قەدت مائیلی بابە
(تصحیفی) بکە زوهرە کە تۆی دی بەعیتابە[١]
(تشبیهی) دەمت گەر بکەمە غونچە خەتایە
نوقصانە برا کاری وەها عەکسی صەوابە[٢]
مەنعی مەکە دڵ گۆشەبی مەیخان و شینە
کوژراوی موژەی سوورمەکەش و نێرگزی خابە[٣]
لەو ڕۆژەوە بڕیارە دڵ و دیدە لە ڕووی تۆ
وا شەربەتی عەزبم بەخوا عەینی عەزابە[٤]
عاجز مەبە جانا لە گڕو دووکەڵی جەرگم
برژانی ڕەشت بۆ دڵی من شیشی کەبابە
شەو هات و غەمیش هەورو تەمی خستەوە مەیدان
شاها وەرە تۆ دەفعی بکە مەردی خووا بە
تا مەستی دەم و دیدەیی تۆ بێ دڵی (ئەسعەد)
مەی نۆشی نەکەم بیشم دەنێ مەی بەقەڕابە[٥]

١٩٣٧

(١) ئەشێت بووترێت: لە نیوەی یەکەمی سەدەی بیستەمدا شیعر زۆر بۆشایی پڕکردبووەوە شاعیر ئەرکی بەجێهێنانی هونەری شیعری و وردەکاری و جوانکاری لە ئەستۆبوو... خوێنەر و بیسەری شیعر تامەزرۆی شیعر بوون و بەچاوی مشتەرییەوە سەیریان ئەکرد و مامەڵەیان لەگەڵدا ئەکرد.

لەو شیعرانەی شاعیر تەمەنیان بەر نیوەی یەکەمی سەدەی بیست کەوتوون، بەوردەکاری و خۆماندوکردنی هەستی و فیکری شاعیریان پێوە دیارە.

لەم قەسیدەیەیدا بایەخێکی یەکجار زۆری بەزانستی جوانی و ناسکی شیعرەکە دراوە و گەر بشێت، ئەکرێ بووترێت فەلسەفەی ژیانی تیا قووڵ کردۆتەوە: لەم بەیتەدا شاعیر ئەڵێ: قەدی باریک و ڕێکی تۆ بەوێنەی پیتی ئەلفەو شایستەی پیا هەڵدانە. لە (عجز)ی ئەم بەیتەدا شارەزایانە... جێگۆڕکێ بەواتا و شێوەی وشە ئەکات و بەوشەی (تصحیف) کە مەبەست گۆڕانکاریە بەسەر وشەدا، سا ئەوە کەمکردنەوە بێ یاخود زیادکردنی یان پاش و پێشخستنی پیتەکان... ئەمە هونەر وەریە... شارەزایی و ئاستی ڕۆشنبیری شاعیر دەرئەخات... ئەوەتا لەو (تصحیف)دا ئەوەیە کاتێ ئەستێرەی زوهرە سەرزەنشتی کردیت ئەوا ئەو (مَدح) ئەبێت بە(أمْدَعْ) و لەکاتی (تصحیف)یشا



ئەبێ بە(أحمد) فەلسەفەی بیری وردەکاریە هونەرییەکە لێرەدا دەرئەکەوێت.

- بابە: زیاتر لەو واتایەوە نزیکە ئەرباب واتە کەسێکی شایستە و خۆییە.
- زوهرە: یەکێکە لەو ئەستێرانەی لە زەمینەوە نزیکە.
- عیتاب: لۆمە و سەرزەنشت.

(٢) عەکسی صەوابە: پێچەوانەی ڕاستییە.

(٣) خابە: بەسزمان... مەبەست گوڵە نێرگزی بەسزمانە.

(٤) لەنێوان (عەزب و عەزاب)دا ڕەگەزدۆزی ناتەواو هەیە... واتاکان شاعیر لە دەفتەری ژمارە (٤)دا بۆ عەزب واتای شیرینی داناوە ئەشێت لەوەوە هاتبێ (ماء العذب) واتە: ئاوی شیرین... بەڵام پێدەچێت ئەم لێکدانەوەیەش هەڵبگرێت، عەزب: مرۆڤی ڕەند، بێ کەس و کار ماوەتەوە... بەڵام عەزاب = عذاب: ئازار و سزادان.

(٥) لەم بەیتەدا هونەری جوانی بایس لەواتاو چنینی شعرەکەدا خۆی بەتەواوی زاڵ کردووە...

چەند جوانی وتووە: تا ئەسعەد بەدیدی تۆ و تامی دەمت مەست بێ... ئەوا مەی (شەراب)یش نەنۆشم، یاخود بەقەڕابە مەیم پێنۆش بکەن لام یەکە، چونکە من بەستی تۆم.

گوناهم بێ شوماره ئەی خووا تەوبە خووا تەوبە
(بحمد اللّه) بەدایم دڵ ئەڵێ: تەوبە خووا تەوبە[١]
لە صەفحەی دەفتەری خۆما تەماشای کردەکانم کرد
هەموو پیس و چەپەڵ بوو ئەی خووا تەوبە خووا تەوبە
لە تەوبە حەزرەتی پیرم خەمۆشی بوو بەڵا بۆ من
نییە چارەم بەغەیری تەوبەکردن ئەی خووا تەوبە[٢]
هەموو باری گوناهی ئوممەتی ئەحمەد هەر چەندێ بێ
بەرابەر ڕەحمەتی تۆ زەڕەیەکە ئەی خووا تەوبە[٣]
سوپاسی حەق ئەکەم ویردی زبانم هاتە سەر تەوبە
لە ئەعمالی بەدی (ئەسعەد) ببورە ئەی خووا تەوبە

١٩٤٣

(١) شاعیر ئەم شیعرەی دوای تێکچوونی ئیدارەی سەردەشت و گەڕانەوەی بۆ شاری سلێمانی هۆنیوەتەوە... سیمای گەڕانەوە بۆ باوەشی زوهد و خواپەرستی و تۆبەکردن لە گوناهی ڕابردووی پێوە دیارە.
شیعرەکە لە ڕووی هونەری شیعری و سەرواوە شاعیر کارێکی نوێی ئەنجامداوە و سێ وشەی بۆ سەروا ڕێکخستووە و هەموو وشەکانی (تەوبە خووا تەوبە) لەگەڵ هەموو دێرە شیعرەکاندا گونجاوە و ساز و لەنگەری موسیقایەکی شیعری پێکهێناوە.
(٢) خەمۆش: خامۆش، کپ و بێ دەنگ.
(٣) زەڕە: گەرد، تۆزیلە.

***



ئەجەل؛ هاتۆتە بنگوێم و وجوودم بوو بەجل ئێستە
بەسە نەفسی (پڕوپووچم) بڕۆ تەفرەم مەدە هەستە[١]
نەبوومە هیچ، هەتا ئەمڕۆکە، عومرم بوو بەحەفتاوسێ
بەهیچ نابم، لەمەو پاشیش، خەیاڵی واهیمی بەستە[٢]
لە کۆڕی عاشقان، دووڕوو؛ لە کانی مەعریفەت بێ بەش
وەکو (هایم) سەرەفگەندە، دڵم کەیلی خەم و پەستە
بەهایو هۆیی بێ مەعنا، خەڕۆنابم؛ دەڵێم لادە
ئەوی دێت و هەیە، دەڕوا، مەقاماتە لەگەڵ بەستە[٣]
برا لەم گێتییە، حەیران و دامام و پەرێشانم
کەناوی حەق ئەبەم، عالەم ئەڵێن: مەجنون و بەد مەستە[٤]
هەوا خواهی، هەوا سەیری هەموو ڕۆیی برا ئەوا
کەساس و کز، لە مەیدانا، ئەڵێ گورگێکی دەم بەستە[٥]
ببورە، ئەی خودا لەم (ئەسعەد)ەی خاوەنی تاوانە
هەچی هەم ئوممەتی، مەحبوبتم ڕوو ڕەش و خەستە[٦]

١٩٧٢

(١) شیعر بەواتا فەلسەفیەکەی ڕۆحی داهێنانی هەست و سۆز و بیرە... بورکانی هۆش ئەخرۆشێنێت دەستەڵات و توانای شاعیر دەرئەخات و بەرگی زیندویتی لەبەر شیعرەکە ئەکات... ئەم قەسیدەیە خاوەنی موسیقایەکی بەتام و چێژە و مرۆڤ چەندە لەگەڵیدا بژی، ئەوەندە زیاتر هۆگر و شەیدای ئەو زمانە ڕەوان و پاراوەی شاعیر و دەستەڵاتی هونەری شیعریی ئەبێت.
– ئەجەل: کاتی مەرگ... واتە مردن.
– جل: بەرگ... زۆرجار بەکەلوپەلی سەرپشتی حەیوانان ئەوترێ کە بەواتا خوازەییەکەی بێ دەستەڵات ئەگەینێت، زیاتر بۆ سوکایەتی بەکاردێت.
(٢) واهیمی بەستە:
بەستە: هیچ وەک ئەوترێت هیچی تیا بەستە نییە.
بەستە: لەگەڵ وشەی واهیمی بەسەریەکەوە دات ئاوێتەی وەهم و خەیاڵە ئەمە هەر ئەوە ئەگەێنێت، لەسەر بنچینەیەکی نابووتە.
(٣) خەڕۆنابم: دەستخەڕۆنابم، هەڵناخەڵەتێم.

– بەستە: کورتەیەکی تیژ و خێرای سەندنەوەی گۆرانییە کە لە دوای مقامات دێت و جۆرە ئاوازێکی بەجۆش و خرۆشی تیایە.

(٤) حەیران: لێرەدا بەواتای مەست و خامۆش و دۆش داماوی دێت.

(٥) گورگێکی دەم بەستە: لە هەندێک شوێنی کوردستان تا ئێستەش باوە کە ئاژەڵێک لە دەشت و کێو وێڵ و ون ئەبێ و لای کەسێکی ئایینی دوعای دەم بەستی گورگی بۆ ئەکەن... تا گورگ نەیخوات، لێرەدا درکەیە بۆ کەسێکی سروشت دڕندە، بەڵام لەوساتەدا دەستەڵاتی نییە و ناتوانێت خراپە بکات وەک گورگە دەم بەستراوەکە.

(٦) خەستە: نەخۆش...

***



ڕەنگی زەردم باعیسی هیجرانی لێوی ئاڵتە
ئەشکی سوورم واسیتەی برژانی چاوی کاڵتە
بەسیەتی وا مەمکوژە جانا بەداخ و دەردەوە
بێنە دەورە جامێ مەی تا ڕۆژی دەست و باڵتە[1]
کەی ڕەوایە مەنعی گوڵ تووبیخوا لەم بولبولە
سەیری تەوقی گەردنم تەسلیمی وردە خاڵتە
دڵ کە ئیرسی سووتنە مەجبووری تۆیە لێی گەڕێ
با بسووتێ عاشقی دیدار و کوڵمی ئاڵتە[2]
حەیفە وا بێ مەیلی تۆ دەرحەقی (ئەسعەد) شاهی من
خووا ئەزانێ خادیمێکی بێ غەش و عەواڵتە[3]

١٩٣١

(١) بێنە دەوەرە: ساقی وەرە بازنگە و خول و دەورەکەوە تا جامی مەی بگات بەشاعیر..

(٢) ئیرسی سووتنە: بەشی و قسمەتی سووتانە...
سووتان بەمیرات بۆی ماوەتەوە.

(٣) عەواڵتە: شەیداتە... وێڵە بەدواتا.

***

بەشـیـرینی وتی: کـۆکـەن، دڵم خـۆ مـوبتـەلای ڕووتە
لە نادی عـاشـقانا، بێ کەسێکی دەست و پێ ڕووتە[1]
لەگـەڵ ئـەگـریجـەیی زەردا، شـوعـاعی پلـپـلـەی زێڕی
لەچاوی دام و عـەرزم کـرد، ئـەمـە هی پلـپـلـە و مـوتە
وتی: سـەرسـامـی، تا من بم، نیـیـە شـوعلە لەمـەیدانا
ئەڵێی شـێت و دەبەنگی تۆ، وتەی وا، پیـشـەو خـووتە
لەبن جـامـەی کـەتانا کـەوتە دەر، دوو سـێـوی بێ وێنە
تەماشا تیشکی ڕۆژ و مـانگ، لەسینەی داوەتن جووتە
بەدوو برژانی مـەسـتی، تیـرەبارانی دڵی کـردم...
وتم: مـەیکوژە، ئەم پیرە؛ غـوڵامی خاڵی گـیسـووتە[2]
وتی: زۆرە غـوڵامم؛ عـەبدی خـوێری و بێ فـەرم ناوێ
نەبوو، ڕەحـمێ بەحـاڵی کـا، ئەزانێ عـاشـقی ڕووتە[3]
مەرامم زەحمـەتە؛ لەم گێتییـە، حاصڵ ببێ (ئەسعەد)
ڕەقیب و مودەعی، هەردوو لە بۆ بەختی، بەدم؛ جووتە[4]

١٩٧٠

(١) کۆکەن: ئەی فیتنە گێڕ... گێڕە شێوێن.
– موبتەلا: ئالوودە، هۆگر، پابەندی جوانی تۆم.
(٢) گیسوو: لێرەدا مەبەست لە ئەگریجەیە.
(٣) لێرەدا وشەی عاشقی ڕووتە: ڕەگەزدۆزی تەواوە و بەدوو واتای بەنرخ دێت و هەردووکیشی لەگەڵ سەرجەم واتای بەیتەکەدا گونجاوە (١) عاشقی ڕووتە: عاشقی ڕووە جوانەکەتە. (٢) عاشقی ڕووتە: تەنیا و تەنیا عاشقێکی بێ غەل و غەشە.
(٤) شاعیر لە دوا شەتری ئەم قەسیدەیەیدا تەواو گلەیی لە بەختی ڕەشی خۆی ئەکات و ئەڵێ: ئەوەتا ڕەقیب و ناحەزم لەگەڵ یارەکەمدا کە مودەعیە لە سەرم و من ئەوم ئەوێت و ئەو منی ناوێت، هەردووکیان یەکیان گرتووە.

***



قـوڕ بەسـەردا با بکەین ئێـمـە لەناو ئەم نەگـبـەتە
پڕ بەئەرز و ئاسـمـان دوخـانـی کـوفـر و ظوڵـمـەتە[1]
هەوری بێ دینی لـەناوا ڕۆژی لێ کـــردینە شــەو
شەشدەری گرتووە بەجارێ ڕێی نەجاتی زەحمەتە[2]
شـێخ و دەروێش و مـەلا، کـەوتوینە گـێـژاوی بەڵا
(قـل هوالله أحـــد) بگرە دەسم لەم زەحـــمـــەتە
وا بە(الله صـــمـــد) پەنهـــا ئەبەم یا (لم یلد)
هەم (ولم یولد) خـووا ئەم کـاتە کـاتی ڕەحـمـەتە
یەعنی (یا من لم یکن لە کـــفـــوا أحـــد)
لوطف و ڕەحـــمم پێ بکە ئەم ڕۆژە ڕۆژی هیـــمـــەتە
ڕوو لە قیبلەی (مصطفی) یارەبی (ئەسعەد) لانەدەی
تاکـو ڕزگـاریم ئەبێ لەم گـێـتـیـیـەی پڕ مـەینەتە

١٩٣٧

(١) دوخانی: دخان: دوکەڵی.
– ظوڵمەنە: زوڵمەتە: تاریکییە.
شاعیر زانایەکی شارەزاو بەتوانای ئاینی بووە و لە زانستی کەلام و فەقهو، شەریعە و تەفسیر لە پلەیەکی بەرزدا بووە، سەرەڕای ئەوەی ڕۆشنبیرێکی سەردەمەکەی و ئاگاداری مێژووی سیاسی کورد و گەلانیش بووە... ئەو زانست و زانیاریانەی هەیبووە، لە شیعرەکانیدا تەوزیفی کردووە و پابەندی هونەری هۆنراوەی کلاسیکی کوردی بووە و لە بواری ڕەوانبێژیدا ڕووی لە هەموو بابەتەکانی کردووە و تا ئاست و ئەندازەیەکی سەرکەوتووش مەبەستی پێکاوە... لەم شیعرەیەدا پەنای بۆ هونەری گوزارەبێژی خانەی تێلنیشان (تلمیح) بردووە... سورەی (قل هو الله أحد)ی قورئانی پیرۆزی دیاری کردووە و زۆر شارەزایانە بەکاری هێناون گرنگ لێرەدا ئەوەیە تێلنیشانەکە بەزمانی عەرەبییە و ئاوێتەی شیعری کوردی کردووە، لە ڕووی سازی مۆسیقای شیعرییەوە تەواو گونجاندویەتی و ئەمە گرنگە.
چونکە گەر تێلنیشانەکە واتە ئەوەی وەرگیراوە کوردی، بوایە، ئاسانتر خۆی بەدەستەوە ئەدا.
(٢) شەشدەر: شەش لا: سەر و ژێر، پاش و پێش ڕاست و چەپ واتە جگە لە چوار دەور، سەروژێریشم لێگیراوە.

وەرە ئەی دڵ عەزیزم دەس لەدەس ئەم گێتییە بەردە
نەتیجەی کۆشش و کارت هەموو هەر داخ و هەر دەردە
چییە ئەم حاڵە وا عالەم نییە ڕازی بەحاڵی خۆی
بەکامی نا بەکامە ئەم کوتانە ئاسنی سەردە
لە هەر لا سەیر ئەکەم وا بوونە جانی، عالەمی ئێمە
وێران بێ ئەو وڵاتە جەردەخانەی دەورەکەی بەردە[١]
لە ئەرزی نیشتمانیدا نەبوو خۆشی ببینم قەت
شەوە کابوسە ڕۆژم ڕەش دڵم وەبیێکی پڕ دەردە[٢]
هەموو عومرم بەتاڵی گێژەڵووکەی نەگبەتی بردی
نەجاتی دە فەلەک «ئەسعەد» لەناو ئەم تۆز و ئەم گەردە

(١) ئەشێت شاعیر ڕابەرێکی ڕاستەقینەی سیاسی بێت و هەڵگری مەشخەڵێکی بیر ڕووناک بێت و ڕێگای شەوەزەنگ ڕۆشن کاتەوە، شاعیر لەم قەسیدەیەیدا ئەو ڕێبازەی گرتووە و مێژووی لە دایکبوونی هۆنراوەکەی شایەتی بۆ پەشێوی و کاسەلێسی خەڵکانێکی ئەو قۆناغە ئەدات.
ئەوەتا لە صدری ئەم بەیتەدا بەم هەناسەی داخ و خەفەت هەڵکێشانەوە ئەڵێ: سەیری هەر لایەکی وڵات و خەڵکەکەی ئەکەم هەموو وەک جانی: کەسانی زاڵم و دزێو و دەست درێژ بۆ ماڵی ئەم و ئەویان لێهاتووە... دیارە ئەمە جێگای مەخابنە لەناو کوردا قۆناغی ڕەشی ئەوتۆ پەیدا بێت.
(٢) دڵم وەبێکی پڕ دەردە: دڵم بەدەست وەبی و زیانەوە پڕ دەرد و ئازارە... زۆرجار لە سلێمانی ئەوترێت بێ وەبی بیت: واتە خوا لە خراپە و بەدکار بتپارێزێت.

***



ڕووانیمە لەبی غونچە وتم: ڕەنگی بەهارە!
عاجز بوو وتی: خوێنی دڵی بولبولی زارە
تەفسیری (ألم نشرح)ی سەقفی سەری سینەی
موحتاجی موطالآیەکە بێ عەددو شومار[١]
ئەم زەردییە وا ئێستەکە ئەفشانە بەڕووما
داخ و غەمی دووری قەد و هەم قامەتی یارە[٢]
سەیریکە لە پڕ جیلوەییدا بەرقی جەمالی
سووتا جگەر و گەردنی (سەد)دا لە قەنارە[٣]
چاری دڵی (ئەسعەد) نییە جانا بەپزیشکان
جنراوی دەمی شیری بڕۆی حەزرەتی یارە[٤]

١٩٣٦

(١) ألم نشرح: ئەمە سورەتێکی مەزنی قورئانی پیرۆزە و شاعیر وەک هونەری تێلنیشان (تلمیح) لەم بەیتە شیعرییەدا بەکاری هێناوە.
- موتالا: موطالا: مطالعە: خوێندنەوە و پێداچوونەوە.
- بێ عەدد و شومارە:
عەدد: ژمارە
شومارە: ژمارە
واتە بێ ژمارەیە و لە ژماردن نایەت... ئەمە بۆ موبالەغەی زۆری بەکاردێت.
(٢) ئەفشانە بەڕووما: دیار و ئاشکرایە بەڕوومەوە.
(٣) جیلوە: لێرەدا بەواتای شەقی دایەوە.
- بەرق: بروسکە... تریشقە...
- بەرقی جەمالی: جوانیی ئەبریسکایەوە.
(٤) وەک پێشتریش ئاماژەی پێکرا... شاعیر گرنگیەکی یەکجار زۆری هونەری شیعری (جوانبێژی و ڕوونبێژی) داوە بەتایبەت لە ساڵانی سییەکانی سەدەی بیستەمدا... ئەم بەیتە نموونەی ئەو بۆچوونە دەرئەخات بەتایبەت لە ڕووی وێنەی شیعری نایاب و دەگمەنەوە کە ئەڵێت.
(جنراوی دەمی شێری بڕۆی حەزرەتی یارە) لەم شەترەدا وێنەیەکی شیعری بزوێن و سرکی پێشکەش کردوین ئەوەتا دڵی لە بری ئەوەی بکرێتە قیمە، کەچی بە شیری بڕۆی حەزرەتی یار هەنجن هەنجن کراوە... تەنانەت شاعیر ئەمەندە لەگەڵ ئەو یارەیدا ڕاستگۆ و دڵسۆزە پاش ئەوەی دڵی ئەجنێ هەر بەحەزرەتی یار ناوی ئەبات.

هەچی چەوت و چەوێڵە، ئێستەکە بوونە کوڕی سەورە
وەکو (هایم) سەرم سرما لە خواری ئەم بەڕوو دەورە[1]
بەلەرزە هاتووە، ئەندام و جومگە و پێست و ئێسقانم
نییە چاری بەلوقمان و ئەرەستۆ و خالقی گەورە[2]
لە زستانا نەبوو باران و بەفر و وەیشوومە و سەرما
عەجیبم دێ لە هاوینا ئەبارێ تەرزە بەمجۆرە
لە هەستیم، چەشتن و بیستن، ئەوا ڕۆیی نەما بۆنیش
لەبەر پیسی و، درۆ و بۆگەن، تەماشا چەرخی ئەم تەورە[3]
بەمەرگ ئاواتە خوازە (ئەسعەد)ی داماو و سەرگەردان
پەرێشان و سەراسیمەم، بەدەس هۆزی بەدو چەورە

١٩٧١

(١) کوڕی سەورە:
ثورە: شۆڕش: مەبەست لەوە، دوای ڕێکەوتنامەی ١١ی ئازاری ١٩٧٠ی نێوان شۆڕشی کوردستان بە ڕابەرایەتی بارزانی مستەفا و حکوومەتی عێراقی... زۆر هەلپەرست و کاسەلێس و تەنانەت پیاو نۆکەری ڕژێمی بەعس سنگیان دەر ئەپەڕان و خۆیان بەناوی پێشمەرگەوە بائەدا.
(٢) لقمان: مەبەست لە لوقمانی حەکیمە و پزیشکێکی بەناوبانگی سەردەمی خۆی بووە.
– خالقی گەورە: خودای مەزن و پەروەردگارە.
(٣) لەم بەیتەدا شاعیر پەنای بۆ بەکارهێنانی هونەری شیعری پێچەوپەخش – لف و نشر – بردووە کە چەند وشەیەک لە شەترێکی بەیتەکەدا بەکار ئەهێنێت و لە شەتری دوایی هەمان بەیت واتاکەی بەڕوونی و مەبەستەکە بەدەستەوە ئەدات بەکارهێنانی ئەم هونەرە هوشیار و شارەزایی دنیای ڕەوانبێژی و زانستی زمان و هونەری شیعری ئەوێت... ئەوەتا لە (صدر)ی بەیتەکەدا ئەڵێ: لە هەستیم: چەشتن و بیستن و بۆن دیاری ئەکات کە هەرسێ وشەکە بۆ خۆیان خواستن:
چەشتن: چێژە، بیستن: قسەبیستنە، بۆنیش... بەلووت هەست پێ ئەکرێت... شاعیر لە عجزی بەیتەکەدا قفڵەکەی کردۆتەوە: پیسی بەرامبەر چەشتن، درۆ بەرامبەر بیستن، بۆگەن بەرامبەر بۆنە... بەمەش هێزی بەشیعرەکە داوە

***



## ئامۆژگاری

عیلمی بێ عەمەل داری بێ بەرە
پیاوی خۆ هەڵکێش، بەڕاستی کەرە[*]
گاڵتەچی عالەم، زۆر بێ قیمەتە
ڕوو ڕەش و ڕیسوا، وابێ هیمەتە
نانی جۆ بخۆ، مننەت بار مەبە
چاوڕەش و سەرکز، دەردەدار مەبە
مەچۆرە شوێنێ ڕووت لێتاڵ بکەن
وتەت پێبڵێن، چاوت کاڵ بکەن
چیت چنگ ئەکەوێ، هەمووی خەرج مەکە
جلی پارە پیس قەت لەبەر مەکە

١٩٧٣

(*) شاعیر ناونیشانی بۆ ئەم شیعرەی داناوە و بەناوی ئامۆژگارییەوە، بڵاوی کردۆتەوە...
لەسەرتاپا هەریەک لەم بەیتە شیعریەیدا هونەری تێلنیشان (تلميح)ی بەکار هێناوە و پەنای بۆ: پەندی پێشینان، قسەی نەستەق، وتەی بەنرخ بردووە و لە چنینی هۆنراوەکەدا تەوزیفی کردوون و ئەرکی واتا بەخشین و مەبەستی شاعیری پێ سپاردوون.

***

تا بمێنێ ناوی ئێمە گوڵ لە باغمدا گەشە
ئەو کەسەی خائین بەکوردە ناتەوان و ڕوو ڕەشە[*]
دەستی من دامانی ئێوە بێ حەیایی بەسیەتی؟
ئەو کەسەی شیرینە خوڵقی گەورە و خاوەن بەشە
بووینە قەشمەر جارەکانی عالەمی ڕوویی زەمین
پول پەرستی بەسیەتی ئەو مەردە مەردە، بێ غەشە[1]
ڕۆژێ پیاوی ڕۆژهەڵات و ڕۆژێ ڕۆژ ئاوا پەرست
بێ تەصەوور حوکم ئەکەن بەو مەبدەئانەی پڕ غەشە
بۆ خراپی و یەک کوژی و ئاخر شەڕی ئامادەیە
ئەم گەلە چییکەی ئەوێ (ئەسعەد) هەموو سەر بەهەشە[2]

١٩٦٧

(*) لەبەر ڕۆشنای کاتی هۆنینەوەی ئەم هۆنراوەیە و شیکردنەوەی ناوەرۆک و مەبەستی شاعیر... ئەوا ڕوون و ئاشکرا دیارە مەبەستی ئەو ساڵانەیە شۆڕشی ئەیلول و بوو بەدووباڵەوە و دوو بیرو بۆچوون و دوو هەڵوێستی جیاوازی لێکەوتەوە... شاعیر لەلایەک بەورەیەکی بەرزەوە بڕوای بەکورد و قەزییەکەی و سەرکەوتنی مەسەلەکەی هەیە و لەولاشەوە دڵتەنگ و نیگەرانە؛ بەوەی هەندێک وایان لەخۆیان کردووە ببنە قەشمەری جار واتە گاڵتەجاری دنیا بۆ جاه و پارە خۆیان فرۆشتووە.
(١) هەردوو وشەی (مەرد) ڕەگەزدۆزیان پێکهێناوە یەکەمیان مەبەست لە مرۆڤەکەیە وەک ناو دووەمیان بەواتای مەردی و جوامێری هاتووە و ئاوەڵناوە.
(٢) هەموو سەر بەهەشە: هەمووان چارەو بەخت ڕەشن...



ناوی جگەرم دایمە پڕ خوێنی مەراقە
ئێشی دڵەکەم چاری نییە دەردی فیراقە[1]
دەرمانی وەرەم ئەصڵی نییە غەیری ویصالی
گوفتاری عەدو خۆشی نییە عەینی سماقە
عەقڵم وەکو ماڵێکە کە بێ خاوەن و کەس بێ
وا چوڕی بڕی ئەو صەنەمەی نایەوە فاتە[2]
حوکمی قەرەقوش جان و دڵم بەسیە هەتاکەی
دنیا کە وەکو فاحیشەیە چاری تەڵاقە
(ئەسعەد) لەغەما (الفی) قەدی چەوتە وەکو (نون)
ئەحواڵی لە بەندایە برا حەپسی عێراقە

٢٠ی تەمووزی ١٩٤١

(١) باوکم (مەلا عەزیزی مەلاخالد) فەرمووی کاکم (مەلا ئەسعەدی مەلا خالدی مەحوی) بەهۆی چالاکی سیاسی و کارکردنی لە حزبی برایەتیدا، خەبەریان لێدا و گیرا، هەروەها فەرمووی باوکم (مەلا خالد) وتی: عەزیز، ئەسعەد لە حەویجە بەندکراوە بڕۆ سەردانی بکە، کە چووم هاوینێکی گەرم بوو کاکم بەوەزعێکی زۆر ناخۆش بینی جلی گونیەی لەبەردا بوو... بەپەلە هاتمەوە سلێمانی وەزعەکەم بۆ باوکم گێڕایەوە... تا هەوڵبدات بەپارە یاخود واسیتە ئازادی بکات.
شاعیر ئەو پارچە شیعرەی لەو کاتە تەنگ دڵ پڕ لە ئازارەدا هۆنیوەتەوە... بەڵام وەک لە بەیتی چوارەمدا دەرئەکەوێت، ورەی بەرزە و بڕوای بەعەدالەتی خەباتەکەی هەیە.
(٢) ئەو صەنەمەی نایەوە فاقە: ئەو بتە مەبەست لە کەسێکی بێ دەنگ و ماتە... کە چۆن داوی بۆ گرتنی شاعیر و ئاوەڵەکانی ناوەتەوە، لەم بەیتەدا بارودۆخی خۆی و حزبی برایەتی دەرئەخات کە چۆن بێ خاوەنن و کەس نییە لەسەریان هەڵبداتێ کەسێکی نا دروست کە وەک بت وابووە کەوتۆتە گیانی نەتەوە پەرستانی تێکۆشەر و زۆربەی هەرەزۆریانی بەگرتداوە.

## له كونجى نامورادى

عەزیزم؛ پاكی ئەندامت؛ زبان و سینەیی پاكە
پەنا بەخوا، له پێشیشا؛ ئەڵێی سپڵۆكی سەر لاكە[١]
خووا؛ ساپێم كەرەم فەرموو؛ زمانێك و دڵی زاكیر
ئەوی وایه، له هەردوو لا؛ بزانه مەردی بێ باكە[٢]
له بابی دووزمانیدا، گەلی ئێمە نییە، وێنەی
هەتا چەوت و درۆزنبێ، سیاسی و مەردی چالاكە
وەكو مارن، بەدەم دوپشكی كلكیشن
بەشی زۆری سڵ و ترسم، لەوانه پێم ئەڵێن: كاكە
له دەشتی بێ كەسیدا، مودەتێك ئاواره بوو (ئەسعەد)
له كونجی نامورادیدا، لەگەڵ غەم، ئێستە وا خاكە

١٩٥٠

---

(١) خود، بوونێكی هەمیشەیی له فەزای شیعرەكانی شاعیردا هەیه، ئەمەش هەر له خۆوه قووت نەبۆتەوه و هەڵوێست و بڕوا بەخۆ و ڕاستی مەسەلەی شاعیر ئەسەلمێنێت.
– سپڵۆك: چوارپێیەكی پیس و گڵاوه، زۆرجار بەسەگیش ئەوترێت.
– لاك: لاشەی حەیوانی مردوو... فڕێدراو.
(٢) دڵی زاكر: ئەو دڵەی هەمیشه یادی خوای خۆی ئەكاتەوه.

***



ئەی ڕەقیبی ناپەسەن مەدحێكی قینم بۆ بكه
بۆیە ئوستادی درۆ، تەعریفی دینم بۆ بكه[١]
سەكتەیی قەلبم نزیكه، بولبولی هاو دەردەكەم
تۆ گوڵی سوبحی سەحەر مەستانه شینم بۆ بكه[٢]
من له بۆ داماویی خەلق و، تۆ له بۆ داماویی من
ئاهی من ناڵێنی تۆ، حەربێكی چینم بۆ بكه[٣]
وا لەگەڵ پیری تەریقەت حەزرەتی پەروانەكەم
بۆ مەكۆینوور، برا ناڵەو ئەنینم بۆ بكه[٤]
چونكه هامرازی نهێنی ئەسعەدی بێ چارەیی
تەرجومەی حاڵی حەیات و باسی ژینم بۆ بكه

---

(١) گڕكانی عەشقی سەرمەدی پاك وا له شاعیر ئەكات دڵ و دەروونی جێگای قینی تیا نەبێتەوه، قین وێنەی جوان و ناسك ناهێنێته بەرهەم و تۆوی خۆشەویستی ناوەشێنێت... ئەوانەش خەسڵەتەكانی شاعیره... لەم بەیتەدا شاعیر داوا له ڕەقیبی ئەكات كه دڵی بەرامبەری پڕ له قینه باسێكی ئەو دەرده كوشندەیه بكات و بزانێ ستایش هەڵئەگرێت؟... بۆیه هەر بەڕەقیب ئەڵێ: تۆ بویته مامۆستای درۆكردن و درۆ باش ئەزانی و تەنیا هیچ له بارەی دینەوه نازانیت.
(٢) سەكتەیی قەلبم نزیكه: خەریكه دڵم ئەوەستێ.
(٣) ئەوەی شاعیر ئەیڵێت: حەربێكی چینم بۆ بكەم مەبەستی ململانێ و شەڕی چینایەتی نییه، بەڵكو مەبەستی لەو شەڕی وڵاتی چینه– صین–ه.
(٤) كۆینووره: لێرەدا مەبەستی ئەو قسڵە كاتێك ئاوی بەسەردا ئەكرێت لەبری بكوژێتەوه، تازه بەتازه گیزه گیز ئەكات و كەفی سووتاندن دەر ئەكات... ئەمه لەگەڵ ناڵە و ئەنین گیزه گیزەی دەنگی سووتاندنی قەسڵەكەدا ئەگونجێت وێنەیەكی نوێی شیعری پێشكەش كردووین.

***

ئەگـــەر خـــاوەنی ژیریی ئەی نەفس، دوژمن بەیارتکە
لغـاوی بێ شـعـوری بگرەوە ئیـصـلاحی کـارت کـە[*]
ئەوی چاکی نەوێ بۆ خـۆی نیـیـە چاکی لە بۆ خـەڵکی
کـە دەسـتی دونیـەوی کـورتە وتەی شـیـرین لەزارتکە
ببـینە خـان و مـانی عـالەمی بێگانە کـە چۆنە
بەنزمی خـۆت ئەزانی ئەی برالە سـەیری شـارتکە
لە(جو) کەمتر لە(لۆتی) پیس و بەد فەڕ تر ئەبینی خۆت
سـەری شـەرمندەگی داخـە خـەیاڵی عـەیب و عـارتکە
با نەکـا کـەس چاوەڕوانی کـاسـەیی ناکـەس لە دنیـادا
خـواردنێکی گـەر (طفـیلی) بێ وەرە تۆ زەهری مـارتکە

١٩٥٥

---

(*) شـاعـیـر لەم پارچە شـیـعـرەیدا بێ ئەوەی لەسـەر وشـە و زاراوە دابمێنێ... سـەروایەکی کـەم وێنەی لە بەیتی یەکەم و عجزی بەیتەکانی دواتر بەکارهێناوە ئەویش:
(ی+ یارتکە، کارتکە، زارتکە، شارتکە، عارتکە، مارتکە)ەیە.
وشەکان ئاوەڵناو و ناوی تیایە و جگە لە پیتی (ی+ ت+ کە) ئیدی پێشگرەکان ناو و ئاوەڵناوی گـۆڕاون ئەمەش بۆ مـرۆڤی بەهرەدار و شـارەزای کـێش و سەرواو مـۆسـیـقـای شـیـعـری نەبێ، هەروا سووک و ئاسان نییە، لەسەر تاپای بەیتەکاندا زمانێکی ئاسان و ڕەوان و کێشێکی سەرکەوتووی پڕ بەپێستی ئاوازی شیعرییەکەیە.

***



پاکی گـومـانت با نەبێ ئەی دڵ خـەیاڵی کـەس مـەکـە
بێ شوماره ناکەسی، سا روو لە مالّی کەس مەکە[*]
پیـاوەتی ناوی نەمـا لەوسـاوە قـانوون هاتە ناو
حوکمی حەق دەس ناکەوێ باوەڕ بەحاڵی کەس مەکە
زەمـزەمـەی مـەحشـەر نەبێ عـەهد و وەفـا دەرناکـەوێ
ڕوو سیـاهی هەردوولا، سـەیری جەمـاڵی کەس مـەکە
ڕوو پەڕەی عیلمی سیاسی موشکیلێکە حەل نەبوو[1]
زەرعی کـرد تۆوی درۆ بیـری کـەمـاڵی کـەس مـەکـە
حورمـەت و چاکی و شەرەف ئەمـڕۆ لەگۆشی عـەزلەتە
گەر ئەمانەت پێ ئەوێ (ئەسعەد) خەیاڵی کەس مەکە

١٩٥٧

---

(*) شاعـیر لەم پارچەیەشدا هەمان لایەنی هونەری پارچە شیـعری (ئەگەر خاوەنی ژێریی ئەی نەفس، دوژمن بەیارتکە)ەیە و جوانیەکی هونەرانەی بەشیعرەکە بەخشیوە.
(١) ڕووپەڕەی عـیلمی موشکیلێکە حەل نەبووە: واتای ئەم شەترە شیعریە، دوو دڵی شاعیر بەرامبەر بەکەسانی سیاسی دەرئەخات، ئەم ڕەئییەش لەو نسکۆیەوە هاتووە کە ساڵی ١٩٤٢ لە سەردەشت، شاعیر دووچاری بووە...
خۆی لە ڕاستـیدا دنیـای سیـاسەت وەک زانست و هونەر و ویژدان و تێکۆشان، ڕۆژ لەدوای ڕۆژ تیوور و بۆچوونی نوێی بۆ ئەدۆزرێتەوە

***

ئاگری سینەم عەزیزم سێوی سەر گۆنایەکە
داغی جەرگم خاڵی لێوو گەردنی مینایەکە[*]
نەشتەری برژانە وا خوێنی حەیاتم بەر ئەدا
بادەیی دووبارەکەم دوو نێرگزی شەهلایەکە
دڵ لە تەشریحی خەیاڵە عیلمی چەقمینی هەبوو
ئێستە نادانی ترنجی غەبغەبەی لەیلایەکە[(١)]
بۆ دەوایی زامی چاوم تۆز و گەردی ڕێگەکەی
دولبەری قەد عەرعەری خۆش لەهجەو زیبایەکە[(٢)]
گەهـ لە دووری یارە (ئەسعەد) گەهـ لە تەعنی دوشمنان
بوومە دێوانە بەدایم ڕووم لە دەشت و جایەکە[(٣)]

١٩٢٦

---

(*) ئەم پارچە شیعرە یەکێکە لەو هۆنراوانەی شاعیر لە سەرەتای لە دایکبوونی شیعرەوە وتوویەتی... وەک پێشتر ئاماژەم پێکر... مرۆڤ لە شیعرە سەرەتاییەکانی شاعیر بەتایبەت ئەوانەی لەپێش ساڵی ١٩٤٠ پێشکەشی کردوون... وەک دیاردەیەکی سەرنج ڕاکێشەر هەست بەهێز و پێز و تۆکمەییەکی هونەریی شیعری زیاتر تیا ئەکرێت، زمانەکەی پاراوە و کێش لەنگەرگرتوو، مۆسیقا هاودەم و هاوسازی کێش و سەروا و واتای شیعرەکەیە.
– گەردنی مینایەکە: واتە گەردنی وەک شووشە سپیی و ڕوونە، ئاو بەگەرویدا بڕواتە خوارێ دەر ئەکەوێت، ئەمە بۆ پیا هەڵدانێکی یەکجار قەبەیە و وشەکەش بۆ خۆی لە بواری ڕەوانبێژیدا لێکچوونەو ئەوزاریش ڕوونی و بێ گەردی و سپێتیە.
(١) شاعیر لە پەراوێزی ئەم شیعرەیدا و لە دەفتەری ژمارە چواردا، دەربارەی: (عیلمی چەقمینی) نووسیویە ئەڵێ: عیلمی چەقمینی عیبارەتە لە عیلمی فەلەکیات و لێیان ئەدوێ.
واتای ئەو شەترە هەر هەمان لێکدانەوەی شاعیر ئەبەخشێت.
– ترنجی غەبغەبەی: غەبغەبە: گۆشتێکی بەر چناگە و شۆڕبۆتەوە.
ترنجی غەبغەبەی: ئەو گۆشتەی بەر چناگەی لەبەر شلو ملی چین لەسەر چینە.
(٢) عەر عەر: دارێکی باریک و ڕێکوپێکە، زۆرجار قەد و باڵای یار بەدار عەر عەر ئەچوێنرێنێت.
– زیبا: جوان، قەشەنگ.
(٣) جایەکە: مەنزڵ و شوێن و جێگایەکە.

***



هەتا قامەت هەر ئەمانە (یا حبیب اللّه)
لە حەشریشا ئەمان و هەر ئەمانە (یا حبیب اللّه)[(١)]
ئەمان چونکە مساوی ناوی پاکی حەزرەتی تۆیە
ئەنامت زیکریان دایم ئەمانە (یا حبیب اللّه)[(٢)]
لە دنیاش و لە عوقبا پشتیوانی ئوممەتی خۆتی
سەگی دەربان و بانی تۆم ئەمانە (یا حبیب اللّه)[(٣)]
وەفاتت نووستنە نەومت شفاعاتی گوناهباران
هەموو کاتێ کەوا بوو هەر ئەمانە (یا حبیب اللّه)
لە خانەی (الأمانا) عاشقی بێچارە داماوە
ئەمان (ئەسعەد) ئەمان و هەر ئەمانە (یا حبیب اللّه)

١٩٤٥

---

(١) قامی قیامەت: ڕۆژی دوایی، ڕۆژی حساب و قیامەت.
– (یا حبیب اللّه): خۆشەویستی خودا، مەبەست لە پێغەمبەری نازدارمان محەمەد مستەفایە (د.خ).
– ئەمانە: ئەمان: لە زۆر شەتری بەیتەکان و سەرجەم (عجز)ی بەیتەکاندا دووپات بۆتەوە و ئەم وشەیە، جێگای زاراوەی گرتووە و بەواتای: هانا بۆ بردن و داواکاردن لە خودای مەزن بەفریا بکەوێت پێغەمبەر (د.خ) هۆ و واستەی ئەو شەفاعەتەیە.
زۆرجار وشەی ئەمان: بەواتا هاوارە، دەخیلە بەفریاکەوە دێت.
– لە حەشریشا: مەبەست لە ڕۆژی قیامەتە کە ڕۆژی لێپرسینەوەیە لەبەردەم خودای میهرەباندا.
(٢) ئەنامت: ئەنام+ ت مەبەست لە ئەندام کۆیە ئازای بەدەن... لێرەدا ئەو واتایە ئەبەخشیت: هەموو ئازای بەدەنی هەر ئەمانە و بانگکردنی و هاوار بردنە بەر هەموو ئەندامی جەستەی پێغەمبەر (د.خ) هەر هەموو بەفریاکەوتن و بەدەمەوە هاتنی لێ قەوماوانە.
(٣) عوقبا: ڕۆژی سزاو لێپرسینەوە، ڕۆژی قیامەت.

بەخوێنی ئاڵی جەرگم؛ شێخم؛ نوسیوومە نامە
(اني لقد مَزّقْتُ من بعدك القيامة)[1]
(من كثرة الفراقِ منيتي قد جاءت)
(انظر الى عينتيّ لَكي تري العلامة)
لە عالمێکم پرسی ڕەوشتی لەیلا وتی:-
(مَنْ سئل البديهي ليس لة الفهامة)
هانفی غەیبی ئەڵێ: لە ئاسمان نوسراوە
(واللّه ما وهبنا حباً بلا مة)
حاڵی دڵی (ئەسعەدی) بێکەس و غەمبار ئەڵێی:
(كالشمس من غروب تدخل في غمامة)

١٩٢٤

---

(١) ئەم پارچە شیعرەش، لە شیعرەکانی سەرەتای ژیانی شاعیرێتی شاعیرە، ئەگەرچی لە شێوەی نامەیەکدایە و بۆ شێخی نووسیوە... نا نزانرێت ئەو شێخە کێیە؟... شێخ مەحموودی حەفیدە کە لەو کاتەدا شۆڕشەکەی دووچاری تێکشکانی سەربازی و سیاسی بووە... یان مەبەستی شێخ بابا عەلی و شێخ لەتیفی کوڕانی شێخ مەحموودە کە هەردووکیان ئاوەڵ و هاوڕێی شاعیربوون.
هەروەها لەم شیعرەدا هەست بەوە ئەکرێت شاعیر بەهرە و توانای خۆی لە بواری شیعردا تاقی ئەکاتەوە ئەشبێت بیەوێ بزانێت چۆن بەزمانی عەرەبی شیعر بهۆنێتەوە و تیایدا سەرکەوتووە و واش بەباش زانرا شەترە عەرەبییەکان بۆ کوردی وەرنەگێڕین و بۆ خوێنەری بەجێ هێڵدرێت.



نەگبەتی من وا نیشانەی هۆزی نەگبەت بارمە
بەختی شوومی تیرەکەم کردەی دەسی سەرکارمە
بۆ ئەسیری نیشتمانی مژدە بێ ڕۆژی جەزا
ئاگری کوورەی ئەجەل تاجی سەری سەردارمە
هەر لەتاوی بێکەسی تۆیە وەتەن دڵ ئاگرم
وەلوەلەی مەحشەر نموونەی دەنگی گریەو زارمە[1]
هێندە حەسرەتناکتم گیانە ئەڵێم باوەڕ بکە
ئەم تەمەی کەوتە سەما ئاهی دڵی غەمبارمە[2]
لالە ڕەنگی (ئەسعەدا) شاخ و زەوی ئێمە چییە
ڕەنگی خوێنی بێ نەواوو جەرگەکەی بیمارمە[3]

١٩٣٦

---

(١) وەلوەلە: هات و هاوار، هەراو هۆریا.
- وەلوەلەی مەحشە: هەراو زەنای ڕۆژی لێپرسینەوە.
(٢) سەما: ئاسمان.
(٣) لالە: گوڵێکی ئاڵە... لەم شەترەدا لالە ڕەنگ بەواتای ڕووی ئاڵ و سووری شاعیر... ئەوە لە خۆشیدا و لە کەیف و بەزم و ڕەزمی شادیدانییە، بەڵکو ئەو ڕەنگە ئاڵەی ڕەنگی خوێنی هەژاران و داماوان و بێ دەستەڵاتەکان و جەرگی برینداری شاعیرە.

دڵ بەتیری غەمزە و نازی بوتەن بیمارمە
سەر لە ڕێیدا کەوتووە بۆ بەردەبازی یارمە[(١)]
سەومیعە بەر ناکەوێ جانانە خوطبەی تیائەدا
کوشتن و عاشق کوژی بڕیار و خووی دڵدارمە
سەیری کەن هەڵیاوەسی جەرگم بەقولاپی موژەی
بوو بەقەساب و عەزیزم موشتەری ئەغیارمە[(٢)]
بۆ وتەی بێگانە گیانە ڕووی گرژم تێمەکە
شێخی سەنعانم دیارە زوڵفەکەت زەننارمە[(٣)]
دەعوەتی عاشق ئەکەم ئەمڕۆ بەکۆمەڵ کۆوەبن
ئاگری قیمەی دڵم سەر کوڵمەکەی دڵدارمە
ئامیری ناهی هەیە، بڕیاری کوشتەی من بدا
چونکە بۆ بازاڕی ئەو من کۆشش و کردارمە[(٤)]
ئەی بەقوربانی نەسیمت بم وەتەن تۆ (جەننەتی)
حۆری و غیلمانەکانت پڕ بەدەشت و شارمە
من کە پەروانە صیفەت بووم ئێستە بۆ غونچەی گوڵێ
بولبول ئاسا (ئەسعەدا)ناڵەی دڵی بیارمە

**١٩٥٢**

---

(١) غەمزە: بەچاو ناز و نووز ئەنوێنێت.

(٢) هەڵیاوەسی: هەڵی واسیوە... پێویستی هونەری شیعری وای کردووە، شاعیر و جۆرە ئاڵوگۆڕ بەشوێنی پیتەکان بکات.

– موشتەری ئەغیارمە: واتە کڕیاری جەرگی بەقولاب هەڵواسراوم... نەیار و دوژمنانمە.

(٣) شێخی سەنعان: ئەو مرۆڤە موسڵمانەی تەمەنی لە هەشتا ساڵ تێ پەڕیبوو لەپێناو خۆشەویستی عەشقی کچێکی مەسیحی وازی لە ئیسلامەتی هێنا و دوای ئەو شۆخە جوانە کەوت.

(٤) شاعیر وێنەیەکی شیعری جوان و کاریگەری لە شەتری یەکەمدا پێشکەش کردووین و ئەڵێ: یار یا خۆشەویستەکەم بەچەکی (ئاه) هەڵکێشان بڕیاری کوشتن و لەناو بردنمی داوە و ئامێرەکەی یەکجار کاریگەرە.



خوێنی چاوم باعیسی جەرگ و دڵی بیمارمە
ئاگری سینەم بڵێسەی ڕوومەتی دڵدارمە
چونکە ڕۆژی وەسڵەکەی ئانێ نەبوو بێ ڕووی ڕەقیب
بولبول ئاسا دائیمە گریان و شین و زارمە[(١)]
هانە هانەی بابدا بۆ کوشتنم عیفریتی جن
جێ دەمی تیری موژەی باخی گوڵ و گوڵزارمە[(٢)]
عەشقی ئێوە خەسرەوا یەزدان ئەدا یا ئەهرەمەن
خالقی پیس و بەدت شەیتانەکەی عەبیارمە[(٣)]
کەر مەبن ڕەبی هەموو هەر واحیدێکە بێ نەزیر
نوور و زوڵمەت خوایەکانی موشریکی غەددارمە[(٤)]
سەر نویشتی ئەوەلی (ئەسعەد) چبێ چی کەنییە
ئەم وتانە سەفسەطەی بێ عەقڵەکەی بەر کارمە

**١٩٦٦**

---

(١) ئانێ: ساتێکی زۆر کورت.

(٢) عیفریتی جن: دێوی جنۆکە.

(٣) ئەهریمەن: لە ئاینی زەردەشتیدا دوو جۆر سەرچاوەی هێز و جوڵاندن هەیە... سەرچاوەی خێر و بێر و شادی و خۆشی بەناوی ئەهرومزدا و سەرچاوەی چەوتی و نالەباری و تاریکی و خراپەکاری بەناوی ئەهریمەنەوە.

(٤) بێ نەزیر: بێ نظیر: بێ وێنە...

باسی جـانی باسی مـاره وا لەنێو دیوانمە
تەم لە چاوو حەسرەت و ئەندۆهو غەم میوانمە[1]

ئاگری دڵ هێند بەتاوە بەحری فرمێسکی بڕی
بۆی کزەی جەرگم نیشانەی مەرگی بێ تاوانمە

توهمەتی ناحەق مەکەن کوژراوی دەستی کەس نەبووم
کوشتەیی تەعنی عەدو (ارثی) هەموو باوانمە

هەر بە بەرگی خۆمەوە بمنێنە گۆڕ و ئەلحەدم
جلکی خوێناوی بزانن شاهیدی دیوانمە[2]

مەحکەمەی سولحی نییە ئەو یارە ئیشی کوشتنە
بۆیە (ئەسعەد) ئیشتیهایی گردەکەی سەیوانمە[3]

١٩٦٨

(١) ئەندۆهو: پەژارە، ناخۆشی، داخ و خەفەت.

(٢) ئەلحەد: ئەو چاڵەیە کە مردوی تیا ئەنێژرێت، گۆڕیچەشی پێ ئەوتریت و ئەو تەلەبەردانەی لەسەر گۆڕیچەکە بەڕیز دائەنرێت پێی ئەوترێت بەردی ئەلحەد و زۆرجار بۆ پەند و ئامۆژگاری ئەوترێت تا لووتی لە بەردی ئەلحەد نەدا هۆشی نایەتەوە بەر.

(٣) ئیشتیهایی: حەزی لێ ئەکات، ئارەزوویی... ئەوە ئەخوازێت.



زووڵم و زۆری پێپەتی سەر لەوحەیی دیوانمە
ئێشی دیلی نیشتمانی تا حەشر میوانمە[1]

من کە دەردی عەشقی تۆی نایە سەرم چەرخی فەلەک
ڕەنگی زەرد و ئاهی حەسرەت باری سەر لێوانمە

وا ئەناڵێنم لەگەڵ بولبول بەجووتی تا ئەبەد
چونکە شوومی بەختی بەد (ارثی) گەلی باوانمە

ئەم گوڵاڵانەی کەوا سوورن لە سەحراوو چیا
خوێنی ئاڵی نەوجەوان و جەرگی بێ تاوانمە

مژدەبێ هێنای نەسیم، ئەمڕۆ بەهاری تازەیە
یەعنی ڕۆژی حوڕ ژیان و کوردی سەر کێوانمە

بۆ نەجاتی قەومی گیراوە لە ئەرزی ئاسیا
ئاگرێ هەستاوە شوعلەی نووری سەر چاوانمە

ئەی برا گەل ببنە پەروانە لەبۆ ئەم شوعلەیە
شوعلەیی چی (ئەسعەدا) ژینی هەموو لاوانمە

١٩٣١

(١) ئەم قەسیدەیە مۆرکی سیاسی پێوەیە و ڕەنگانەوەی بیروڕای جەماوەر و هەڵوێستی خەڵکی سلێمانییە، شیعرەکە دوای ڕاپەڕینی ڕەشی شەشی ئەیلوولی خوێناوی ساڵی ١٩٣٠ لە دایکبووە، واتە: سێ مانگ دوای ئەو ڕووداوە دڵتەزێنەی کە ڕژێمی پاشایەتی عێراق بەهاوکاری ئینگلیزە داگیرکەرەکان دروێنەی گیانی خەڵکی ڕاپەڕیووی بەردەرکی سەرای سلێمانیان لەو ڕۆژەدا کرد.
هێماکانی ناو شیعرەکە تەواو لەگەڵ دروشم و بانگێشتەی خەڵکەکەدا یەک ئەگرنەوە... بەنموونە: لەگەڵ ڕێزمان بۆ نەتەوەی عەرەب... لەو ڕۆژانەدا و تا ساڵانی نیوەی دووەمی سەدەی بیستەم زاراوەی پێپەتی بۆ عەرەب بەکار ئەهێنرا و یەکێ لە دروشمەکانی ئەو خۆپێشاندان و ڕاپەڕینەی خەڵکی ئاسایی و ڕەش و ڕووتی ستەملێکراو ئەوەبوو:

ئێمە کوردین کوردمان ئەوی
عەرەب... و نامانەوێ

ئەوەی ئاماژەی پێکرا مێژووە و مێژووش ئەبێ وەک خۆی تۆمارکرێت و پێشکەش کرێت.

کەریەتی چەند خۆشە میرم بێ مەراق و بێ غەمە
تێگەییو و شێوەن ئەکاتن عاقڵی بێ غەم کەمە[1]
قەپ لە جۆ دابگرە فەرموو ئەی جەنابی گوێدرێژ
ئەو کەسەی وەک تۆ نەبێ خواب و خۆراکی هەر غەمە
پێم بڵێ: تاکەی ئەڕێژم ئەشکی نەومێدی فەلەک
ئاهی حەسرەت سەر ئەخا گڕ وەکو موشەدەمە[2]
مەرحەبا ئەی غەم بەئانێ سەد سڵاوم لێ ئەکەی
ئیش و کارم بوو بەجوابی تۆ، عەزیزم ئەم دەمە
بۆ ئەبێ غونچەی هیوا پشکۆی ئەسارەت وشکیکا
کوانێ شایی (ئەسعەدا) ئەم شینەیە و ئەم ماتەمە

١٩٦٩

(١) میرم: مەبەست کەسێکی دیاری خۆ بەزلزانە و ئەمەش درکەیە و بۆ تەشەر بەکاردێت و ساڵی لە دایکبوونی شیعرەکە لەگەڵ بارودۆخەکەی ئەو سەردەمەدا گونجاوە.

(٢) موشە دەمە: هەمانەیەکی فوو دەرەو ئاسنگەر بۆ گەشانەوەی ئاگری کوورەبەکاری ئەهێنێت.



خودا ڕەحمێ بەمن کە؛ دەس لە دنیا ، کاتی بەردانە
قیامەت وا لەبەرچاوم تەماشا گەرد و گەردانە[1]
هەتاکەی ئاگری میحنەت لە سینەمدا بڵێسەی بێ
بڵێ پێم چەرخی زاڵم، وایە پیشە و کاری مەردانە؟
بەخوێناوی دڵ و جەرگم بنەخشینی هەموو کێلم
بەڵێنی داوە، لەیلا دێ سبەینی کاتی سەردانە

(١) ناوەرۆکی ئەم پارچە شیعرە، زوهد و خواپەرستی و دەست لە دنیا بەردانە... لە هەمان کاتیشدا؛ گرنگی بایەخ بەلایەنی جوانی بێژی دراوە و لەم بەیتەدا هونەری پێچە و پەخش بەکارهێنراوە، (صدر)ی بەیتەکە پێچانەوەیەکی جوانی تیایە و دابەشی دوو کراوە، (خوا ڕەحمێ بەمن کە) و (دەس لە دنیا ، کاتی بەردانە)و لە عجزی هەمان بەیتدا هەست ئەکەیت دیسان دابەشی دوو کراوە: (قیامەت وا لەبەرچاوم) و (تەماشا گەرد و گەردانە)یە... بەشی یەکەم لە (عجز)ەکەدا کردنەوەی بەشی یەکەمی (صدر)ی بەیتەکەیە و بەشی دووەمی (صدر)ی بەیتەکەیە... و شاعیر ئەڵێ: تەماشای دنیا بکە کە هەموو گەردەلوول و تۆز و خۆڵە، باشە دنیایەک ئەوەبێت و مرۆڤیش لە ئەنجامدا بەرەو ڕۆژی قیامەات ئەڕوا، ئیدی بۆچی دەست لە دنیای فانی بەر نەدرێت؟

***

حکومەت گورگە ئەهلی بوو بەمەڕ حاڵی پەرێشانە
درۆ قانوونە حەق ون بوو مەزاهیب دینی ئێشانە[1]
مەپرسە وەزعی میری بۆگەن و ڕوو لە ڕووخانە
ڕەئیسی گایە حاکم کەرە دەوائر پڕ لە جاشانە
لەبەرجووتەو قەپ و گازی، حەرامە نیشتمانیمان
بەدەس جانی هەموو ژیرێ ژیانی زۆر پەرێشانە
دزی شەو، مشتووی دەمانچە دەر ئەخاتن ڕۆژ
مەمات ئەکرین بەجان و دڵ لە دەس ئەم گەنجە باشانە[2]
نەما حورمەت، حەیا ڕۆیی هەموو یەک دەفعە باری کرد
موباحە خوێن ڕژان و چوونە بەزمی ماف جۆشانە[3]
عیلاجی دەردی ئەم دەورە خووا چاکی نەکا نابێ
مەحاڵە دەر بچێ (ئەسعەد) لەناو ئەم مەی فرۆشانە

١٩٦٨/٥/٨

---

(١) چنینی تاڵی وشەکانی شیعر، لای شاعیر هەست ئەبزوێنێ و جوانی ئەبارێنێ و چێژو تام خۆشتر ئەکات لە هەموو شیعرەکاندا سیمای خواپەرستی و خەباتی کوردایەتی دووباڵی بەهێزن و بەسەر مەلی شیعرەکانەوەن، ناوەڕۆکی سیاسی ئەم شیعرە و بەراوردکردنی لەگەڵ ڕۆژی لە دایکبوونی هیچ مەودا و گومان بۆ بۆچوونی جیاجیا ناهێڵێتەوە، شاعیر ئازایانە هەڵوێستی جوامێرانەی بەرامبەر ڕژێمی عێراقی و دامودەزگا داپڵۆسێنەر و نۆکەر و بەکرێگیراوەکانی نواندووە.

(٢) مەمات ئەکرێن: ئەکوژرێین.

(٣) موباحە خوێن ڕژان: حەلاڵە خوێن ڕژان یاخود خوێن ڕشتنی خەڵکی بەلاشە و ڕەهاییە.



زومستانی نەبێتن قیمەتی گوڵ کەی نمایانە
شەوی زوڵمەت نەبێ نوور و عەدالەت کەی درەوشانە[*]
بەنەفامی گرووی گرتووە، دڵی بێ هۆش و بێ گۆشم
ژیانێکی ئەوێ شایی بەبێ ڕەنجێکی شێرانە
خەوی خێرە (موعەبیر) ئەم خەوە خێرەم کەبینیوە
ئەڵێ: نەگبەت ئەڕۆم ئیکە لەنێو ئەم دەورو بانانە
مەرامی پیاوی بێ کەس جێبەجێ نابێ لە گێتیدا
فەلەک تەفرەم مەدە ڕازیم بەژینی بێ نەوایانە
بەڵای پیری و غەم و دەردی زەمەن کارێکی پێکردم
عبور ناکا بەدڵما، عەیش و نۆش و بەزمی جانانە[1]
سن و کوللە زەراعەی باغی ئێمەی وا بەزایعدا
بنێرە یاڕەبێ دەردێ لە بۆ ئەم جن و دێوانە
لە ڕاستیدا وەکو مەنسوور (ئەسعەد) شیعرەکەم بۆیە
بەسەربەستی ئەدا بڕیاری مەرگم پیری مەیخانە

١٩٤٥

---

(*) شاعیر ئەم قەسیدەیەی لەبەشی یەکەمی شیعرە چاپکراوەکەیدا بڵاو کردۆتەوە... بەڵام لەبەرئەوەی بەدەستخەتی شاعیر لە دەفتەری ژمارە (٤)یدا دەستکاری هەندێک وشەو دەستەواژەی کردووە و لە کۆتایی قەسیدەکەشدا ١٩٦٢/١٢/٣ نووسیوە... بۆیە: بەڕاست زانرا ئەمیان وەک خۆی بێ دەستکارییەکە بڵاوکرێتەوە و ئەوەی دەستکاریشی کردووە، هەر لەدوای ئەم قەسیدەیە بڵاو بکرێتەوە.

(١) عبوور ناکا بەدڵما: بەدڵما نایەت، بەدڵما تێناپەڕێت.

- عەیش و نۆش: لە خۆشی و ڕابواردن چێژ وەرگیرە.
- جانانە: ژنی زۆرزان و زمان لووس و بەناز.

***

زومستەن گەر نەبێتن قیمەتی گوڵ کەی نمایانە
شەوی زاڵم نەبێ ڕۆژ و عەدالەت کەی درەوشانە[1]
بەنەفامی گرووی گرتووە، بێ هۆش و بێ گۆشم
ژیانێکی ئەوی شایی بەبێ ڕەنجێکی شێرانە
خەوی خێرە (موعەبیر) ئەم خەوە خۆشەم کە بینیوە[2]
ئەڵێ: نەگبەت ئەڕۆم، ئەمجا لەسەر ئەم ئەرزی کوردانە
مەرامی پیاوی بێ دەس جێبەجێ نابێ لە دنیادا
فەلەک تەفرەم مەدە ڕازیم بەژینی بێ نەوایانە
بەڵای پیری و غەم و دەردی زەمەن کارێکی پێکردم
عبور ناکا بەدڵما، عەیش و نۆش و بەزمی جاناتە
سن و کوللە زەراعەی ژینمی ئەمڕۆ بەزاییعدا
بنێرە یارەبی دەردێ لەبۆ ئەم جن و دێوانە
لە هەق بێژی وەکو مەنسوور (ئەسعەد) شیعرەکەم بۆیە
بەسەرخۆشی ئەدا بڕیاری مەرگم پیری مەیخانە

١٩٦٢/١٢/٣

(١) زومستەن: وەرزی زستان.
– نمایانە: کەی دەرئەکەوێت؟ بۆ شێوازی بەراورد کردنە.
– درەوشان: شەوقدانە و باق و بریقی هەیە.
وەک لە پەراوێزی قەسیدەی پێشوو ئاماژەی پێکرا شاعیر هەندێک وشەو دەستەواژەی گۆڕیوە و ئەگەرچی ئەم قەسیدەیەی لە بەشی یەکەمی دیوانە شیعرییەکەیدا بڵاوی کردۆتەوە بووە بەموڵکی خوێنەواران، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا مافی ئەوەی هەیە بۆ جارێکی دی دەستکاری بکات و گۆڕانکاریان بەسەردا بهێنێت و دواتر بڵاوی بکاتەوە.
ئەوەی زیاتر سەرنج ڕائەکێشێت مێژووی هۆنینەوەی شیعرەکەیە کە پێشتر ساڵی ١٩٤٥ی لەسەر نووسرابوو با بڵێین ئەوە ساڵی ١٩٦٥ بووە و بەهەڵە شەشەکە بۆتە چوار، کەچی ئەو ڕۆژ و مانگ و ساڵەکەی بە ١٩٦٢/١٢/٣ نووسیوە و شیعرەکە تەنیا ناوەرۆکی سیاسی نەگرتۆتە خۆی تابووترێت لەبەر هێماکان و شوێنەونی واتا ئەو مێژووەی لەسەر نووسیوە... نەخێر شاعیر لە زۆر وێنەی شیعرەکانی پێشوویدا ئازایانە و بێ ترس ئەوەی لە دڵیدا بووە و لە مێشکیدا پەنگی خواردۆتەوە خستوویەتە سەر کاغەز، با لەکاتی خۆشیدا بڵاوی نەکردبێتەوە.
(٢) موعەبیر: ئەوانەی خەو لێک ئەدەنەوە.



زوموستەن گەر نەبیتن، قیمەتی گوڵی کەی نمایانە
بەشەر پیسی نەبێ، کەی پیاوی پاکی جلوە ئەفشانە[1]
برا کەوتوومە نێو داوی بەڵاوە، دەی خواحافیز
نەجاتم زەحمەتە؛ لەم فێڵ و مەکرەی جن و دێوانە
مەگەر دیوانەکەی پیرم پەلم بگرێ و دەرم هێنێ
لە گێژی بەحری ئەفسونی فسانە و پەندی جانانە
وەکو عابد لە گۆشەی مەعبەدە، با گۆشەگیری کەم
نەبینم شەخسی پیس و بەد بەوێنەی ئەم ڕەقیبانە
بقیرێنن، گەلی خەلقی لەبۆ دنیایی بێ قیمەت
فەلەک بۆ هاو وەصلت کردم لەگەڵ ئەم خائنانە
بە نوێژ و ڕۆژو و حەج نابێ ئوسوڵی دین ئیسلامی
نەکەن باوەڕ بەقورئان و قسەی ئەو ئەسحابانە[2]
فریشتەی مەرگە کە فەرموو لە ژین بێزارە وا (ئەسعەد)
شەرەف بۆ مردنە ئەمڕۆ وەکو ئەو نەوجەوانانە[3]

١٩٦٢/١٢/١٣

(١) دیارە ژان و خواستەکانی شاعیر لە دەروونیدا پەنگ ئەخواتەوە... دەربارەی ئەم قەسیدەیە، گۆڕانکاری بەسەر بڵاوکراوە چاپکراوەکەیدا هات و ئەوەبوو لەپێش ئەمدا پێشکەش کرا، کەچی ئەمجارەیان وە بەدەستخەتی خودی شاعیر لە دەفتەری ژمارە (٤)دا، قەسیدەکەی بەو جۆرە پێشکەش کردوین... گۆڕانکاری نەک بەسەر وشەو دەستەواژەدا هاتووە، بەڵکو شەتر و بەیتیشی گۆڕیوە و لێی زیاد کردووە.
(٢) شاعیر ئەم بەیتەی لە زمان ئەو کەسە نالەبار و دوژمنە سەر سەختانەی دین و دنیاوە وتووە... ئەوان بڕوایان بەئەرکانەکانی شەریعەت و ئاینی پیرۆزی ئیسلام نییە.
(٣) ئەوەتا لەم بەیتەدا بیروڕاو هەڵوێستی دروست و ڕاستەقینەی شاعیر دەرئەکەوێت، چەندە لەو ژینە بێزارە کە پیاوی خراپ و دنیا پەرستی تیایە.

لەبێ مەعنایی ئەم ئەهلە ئەڵێن: ئەم چەرخە دوونە
بەڵێ: ناو زەرق ئەگۆڕێنێ زروف ئاوە یا خونە[١]
ئەمن لات و مەلیک لۆتی، وەزیر میرزایە زوڕناژەن
دەهۆڵت ئەی فەلەک لێدە، ڕەعییەت عەینی مەیموونە[٢]
لە مەتنی کورت و کوێر، لازمە بۆمن درێژەی دەم
بەیانم دەرچووە، شەرمێ وەکو (بەیضاوی)یە ڕوونە
تەماشا شوانی مێگەل دێڵە گورگێکە بەبا هاتوو
ئەوی ئومێدی ژینی بێ، نەفام و مەست و مەجنونە
نەما حورمەت، حەیا ڕۆیی، ئەوەی نەفسی بوێ ئەیکەن
بەئەمری (شاری یاری) دیانەت گشتی مەسجوونە[٣]
لە (١٧) حەڤدەی حەوتی هەزارو نۆ سەدو حەفتا ئەڵێ: (ئەسعەد)
هەچی پیسێ نەتۆ بێنێ، ئەوە ئەمشەو کە مەغبونە[٤]

١٩٧٠/٧/١٧

(١) چەرخی دوون: چەرخی کەچرەفتار.
(٢) ئەمن: ئاسایش... ئەوانەی لە دەزگای ئاسایشدا کار ئەکەن
- ڕەعیەت: دەست و پێوەند.
- عەینی: هەر وەکو، چون ئەوە.
- بەباهاتوو: ئەو دێڵە گوڕگە نێرخوازە...و، وەختی ئاوس بوونیەتی.
(٣) شاری یاری: مدینە الالعاب: لەو ساڵەدا لە شوێنی یاریگای شاری سلێمانی... لەلایەن چەند کۆمپانیایەکی میسرییەوە (شاری یاری) تیاکرایەوە... هەمەجۆر یاری و شتی سەرنج ڕاکێشەری تیابوو، زۆربەی هەڵسوڕێنەرەکانیان ئافرەتی میسری و فەلەستینی بوون... شار ئەو جۆرە جموجۆڵەی ئافرەتانی بەخۆیەوە نەبینی... لە یەکێک لە شەوی پێشکەشکردنی چالاکیەکانیان... خەڵک پەلاماری یاری شاری داو شتەکانیان تێکدا، ئەمە بووە هۆی داخستنی... شاعیر مەبەستی ئەو ڕووداوەیە.
(٤) مەغبون: ماف پێشێلکراو.



دڵم کەیلی غەم و دەرد و زوخاوە
لە دەست هیجرانی تۆ جەرگم بڕاوە[١]
خووا مەرگێ بەئاسانی بدە پێم!
هیوای بینینی یارانم نەماوە
دوو چاوم هەڵئەدا خوێناوی جەرگم
ستوونی خێوەتی سینەم خراوە
وەرە نێو بیلبیلەم بنواڕە جانا
بەقەددی موو قەدەن چیمەن کراوە[٢]
ڕەقیبی سەگ بەسە فیتنەو فجورت[٣]
شەقی مەحبوبەیە دوڕو دراوە[٤]
وەرمگێڕێ، دوو چاوی یارە (ئەسعەد)
کەوا پەردەی حەیاو شەرمم دڕاوە

١٩٣٤

(١) کەیل: پڕە، لێواو لێوە.
(٢) بەقەددی: بەقەدەر ئەوە، بەپێوانەی ئەو، بەئەندازەی ئەوە.
(٣) فجور: درۆ و دەلەسە... ئاژاوەگێڕی.
(٤) دوڕ: گەوهەر، مرواری.
دراو: پارەوپوڵ.

***

چ عـــەســـرێکە؛ برا ئەمـــڕۆ لەناوە؟
خـیـانەت مـەزهەبە، دینیش نەمـاوە[1]
شەرەف ڕوویی، حەیا، سەربارەکەی بوو
دزی و بێ حـورمـەتی، ئێسـتـاکـە باوە
لە لۆجی ســـینەمـــا، بڕوانە عـــالەم
وەکـو وحـشـی هەمـوو هەر تێـخـزاوە
بەگـودلەی شـانەوە زوڵفـیـشـی بۆیە
ئەدەب ڕۆیی، شــــەرم تۆوی بڕاوە[2]
زڕەی دەنـگـی دەلاڵانـە ئـەڵـێـن وا:
مـــەزاتخـــانە، لە نێـــر و مێ خـــزاوە
قـەڕابە کـەوتە خـۆڵ، جـۆشی قـومـارە
لەناویدا، کـــەر و بەدمـــەست کـــراوە

١٩٧٥/٨/٢١

---

(١) شیعر کاریگەریەکی بەهێزی لە وروژاندنی هەست و نەستی مرۆڤدا هەیە... شاعیر لەم قەسیدەیەیدا کە دوای نسکۆی شۆڕشی ئەیلوول هۆنیویەتەوە، هاوخەمی و پەژارەی ئەو دۆخە ڕەشە بەناوەرۆکی شیعرەکەوە دیارە... هەست بەدەنگی تووڕەیی و بێزاری ئەکرێت، ئەوەتا بەئاشکراو بێ پێچ و پەنا... ئاماژە بەکاری خیانەتکارانەی ئەو خۆفرۆشانە ئەکات کە ساڵی ١٩٧٥ و دوای ئەوەی کورد دوچاری ئەو پیلانە بوو، چۆن بۆ پارە و مەنزڵ پشتیان لە میللەتەکەیان کرد.

(٢) گودلە: قژی سەر.

شاعیر تەشەر لەو گەنجانە ئەدات کە چۆن هەر خەریکی خۆیانن و هاوخەم و هاوخواستی نەتەوە ستەمدیدەکەیان نین.

***



گـورگی دووپی هێندە زۆرە، گـورگی چوار پێ کـەم بووە
پیـاوی غـەمـخـۆری نەمـاوە بۆیە غـەم بێ خـەم بووە[1]
عـەقـڵی چی؟ دانش چیـیـە؟ بێ دانشی باوی هەیە
باری کـرد شـەرم و حـەیا ئەم عـالـەمـە بێ خـەم بووە[2]
زەمـــزەمـــەی ئەمـــڕۆ نموونەی نەفـــحی ســـووری ئەوەڵە
کـوشتن و مـاڵ خـواردنی یەکـتـر وەها بێ دەم بووە[3]
وەخـتـە دڵ دەر بێ لەبەر بێ چاوو ڕووی ئەم عـالـەمـە
گـەر یەکێ پیـاوانە بێتن سـووک و خـاوەن زەم بووە[4]
وا لە گـــــێـــــژاوی بەڵادام و ئـەجـــــەل دەورم ئەدا
(بارك اللّه) ئەی ئەجـەل شـوێنت گلێنەی چەم بووە[5]
دەرد و داغی دڵ ئەگـــەر تەقـــریر و تەحـــریری بکەم
کـــول زبانە، خـــامـــەیی ئەمـــجـــۆرە کـــارە کـــەم بووە
هەر وەکـو پەروانەیە (ئەسـعـەد) بەدەوری شـەمـعـەوە
یەعنی دینی (مصطفی) موختاری عیلمی جەم بووە[6]

١٩٦٩

---

(١) گورگی دووپێ: ئەمە درکە (کنایە)یە بۆ مرۆڤی سروشت گورگی و دڕندە.
– بێ خەم بووە: لێرەدا بەواتای دڵنیابووە لەوەی کاریگەری نییە پشتێنی لێ کردۆتەوە.
(٢) دانش: زانست، دانایی.
(٣) نەفحەی: لەڕو لاواز.
(٤) خاوەن زەم بووە: سەر زەنشتی کراوە.
(٥) گلێنەی چەم بووە: گلێنەی چاو بووە.
(٦) دینی مصطفی: دینی ئیسلامی هەڵبژاردەی کۆی زانستەکانە.

***

شــاخ و داغی کــورده وا دیســان بەخــوێنی ڕەنگ بووە
لاوەکـانی پێگەییــو حـازر بەسـاحـەی جـەنگ بووە[1]
تۆڵەیی خــۆی هەر ئەســێنێ گــەنج و لاوانی نەترس
نەعــرەتەی شــێــرانە لێــدا دوشــمنی بنکەن بووە[2]
حــەق پەرســتی ناوی ڕووتە، بێ مــوســەممایە ئەســەف
لەم دلێــری کــوردییــە عــالـەم هەمــوو بێ دەنگ بووە
کـوانێ پیـاوی، بێ فـیـداکـات و بلێ: کـوردی هەژار
بەشخوراوە پیاوی، بێ کیانە بۆ حەقی بن سەنگ بووە[3]
خــوێنی بێ تاوانی ئێــمــە، نایشــوا دجلە و فــورات
ئاو شەپۆلی پێ ئەدا (گوێ پانە) خۆی لێ مەنگ بووە[4]
ئێــمــە خــاوەن حــورمــەت و دین و حــەیاشین و شــەڕەف
ئەو گەلەی مەیلی مەباحە، پێی بلێ هەرزەنگ بووە[5]
شـۆڕشی بەرزان و کـورد (تاریخ)ەکـەی ئەسـعـەد ئەلێ:
یەک هەزار و سێ سـەد و هەشتاو یەکە گوڵشـەنگ بووە

١٣٨١ ک

(١) یەکێک لەو دیاردە دڵخۆشکەرەی شاعیر لە دووتوێی شیعرەکانیەوە ئەیبەخشێت، لە سەرتاپای شیعرەکانیدا هەڵوێستی ئایدیولۆژیانەی نەگۆڕە بەتایبەت هەردوو سەرچاوەی هوشیاری و ئیمانی کە خواپەرستی و کوردایەتییە... ئەم قەسیدەیەی بەڵگەی ئەو ڕاستییە دەرئەخات.

(٢) بنکەن: بنکۆڵ... ژێری بۆش و بەتاڵە.

(٣) بێ کـیـانە: شـاعـیـر لە ڕێگای ئەم زاراوەیەوە بۆ هەمـووانی دەرئەخـات، بەشـخـوراوی و مـاف پێشێلکراوی لە ئەنجامی ئەو دەردەوە سەری هەڵداوە کە کورد خاوەنی کیانی سیاسیی سەربەخۆ و حکوومەتی ئازادی خۆی نییە.

(٤) گوێی پانە: مەبەست لە عەبولکەریم قاسمە.

(٥) زەنگ: لێرەدا بەواتای لێکپچڕان و کەلێن دروستبوونە.



ئاســمــان هەورین بووە، تەم ئەرزی داگـیـر کـردووە
شـوعلەیی ڕۆژی لە ئێـمـە، وا بەشـەو ون کـردووە
دارژا بارانی نەحس و نەگـبــەتی بۆ گـەل خــووا
هەر ئەڵێی هەستا قیامەت ڕۆژی حەشری مردووە
هێـرشی غـەم هاتە خـوارێ بۆ دڵی ئێـمـەی فـەقـیـر
بارشی مـیـحنەت وەهایە ڕەنگی سووری بردووە[1]
گـیـانەکـەم نەعـرە بکێـشـە بێـتـە لەرزین ئاسـمـان
ســەیری دیلی دەردی خــۆکــە، ئابڕوویی بردووە
چش لەمــانە؛ بووینەتە زنجی بەدەس سـپــیـانەوە
حـورمـەت و ژین و حـەیامـانی، بەجـارێ بردووە[2]
کەوڵ و پێستی ماتەمینی ئەیکەمە سەر شانەکەم
بۆ کـەسـاسی نیـشـتـمـانی تەرکی زەوقم کـردووە
عـەینی دوڕو گـەوهەرە گـوفـتـارەکـانم سـەیری کـەن
نەک بەزنجی تێ بگەن (ئەسعەد) بلێن دڵ مردووە

١٩٥٠/١٠/٣

(١) بارشی میحنەت: میحنەت ئەبارێ.

(٢) چش: قیروسیا، بڕیار دان لە شتێک کە دەستی لێ شۆرابێت و ئەبێت ئەنجامدرێت.

دەربەدەر بوو، دڵ لە سینەم چۆتە سیلکی شێتەوە
تۆ بڵێ: ئەم خوێرییە، ڕۆژێکی وابێ، بێتەوە؟[١]
خۆم بەقوربانی سەگی دەرماڵەکەت شاهی ڕەسول
هیمەتێکە، ئەم کەساسە، هەمدیسان بابێتەوە
ئێشی چاوم، بێ دەوایە، چارە سازی زەحمەتە
ئولفەتی گرتووە، بەسورمەی خاکەکەی بەرپێتەوە
تۆ شەفیعی موذنبینی، من گونەهبارم دەخیل
با لەژێر لێفەکەتا، ئەم ڕوو ڕەشە جێی بێتەوە
مردنی لەو بەردەرەم؛ لا، پێ، لە جەننەت خۆشترە

١٠ی الحجە/١٣٩٣

(١) سیلکی: لێرەدا بەواتای خانەدێت... دڵ چۆتە خانەی شێتەوە.
ئەم پارچە شیعرەی شاعیر نوێکردنەوەی پەیمانی عەشق و دڵسۆزیە بۆ پێغەمبەری مەزن و خۆشەویستمان محەمەد مستەفا (د.خ) لێ بێت... ئەوەتا لە دوابەیتی ئەم شیعرەدا کوڵی خۆشەویستی خۆی بۆ پێغەمبەری موسڵمانان دەرئەخات و هەموو ژیان و دنیای لە پێناودا ئەوێ، بەجۆرێک مردنی لەبەر پێی پێغەمبەردا لە بەهەشت خۆشترە... دیارە ئەوەش ڕوونە کە گیانی پاکی سەروەری هەموو مرۆڤ پێغەمبەری خۆشەویستمان بەرهەر مرۆڤێکی دی بەبەهەشت شادبووە هەر بەهۆی گەورەیی و بەزەیی ئەوە و پاڕانەوەی لە خوای میهرەبان هەموو ئوممەتی موسڵمان بە بەهەشت شاد ئەکات و شاعیریش بەهۆی ئەو تەمەننایە یەوە، بەهەشتی مسۆگەر کردووە.

***



ئابڕووی ڕێژراوە دڵ، لە نوێژی عەسرەوە
چۆڵی کرد، سینە کە چۆتە تاقی ئەبرۆ کەسرەوە[١]
بێنەوە بۆ وەعز و تەلقینم برالەی وا عیزان
نەوکو بڕوا هۆشەکەم نەظمم بچێتە (نەثرەوە)[٢]
پەردەبی ڕووخساری لادا ڕۆژی ڕووناکی هەڵات
(إنما شمس أنا) یێژێ لە ڕوویی حەسرەوە
(التماسی) ماچی لێوم کرد و عاجزبوو وتی:
ئەی مەلا تاکەی عەجوولی بەسیە ئیکە بسرەوە[٣]
(ئەسعەد) ئەمڕۆ وا لە مەیدانی قەزا گۆیە سەرت[٤]
بۆیە چەوگانی ئەکا یارت لە نوێژی عەسرەوە

١٩٣٧/٨/٥

(١) کەسرەوە: مەبەست کیسرا پاشای ساسانییەکانە و لێکچواندنە بۆ تاقی کیسرا دیارە لەبەر پێویستییەکانی شیعر ئەو گۆڕانکارییەی بەسەردا هاتووە.
(٢) تەلقین: ڕێنمایی و تێگەیاندنی کەسێک، ئەمە زیاتر بۆ مردوانە.
– نەظم: لێرەدا بەواتای شیعر و هۆنراوە دێت.
– نەثر: پەخشان
شاعیر ئەوەندە پابەندی ڕێنمایی و فەرموودەکانی پێغەمبەر و شەریعەتی ئیسلامییە... داوا لە مرۆڤ ئەکات کە هەمیشە ڕێنمایی و ئامۆژگاری بکات... نەک خەیاڵی پوچی دنیا، گەورەیی خودا و خۆشەویستی پێغەمبەری «د.خ» لەبیر بەرێتەوە.
(٣) عەجوول: هارو هاج... بزێو.
– بسرەوە: داسەکنێ... کپ و بێ دەنگ و بێ جووڵەبە.
(٤) قەزا گۆیە سەرت: واتە: ئەسعەد: ئەمڕۆ یاخود ئێستە سەروگیانت قەزا وەگێڕە و خۆی بەقوربانت ئەکات ناهێڵێت بەڵات بۆ بێت.

***

سەرزەنشتی گەل نەکەن کەوتۆتە دەس بێ هۆشەوە
شانسی خوایی کوا عەلاقەی وا بەبیر و هۆشەوە
تەفرە خۆری کەس نەبێ ئەمرۆ بەئومێدی سبەی
کەی هیوای تێری هەیە برسی لەخوانی بۆشەوە
هاش و هوشی مەی فرۆشە مەستی خستۆتە سەما
وەرنە زەوقی تێگەییوو کەی بوو لەلای سەرخۆشەوە
سێ کەڕەت دەستم بەزاخا چوو کەچی عارم نەنا
نەگبەتی، جەرگت بڕێ خستمتە کوورەی جۆشەوە
شیعری پڕ مانا لە مەیدانی بەلاغەت (ئەسعەدا)
وەک وتاری (مەثنەوی) ڕەمزە لە بن سەرپۆشەوە[1]

١٩٦٠/٢/١

(١) لەم بەیتەدا ئاماژە بە (بەلاغەت) و (مەثنەوی) کراوە، ئەوە بەڵگەی ئەو ڕاستییە ئەسەلمێنێت، شاعیر بایەخی زۆری بەهونەری ڕەوانبێژی لە شیعرەکانیدا داوە و (مەثنەوی)یش بەڵگەی شارەزایی شاعیر لە شیعری دوو دوو، جووت سەروا ئەگەێنێت وەک شیعرەکانی شانامەی فیردەوسی و شیعرە نوێکانی گۆران و بەیتە فۆلکلۆریەکان.



بێ کەس و کزما، ئەدەب کەوتۆتە دەس منداڵەوە
وەک مەلی بێ باڵ و پەڕ بۆتن بەچنگی داڵەوە[1]
بۆ وتاری فەیلەسوفانی؛ بەڕوو؛ گریانمە
بێ ڕەواج و نرخە، وابوو بەکۆیز و خاڵەوە[2]
مەنزڵ و مەئوا، نەماوە جێی نییە؛ ڕووی تێبکەی
وشکە باخی مەعریفەت، پڕ بوو لە دڕک و داڵەوە
ڕووی شیرینت، بەناشی داوە، ئەی چەرخی فەلەک
دەردەدارت کردووە، دانا بەڕووی تاڵەوە
چاوی نابینا مەڕێژە، سورمەکە زایع مەکە
با کەسانی تێگەیوو، نەتلێننەوە بەم حاڵەوە
نەدوەیی کوێرانەیە، خامە خەڵاتی کوێر ئەکا
نان و بەرگی پێ ئەوێ، (سائیل) بەسین و ساڵەوە[3]
حاڵی عالەم وا ئەبینم، دائیما بەدتر ئەبێ
لێمگەڕێ؛ لەم گۆشە، بامرم بەئاه و ناڵەوە
بەسیە بۆ بەی لێوەکەت، تەحسیلی حاسڵ بوو مەکە
نیسبەتی کوا، دەستی قودرەت، بێ بەڕەنگی ئاڵەوە[4]
دولبەرا، تەفرەم مەدە، (ئەسعەد) لە سلکی تۆ نییە
من لە ئینس و تۆ پەری و ساحیر بەخەت و خاڵەوە[5]

١٩٧٣/١/١٠

(١) ژان و ئازار و هەستی برینداری شاعیر، هێمایە بۆ خواست و داواکانی خودی شاعیر... ئەم قەسیدەیە گلەیی و گازاندەی شاعیر بەرامبەر ئەوانە دەرئەخات بەهەق ڕێز لە پیرۆزی وشەو مەزنی شیعر ناگرن.
مەبەستی ڕاستەوخۆی شاعیر، ئەو کۆڕە ئەدەبییەیە کە لە ١٩٧٣/١/١٠ لە یانەی فەرمانبەرانی سلێمانی بەبۆنەیساڵیادی دامەزراندنی یەکێتی نووسەرانی کوردە و، سازکرا و تیایدا خەڵاتی ئەدەبی بەچەند نووسەرێک درا.
(٢) بێ ڕەواج: بێ فروخت و بازاڕ.
(٣) نەدوەیی: ندوە: کۆڕ ساز کردن.

- سائیل: ئەوەی پرسیار ئەکات.
- سین و ساڵ:

سین: لێرەدا هەر مەبەست لە بەساڵاچوو پیرە، ئەوانەی ساڵانیان بەڕێکردووە.
ئەشتوانرێت بە س: واتە پرسیارکردن دابنرێت وەک ئەوترێت: فلاّنە شت پێویستی بە (س و ج) هەیە واتە بە (سین و جیم) پرسیار و وەلاّمە.

(٤) تەحسیل حاسڵ: تحصیل حاصل: پوختەی ئەو ئەنجامەی گفتوگۆ هەڵناگرێت.

(٥) ئینس: مرۆڤ. مەردوم.
- ساحر: تەلیسماوی؛ جادوگەر.

***



مەرحەبام ئەمڕۆ لە دڵ کرد، غەم وەرامی دامەوە
گوڵ پەرستی کاری من بوو ئێستە بێ گوڵ مامەوە
ئاهو ناڵەی حەسرەتم بۆیە لە دڵ ناچێتە دەر
عوشرەت و عەیشم غەمە عومرم بەغەم پێچامەوە
عیللەتی دەردی دەرونم زەحمەتە دۆزینەوەی
چونکە نووکی تیری قودرەت سینەکەی پێچامەوە
جەژنی قوربانە سبەینێ چی بەقوربانی بکەم
بۆ فیراقی ڕووی حەبیبە ئێستەکە سووتامەوە
جەژنە پیرۆزە لەگەڵ کێدا بکەم گەردوونی دوون
کوندەبووم- ئاسا لە (سەردەشتا) بەتەنیا مامەوە[1]
ئەو کەسانەی تێگەییو بوو دەردی خۆی تیماری کرد
من بەشێتی (ئەسعەدا) سەیر کە وا فەوتامەوە

١٩٤٢/٩/٨

(١) کوندەبووم: وەک کوندە پەپووی شوومم لێهاتووە و چۆن ئەو شەیدای چۆڵەوانی و وێرانە خاکە، منیش دەربەدەری شاران بووم.
ئەم پارچە شیعرە لە یەکەم شەوی جەژنی قورباندا و لە ١٩٤٢/٩/٨ لە شاری سەردەشتی کوردستانی ئێران هۆنراوەتەوە، لەوکاتەدا شاعیر لەسەر جموجۆڵ و چالاکی کۆمەڵەی برایەتی و خەباتی کوردایەتی دەربەدەر و ئاوارە ئەبێت لە دوو توێی دێر و بەیتەکانی ئەم پارچەیەدا، هەستی بێزاری و غەمباری لێ بەرز ئەبێتەوە.
شاعیر هەر خۆی بەتەنیا لە سەردەشت نەبوو، ئەو وشەی تەنیاییە مەبەست لەو جۆر و چۆنیەتی بیروڕا و هەڵوێستی خۆیەتی کە بەتەنیایە و ئاوەڵ و پشتگیری نییە... ئەمەش ئەرکێکی نوێیە و شیعر دەری ئەخات.

جەوهەرێکی بێ عەرەز، پێم وت: لە ڕووی شەرمەوە
بۆچی وا بێ ڕەنگی تۆ، کەوتویە کوورەی گەرمەوە[١]
پێت ئەڵێم: بەندی دڵم؛ چی بووم و چیم و چی ئەبم.
تاوێ شەرمم بۆ نەما، کەوتوومە بن بێ شەرمەوە
چارەسازی زەحمەتە، بێتو، بەئاسانی ببێ
زەرپەرستی هاتووە، چیتە بەسەر مێزەزمەوە[٢]
بەحری عیلم و مەعریفەت، پڕ بوو لە مرواری نەما
یەکەم لەمە زیاتر، ئەبێ ڕۆژی دیتە بەرمەوە
زوو لەبێ شەرمی ئەترسا، عالەمێ ترسی نەما
داخەکەم بۆ تۆ حەیا وابوو بەمردووی تەرمەوە
زۆر شوکر، هەر سەروەت و سامانمە، دین و حەیا
تاکو ئەمرم (ئەسعەد)دا ئەینێمە تاجی سەرمەوە[٣]

(١) جەوهەرێکی بێ عەرەز: واتا جەوهەرێکی بەنرخی ئەوتۆیە پێویستی بەخستنە ڕوو نییە، تا کڕیاری بۆ ڕاکێشرێت.

(٢) زەر پەرستی هاتووە: زێڕ یاخود ئاڵتوون و زۆرجار بەپارە و پوڵیش دێت، ئەوانەی دوای ماڵ و سامانی دنیا ئەکەون.

– چیتە بەسەر مێزەرمەوە: شاعیر بۆ خۆی زانایەکی پایە بەرزی ئاینی بوو، مەلا و مێزەری سپی ئەکردە سەر... ئەمە مەبەستی خودی خۆیەتی وەک مامۆستا و مەلایەکی ئاینی.

(٣) ئەم قەسیدەیە؛ هەڵوێستێکی دامرکاوی شیعرەکەی پێشووە.

***



ئەی صەبا نامەم بەرە بۆ خزمەتی یارانەوە
عەینی وێنەم بیخەنە ئاوێنەیی شارانەوە
وێڵ و سەرگەردان و خوار و بێکەس و ئاوارە بووم
گەه بەدەس (عێراقیان) و گەه بەدەس (ئێرانەوە)[١]
بۆ ئەسیری لاوەکانت ئەی وەتەن سەودا سەرم
بوومە بوومی شاخەکان و خانەیی وێرانەوە
سێوی ڕوخساری وەتەن (سەردەشتی) کردە مەسکەنم
داغی سینەبوو بەخاڵی لێوی غەم خوارانەوە
ناڵەیی دڵ خۆشترە (ئەسعەد) لە ناڵەی سازو نەی
تێکە مەی؟ ساقی بەنەشئەی بەزمەکەی جارانەوە

١٩٤٣/٨/٢٠

(١) ئەم پارچە شیعرە لە ١٩٤٣/٨/٢٠ لە شاری سەردەشت هۆنراوەتەوە... خەمەکانی خودی شاعیر و دەربەدەری و چەوسانەوە و هەڵوێستی کاربەدەستانی حکوومەتی عێراق و ئێران هەریەک بەچەشنێک ڕەنگ ئەداتەوە و خۆی ئەنوێنێت.

شاعیر هەر خۆی بەخاوەنی خۆشەویستی و عەشقی هەستی نیشتمانپەروەری ئەزانێت.. لەگەڵ ئەو دەربەدەری و سەرگەردانییەیدا هێشتا هەر دڵی لای لاوانی وەتەنە و چاوی ئومێدی تێبڕیون... ئەم شیعرە لە هۆکاری کاریگەری هاندانی لاوان گوڕ و تینێکی بەهێزی پێوە دیارە.

ڕوحی شیرینم براله ها بەسەر لێوانەوە
من له چاهی میحنەتام و تۆ بەسەر کێوانەوە[١]
بۆ سیاحەت توو خووا تەکلیفی من جانا مەکەن؟
تاکو کونجی غەم ببێ چیمە بەسەر سەیرانەوە[٢]
خاڵی لێوی تۆم بەتۆ ناسیوە تۆ بەو خاڵتە
دەوری وا کێ دیویە بێژە بەدەم دەورانەوە
بۆ تەسەلسول دڵ فریب نادەی لەبەرمە چارەکەی
چون تەمانوع بوو بەتەطبیقی لەبی جانانەوە[٣]
(ئەسعەد) ئەمڕۆ دڵ پەشێوە چارەسازی زەحمەتە
وا خەریک ماوە بەدەس یارێکی حیکمەت زانەوە

١٩٣٨

(١) له چاهی میحنەتام: له چاڵی میحنەت و تەنگژە و ناخۆشیدام.
(٢) شاعیر لەم ساڵەدا له گەرمەی کۆڕی تێکۆشانی حزبایەتیدا بووە و له ژووری فەقێکانی خانەقای مەحوی له شاری سلێمانی وەک کونج و خەباتی تیا کردووە و له سەیران و خۆشی خۆی بێ بەشکردووە.
(٣) تەمانوع: له (منع)ەوە هاتووە و مەبەست نەهێشتن و قەدەغەکردنە.

***



خوێنی جەرگم دێتەدەر ئەمڕۆ بەدەمگریانەوە
بۆ نەمانی حورمەتی دینی گەلی جارانەوە
بەر ئەدەم دەستم، له ژین و ئەچمە گۆڕی بێ کەسی
پیاوی پیاوانە؛ نەما؛ مردوو؛ هەموو شارانەوە
بێ قەرارە، دڵ له سینەم، کۆچی یەکجاری ئەکا
چیبکا تەنیا، لەناو ئەم میللەتی وێرانەوە
داخەکەم، بۆ ئەو حەلانە؛ قیمەتی دانش هەبوو
نا ئەدیبی؛ باوی زۆرە، کەوتونەتە ناو شارانەوە
چەرخەکەی دوونی بێ وەفا، غارەتگەری دنیاو دین
من بەتەنگ؛ چوونی حەیا و شەرمی دڵدارانەوە
باغەوان؛ شیوەنبکە؛ وا شوێنی گوڵ بوو بەدڕک
عەترە بارانی قەدیمی بوو بە غەمبارانەوە
کەس نەماوە، مەرحەبایێکی بکەی تۆ (ئەسعەد)ا
دۆم و خەڕات و قەرەج، چوونە جێی میرانەوە[١]

١٩٧٣/٨/٣

(١) دۆم: هۆزێکی گەڕۆکی کوردە و بەرەنجی شان و ئارەقی ناوچەوانیان بژێوی ژیان پەیدا ئەکەن و بەپیشەسازی درومانی کڵاشەوە خەریکن.
– خەڕات: لێرەدا ئەگەرچی وەک دەستە خوشک و هاوجوت پێکەوە لەگەڵ دۆمدا بەکاردێت، بەڵام خەڕات بۆ خۆی بەکاری دارتاش و دارساف و لووسکەر دێت.
– قەرەج: ئەمانەش هۆزێکی گەڕۆکن و له هەر خاکێکدا جێنشتەبن خۆیان بەخەڵکی ئەوێ ئەزانن و زمان و نەریتی تایبەتی خۆیان هەیە و بەزۆر شوێنی دنیادا بڵاوبوونەتەوە شاعیر کە ناوی دۆم و خەڕات و قەرەجی بردووە وەک درکە بەکاری هێناون... بەڵام له ڕاستیدا ئەوانە مرۆڤن و خاوەن پایە و مەنزڵی ڕێزی خۆیانن و لەگەڵ نیشتەجێبوونیاندا، ڕۆڵی خۆیان لەناو کۆمەڵگای شارستانیەتدا بەجوانی و ڕێکوپێکی بەڕێوەبردووە.

***

ڕەهنە خوێنم وەتەن مەیخەنە ئەم ناوەوە
هەر ئەمێنێ تا حەشر ڕەنگی بەدەست و پاوەوە
خۆ بپارێزن لە کوشتەی دڵ برینداری وەتەن
خائینی گەل بەسیەتی ناکەس مەیێننە ناوەوە
من کە خەللاقی ئەزەل تەقدیری ژینی کردبم
چۆن ئەبێ ترسم ببێ لەم عالەمەی بەدناوەوە
بمکوژن بێ شوبهەیە تۆڵەم ئەسێنێ خالقم
ئێکە ترسم کوا لە پیاوی سەرسەری و بێ چاوەوە
تەجرەبە و وەزعی زەمانە چاکی ئێمە تێگەیان
گەل فرۆشن زۆرکەسی بەدناوی خستە ناوەوە
کاغەز و خادم عەزیزم چاکە با ضائیع نەکەم
گەوهەری دوڕی یەتیمم نەیخەمە چڵپاوەوە[1]
هەوڵ ئەدەم بۆ سەربەخۆیی تا وەکو ژینم هەیە
بێ هیوا (ئەسعەد) نییە ناوی کە کەوتە ناوەوە[2]

١٩٦١/٦/٤

---

(١) گەوهەر دوڕی یەتیمم: گەوهەر و دوڕی بێ کەس و بێ خاوەنم... مەبەست لە بیروڕا و بۆچوونی پاک و دڵسۆزیەتی، کەس گوێی لێناگرێت و پەیڕەوی پێناکرێت.

(٢) ئا لەم بەیتەدا بیروڕای شاعیر تەواو ئاشکرا ئەبێت و داوای سەربەخۆیی خاکی کوردستان ئەکات... ئەمە بۆ ١٩٦١/٦/٤ گرنگ و بایەخی خۆی هەیە و بەر لە هەڵگیرساندنی ئاگری شۆڕشی ئەیلوولی ١٩٦١ وتراوە.

***



## بۆ شێخ لەتیفی حەفید

کەوتە دەشتی بێ کەسی، یارم بەتەنیا مایەوە
داخ و دەردی، بردە ژێر گڵ، جەرگ و دڵم سووتایەوە
شێخ لەتیف ڕۆیی، ئەوا پایەی گەلی کورد کەوتە زەوی
سەد حەیف، کوردێ نەبوو، زوو قیمەتی بێ لایەوە
یەک هەزار و نۆسەد و حەفتاو دوو، دڵ بوو بەئاو
کۆچی دوایی کرد و (ئەسعەد) بێ ڕەفیقێ مایەوە[1]

---

(١) ئەم پارچە شیعرە بەبۆنەی کۆچی ماڵئاوای شێخ لەتیفی شێخ مەحموودی حەفیدەوە هۆنراوەتەوە و تیایدا سۆز و خۆشەویستی هاوڕێیەتی دێر زەمانەی نێوانیان نیشان ئەدات.

***

یاقووتی لەبت قووتی لەبی حەزرەتی شایە
دەم بۆچی بەرم ڕوتبەیی من عەینی گەدایە[1]
چاوی ڕەشی مەستت کە وەکو کەوکەبی قوطبن
زویرە لەگەڵم موشفیقە بۆ خەڵکی چرایە[2]
بەو جیلوەیە وا چۆتە سەری لالەیی کوڵمت
سووتاوە دڵی عالەمی گشت ئەرز و سەمایە
تەنیا نییە من سینەلەتی تیری موژەی تۆ
جنرا جگەری عاشقی بێچارە خوایە
(ئەسعەد) بگری دەنگی فوغان هەڵبڕە دایم
دڵ ڕەق نییە یار مەیلی بەڕەحم و بەوەفایە

١٩٤٥

---

(١) ئەم شیعرە لە ڕووی هونەری و بەکارهێنانی لایەنەکانی جوانکاری و ڕوون و واتا بێژییەوە، سەرنج بەلای خۆیدا ڕائەکێشێت... ڕەوانی و پاراوی لە زماندا و کێشێکی بێ گریە و گۆل و سەروایەکی ڕەوانی خاوەن مۆسیقایەکی شیعری... خەسڵەتەکانییەتی... هەر لەم بەیتەدا لە نێوان هەردوو (قووت)دا ڕەگەزدۆزی و هاووێنەی تەواو هەیە... هەردوو وشە هەمان پیت و واتای جیابەخشە... یاقووتی لەبت واتە لێوت کە بەماچ دێ، ئەبێتە قووتی لەبی حەزرەتی شا کە چێژ و خۆشی پێگەیاندنە...

(٢) چاوی ڕەشی بەکەوکەبی قوطب: واتە ئەستێرەی ئاسمان لە گەشی و جوانیدا بەچاوی چوواندوە ئەو کاری لێکچوانە بۆ خۆی هونەرێکی وردی شیعری ئەبەخشێت.
– موشفیقە: میهرەبانە.

***



تاڵ و خۆشی من، لە دنیادا هەموو دەم تاڵیە
مردن و مانم وەکو یەک وایە تاڵیشاڵیە
بوو بەپێخۆری حەلم، بوختان و غەیبەتی وا ئەسەف
حەلقەیی عەلیم و تەریقەت کاکەلێ گاڵ گاڵیە[1]
عومری گەنجیم چوو بەزایع، کاتی پیریشم وەها
بوومە هاوڕێی (جانی)یان و حاڵەکەم بەدحاڵیە
دەغدەغەی دنیا، بەجارێ بیری ئینسانیی بریم
بێ خشوعە، نوێژ و ڕۆژوشم لە تاعەت خاڵیە[2]
موجرم و حاکم بەشەڕهاتن لەسەر بەرتیلی کەم
خوا بکا یەکتر بکوژن ئیکە ئەسعەد حاڵم حاڵیە[3]

---

(١) شاعیر لە بەکارهێنانی وشە و زاراوەی نوێدا دەریایەکی قووڵ و فراوانە... یەجگار شارەزای زمانی کوردییە ئەوەتا لە (صدر)ی ئەم بەیتەدا زانایانە هونەری جوانیکاری لە ڕەوانبێژیدا بەکارهێناوە و وردەکاری تیا کردووە، (بوو بەپێخۆری حەلم) مرۆڤ وای بۆ ئەچێ کە مەبەستی شاعیر ئەوەیە خۆی (بووە بەپێخۆری حەل)ی واتە: کێشەکەی حەل بوو بەڵام بەشێوەیەکی نادروست، کەچی ئەو (م) ڕاناوی پێوەلکاوی کەسی یەکەمی قسەکەر نییە، بەڵکو وشەی (حەلم یاخود حەلەم) بەسەریەکەوە واتا ئەدات و مەبەست ژان و ئازار و دەرد و سوێی مرۆڤە... ئەم واتایەش جوانتر لەگەڵ واتای بەیتەکەدا ئەگونجێت و هونەروەری زمانەوانی شاعیریش ئەسەلمێنێت.
– کاکەلێ: بچووککردنەوەی کاکەیە و بۆ خۆشەویستی و نازداری بەکاردێت.
– گاڵ گاڵی: جۆرە خۆراکێکە لە هەویر دروست ئەکرێت.

(٢) دەغدەغە: ختووکەدان.
– بێ خشوعە:
خشوع: سەردانەواندن و چۆکدادان لەبەردەم بارەگای خودادا... بەواتای سوجدە بردنیش دێت.
مەبەستی شاعیر لەو بەیتەدا ئەوەیە: ئارەزوو ویستی دنیایی ختوکەی بیری مرۆڤایەتی داوم و ئەو دنیا و خواپەرستی لەبیر بردومەتەوە، بۆیە: نوێژ و ڕۆژوم لە مەبەستی خواپەرستی خاڵییە و سوجدە بردنیشم بێ سوودە.

(٣) حاڵم حاڵیە: ڕەگەزدۆزیەکی ناتەواوە و وشەکان لە (حاڵ)دا وەک یەکن و ڕاناو و فرمانە بزوێنەکەیان جیاوازە... لەواتاشدا حاڵم بەبارودۆخ و ژیانم دێت و حاڵیەش بەواتای تێگەیشتوو دێت... ئەم ئاڵوگۆڕکردنی پیتی وشەکان و واتاکانیان، بەهونەرێکی وردی شیعر دائەنرێت.

خۆش و ناخۆشیم لە دنیادا هەموو دەم تاڵییە
مردن و ژینم وەکو یەک وایە تاڵی شاڵییە(۱)
بوو بەپێ خۆری حەلم و بوختان و غەیبەت وا ئەسەف
حەلقەیی عیلم و طەریقەت سەیری کە کاڵ کاڵییە
دەغدەغەی دنیا بیری ئینسانی بریم
بێ خشووعە نوێژ و ڕۆژوشم لە طاعەت خاڵییە(۲)
عومری گەنجیم چوو بە ضائیع کاتی پیریشم وەها
بوومە هاوڕێی جانیان و حاڵەکەم بەد حاڵییە
جەردەیی دوولا بەشەڕ هاتن لەسەر ماڵی هەژار
خوا بکا یەکتر بکوژن ئەو ساکە (ئەسعەد) ساڵییە(۳)

١٩٧٠

(۱) شاعیر ئەم شیعرەی لە لاپەڕەی پێشووتردا پێشکەش کردوین و چەند گۆڕانکاریەک لە شوێنی وشەکاندا کراوە... بەباش زانرا ئەمەشیان پێشکەش بکرێت.
(۲) دەغدەغە: شاعیر لە پەراوێزی شیعرەکەدا نووسیویە: مەراق.
(۳) ئەو ساکە ئەسعەد ساڵییە: واتە: ئەوا کە ئەسعەد ساڵێتی... واتە بەدڵی ئەوە.

***



بۆ وەرامی نیکتەیی دڵ پرسیارێکم هەیە
عەیب و عارم مەگرە لێ شاها خومارێکم هەیە(۱)
بۆ نەبوو دووکەس ببێ مەردانەوو یەک دڵ بژی
یا کەسێ تا سەر بڵێ وێنە و شیعارێکم هەیە
ئیشتیراکی مەزبەتەی شێتانە، بۆ من ناکرێ
کوردی مادەر زادم و دەرسی عەیارێکم هەیە
کوێری نەوعی (عەقرەبە) (وەهبی) سوباتێکت ببێ
بۆ ئەوانەی لا جلەو بێ عەیب و عارێکم هەیە(۲)
خاکی بەرپێی ڕاستەڕێیان (ئەسعەدی) بێچارەیە
بۆ بڵندی نیشتمانی جان نیسارێکم هەیە(۳)

١٩٣٠

(۱) شاعیر لە پەراوێزی ئەم شیعرەدا بەدەستخەتی خۆی نووسیویە: ئەم شیعرەم لە شەشی ئەیلوولی ۱۹۳۰ی شەڕی بەردەرکی سەرادا وتووە، ئەگەرچی شیعرەکە سیاسییە و لە هەست و خەباتی کوردایەتی ئەدوێت، بەڵام هیچ ئاماژە بەخودی وردەکاری ڕووداوی دڵتەزێنی ڕاپەرینی شەشی ئەیلوولی ڕەشی بەردەرکی سەرای شاری سلێمانی ناکات و هێما بەرز و بەپێز و دیارەکانی ناخاتە ڕوو... سا ئەوە بەر لە کارەساتە خوێناویەکە هۆنراوەتەوە یاخود دوایی، هیچ زانیاریەکی بەدەستەوە نەداوە.
- نیکتەیی دڵ: پرسیاری نهێنی نێو پریاسکەی دڵ.
(۲) عەقرەبە: دووپشکە.
- وەهبی سوپاتێکت ببێ:
وەهبی: بەخشندەیی و لێبوردن لە مافی خۆ... بەخششی میهرەبانی خودایی.
سوبات: خۆڕاگری، ئارام...
واتاکەی بەسەریەکەوە: ئەبێت بەجۆری بەخشندەیی خوایی مەزن کە هەمیشەیە و ئەنجامی هەر باشەیە... ئا بەو جۆرە تۆش پەتی ئارامی چاوەڕوانیت بەهێزبێت.
(۳) نیسار: لێرەدا بەواتای هێزێکی سوپای دێت... واتە هێزێکی گەورەم لە پشتە.

***

گۆشە گیری بۆ سبەینێ کاری پیاوی مەردییە
شایی ئەمڕۆ ئیشی بلّح و خانمی نامەردییە
تێگەییو شیوەنیەتی بۆ حالّی خۆی و تابیعی
پێگەییو، دێوانەیە مەفتوونی مەرد و نەردییە
ناگەڕێ لێم ماری نەفسم، بچمە سلکی صالحان
بۆ خەیالّی پووچی دنیا مەیلی دار و بەردییە[1]
لەحظەیە وریا نەبوو دلّ بێ بەفریاما کەوێ
بۆیە سیمایی وجوهم ڕەنگی تۆز و گەردییە
دەفعەیە دەروێشە، دەوری شێخی مل پان و نەزان
دەفعەیە بڕنەو بەشانە سەیری ئەم نامەردییە[2]
واعیزی ناپاک و بەد بەسیەتی کاری خراپ
بوویە جاسوسی هەموو لا دوایی ئاهی سەردییە
سا خوا ڕەحمێ بەحالّی (ئەسعەدی) بێچارە کە
وا بەدەس چەرخی دەنی نالّین و داخ و دەردییە

١٩٧٠/١/١

---

(١) سلکی صالّحان: ڕێ و شوێنی پیاوچاکان... مەبەست لە پیاوی خواناس و عارفە.

(٢) بڕنەو: مەبەست تفەنگی بڕنەوە... چەکێکی تاک هاوێژە و لەناو کوردستاندا ناوبانگی مەزنی و کاریگەری هەیە.



## مرۆڤی ناپاک

ئەو سەرۆکەی، بێ فەڕە، باسی مەکە، نوێژی نییە
وێنەیی گورگی هەیاسە، بزنە کاوێژی نییە[1]
کەر لە تۆپینایە، ئیکە: بەیتەرەو دەرمانی چی؟
بۆ دەوایی دەردی مردوو، بیر و ڕاوێژی نییە
دلّ لە نەزعایە، چ تەشریحی ئەداتن فائدە
غەرغەرەی وەختی هیلاکەت، هیچ وتووویژی نییە[2]
بەختی شوومی، مێگەلە، بۆتن، بەشوانی دێلّە گورگ
بەز بەپش، مەسپێرە، قەت باوەڕ بەشەونوێژی نییە[3]
سەرزەنشتم زۆر ئەکا واعظ، سەرنجی لێبدەن
نوێژ ئەکا، بۆ عالەم و سەیریکە، دەسنوێژی نییە
گوربە کەی عابد ئەبێ، قانوونی عەدلت لامەدە
ڕاستەڕێ ئەسعەد برۆ؛ ئەم ڕێگەیە لێژی نییە[4]

١٩٥٨/٣/٦

---

(١) لەم بەیتەدا شاعیر پەنا بۆ تێهەلّکێشی بەندێکی پێشینان بردووە کە ئەوترێت: فلاّنە بۆتە بزنەکەی هەیاسی خاس.
هەیاس خاس بزنێکی ئەبێ و مەرجی ئەوەی لەسەر ئەکات خزمەتێکی باشی ئەو بزنە بکرێت، بەمەرجێک قەلّەو نەبێت، بۆ ئەو مەبەستە: هەرکاتێک بزنە دابەستەکە خەریکە بەخۆیدا دێ... بەرامبەری گورگێک ڕائەگرێت و پێشانی بزنەی ئەدرێت و بزنەش لەترسدا زیاد ناکات و لاواز ئەبێت.

(٢) دلّ لە نەزعایە: واتە دلّ لە ململانێ و شەڕدایە.
- تەشریح: هەلّدڕین... بەمەبەستی زانینی زانیاری ناوەوە.
- غەرغەرە: مرۆڤی ئاو لە دەم و قورگی وەرئەدات و غەرغەرەی پێ ئەکات... بەلاّم لێرەدا شاعیر مەبەستی ئەوەیە کە مرۆڤ لە سەرەمەرگدا بەئاو یاخود تفی ناودەمی غەرغەرەی مەرگ ئەکات.

(٣) پش: کورتکراوەی پشیلەیە... ئەمەش هەر لەو پەندەوە هاتووە کە بەدرکە کەسێک بەکەسێک ئەلّێت: بەز بەپیشیلەدا ئەنێرێت، واتە: لە بری ئەوەی بەئەمانەتەوە بیگەێنێتە شوێنی خۆی، بۆ جۆی ئەیخوات.

(٤) گوربە: پشیلەی نێری بەتەمەن، هەندێک جار بەنێرە کتکیش ئەناسرێت.

لەگەڵ لێو و دەمی غونچەی دەمی من نەبووەتو نابێ[*]
پەڕەی گوڵ کەی لەگەڵ شاڵ و ڕنەکدا بێ ئەبێ ڕابێ[١]
دڵی یارم وەکو بەردە، دڵم شووشە لەبەر بەردە
شکانی وردی کرد؛ مەحبووبە نەبوو مروەتی لابێ[٢]
نزیکی جێژنە جێژنانەم جنێو و عیشوە و نازە
بەقوربانی ئەکا؛ قۆچی منم خوایە دەسا وا بێ[٣]
ئەنەخشێنێ دەس و پەنجەی بەخوێنی عاشقی بێکەس
بەڵا نەبووەو نەبیسرا قاتیلێ بێ؛ ئاخری چا بێ[٤]
ڕەقیبی سەگ جەلابە قوڕ بەدامان و سەری ئێمە
برینی دەستی ئەو پیسە نییە دەرمانی پەیدا بێ[٥]
لە حەقی خۆم ئەبورم چی لە (حق اللّه) ئەکا ئەسعەد
بکە کارێکی وا ئەمڕۆ سبەینێ مەسنەدت(شا)بێ[٦]

١٩٧٠-١-٢

---

(*) بەپێی ڕۆژی دانانی ئەم شیعرە، مەبەستی ناوەڕۆکی ململانێی نێوان هێزی چاکەو زیانبەخشە.

(١) شاڵ: ئەو چنراوەیە کە لە خوری ساز ئەکرێت و ڕانک و چۆغەی لێ دروست ئەکرێ.

- ڕنەک: مەبەست ئامێرێکی لە ئاسن دروستکراوە وەک بڕ بەندزبرە...

لێرەدا واتای پێشوو ئەسەلمێت کە پەڕەی گوڵ بەو ناسکیە چۆن ئەبێتە هاوتای بڕبەند و شاڵی زبر و لەگەڵیدا ناگونجێت هەڵناکات.

(٢) دڵی یارم وەکو بەردە: ئەمە خواستەیە واتە دڵی وەک بەرد ڕەقە.

لێرەدا وێنەیەکی شیعری ناسک و سەرنج ڕاکێشەری پێکهێناوە... لەولاوە دڵی یاری وەک بەرد و دڵی خۆشی شووشەیە بەرانبەر بەردە هەمیشە هەڕەشەی دڵشکاندنی لێ ئەکرێت.

- مروەت: بەزەیی، دڵنەوایی کردن.

(٣) شاعیر ئەوەندە دڵسۆز و خۆشەویست و شەیدای یارەکەیەتی ئەوەتا، بەخۆشیەوە بەپیر قۆچی قوربانی خۆیەوە ئەچێت و داوا لە خودای میهرەبان ئەکات، ئەو قوربانیدانە ڕاست بێت و بەنسیبی ببێ.

- دەسا وا بێ: یا خودا وابێت، یا خودا بێتە دی.

(٤) دەس: دەست.



- قاتیلێ بێ: کوژەرێک بێ.

(٥) جەلابە: جەلادبە... پیاو کوژبە... کوژەربە.

(٦) مەسنەدت: کۆڵەکەت، پاڵپشتت، پشتگیرکەرت.

- شا: ئەشێت مەبەست شاهی نەقشبەندی بێت.

***

خووا هۆزێ کە بێ ئەخلاقی کا وەک من ئەبێ هیچ بێ
لە بۆ ماڵی ئەم و ئەو چاوی قیچ و دانەکەی ڕیچ بێ[1]
لەسەر پێکی شەرابە کش لە (شا) کات و نەفەر بێ خۆی
ئەوی بێتن بەخەویا شەو بەیانی سەروەتی هیچ بێ
پەچەی شەرمی نەمێنێ وەک سەگی خوێڕی بەرڵلا بێ
هەموو کاتی لەگەڵ مێزی قومارا مۆرەوو میچ بێ
درۆزن حیلەباز و دەسبڕی لات و بێ مەئوا
بەدایم چاقوڵی باز و خەریکی فاچە و فیچ بێ[2]
ئیکە حەقی ژیانت کەی هەیە (ئەسعەد) وەها بی تۆ
لەگەڵ زانینی ئەمڕۆ عیلمی کۆنی من ئەبێ هیچ بێ

١٩٦٩

(١) چاوی قیچ: چاوی بچووکە؛ ئەمە زیاتر بەو مرۆڤە ئەوترێت چاوێکی لە چاوێکی بچووکترەو دیمەنێکی جوان نابەخشێت.
– دانەکەی ڕیچ بێ: دانی گڕ و شاش و بەیەکدا چووبێ.
(٢) بێ مەئوا: بێ شوێن و ڕێگا و ماڵ.
– بەدایم چاقوڵی بازو: هەمیشە هەنگاونان و باز بازێن و ئەم لاو ئەولایەتی، ئەمە خوازەیە بۆ کاری فرت و فێڵاوی.

***



عەزیزی من کەسێکە ڕۆژی تەنگانە بەکارم بێ
نەوەک تا خاوەنی جاهم برالەی دەم لە زارم بێ[1]
لە بۆ بادانی تیکە مەردی گوێ ئاگر بەماوێنە
لە لێ قەومانبە، کوانێ یەکێکی وا کە یارم بێ؟
بەشوعلەی کارەبا نایەتە بەرچاوم ڕەفیقێکم
لە مووەدەی عومریا جارێ کە تومی عەیب و عارم بێ[2]
لە گۆشەی عەزڵەتا هەر چەندە دووری حەسرەتم ئەمما
شەرابی تاک و تەنیایی خووایە زەهری مارم بێ
سەری کز کردووە (ئەسعەد) لە تەکیەی مەحوی یا ئێستە
هەتا ڕۆژی قیامەت دار و دیواری بەکارم بێ[3]

١٩٣٣

(١) جاه: پایە بڵند، دەسترۆیشتوو، دەستەڵاتدار.
– زار: دەم.
(٢) کە تومی عەیب عارم بێ: واتە عەیب و عارم بشارێتەوە و ئاشکرای نەکات.
(٣) لە تەکیەی مەحوییا: لە مزگەوتی مەحوییا... نازانرێت ئاخۆ شاعیر بۆ کێشی شیعری زاراوەی تەکیەی بەکار هێناوە یاخود نا؟ چونکە بەو پێیەی مەحوی لەسەر ڕێبازی نەقشبەندی بووە و شوێنی خواپەرستی ئەم ڕێبازە (ڕێبازی نەقشبەندی) جیاوازە لە شوێنی خواپەرستی (ڕێبازی قادری) نەقشیەکان زاراوەی خانەقا بەکارئەهێنن و قادرییەکان زاراوەی تەکییە.
ئەبوو بیووتایە خانەقای مەحوی، چونکە تا ئێستەش دانیشتوانی شاری سلێمانی هەر بەخانەقای مەحوی ناوی ئەو مزگەوتە ئەبەن.

***

تا گەنجی وەتەن نیک و بەدی خواردنی غەم بێ
عەیشی منی بێچارە ئەبێ عەینی ئەلەم بێ[1]
دەورانی فەلەک گێژی ئەدا ئەهلی هونەرمەند
بارێکی نییە حوکمێ کە موحتاجی حەکەم بێ
نووکی ڕمی بێگانە لە دڵ تێپەڕی ئێستا
تیماری مەکە خوێن و خۆری ڕوو لە عەجەم بێ
بەینێکە ئەوا شینە لە نێو کۆمەڵی عاشق
ترساوی ئەوەن یارێ نەیە، مەیلی ستەم بێ
دوعایە ئەکەم عیززەتی من تۆ بڵێ ئامین
بازاڕی دز و مورتەکیبین یارەبی کەم بێ[2]

١٩٥٠/١٢/٨

---

(١) نیک: باش، خاس.
- بەدی: خراپی، پوخڵی و ناشیرین.
- ئەلەم: ژان و ئازار.
(٢) مورتەکبین: ئەوانەی خراپە و تاوان ئەکەن.

***



بۆ مەعیددەی گورگی بێ حورمەت نەبێ کەر هەضم ئەبێ؟
مەشکی ئەدرێتن بەهەر کەس فێری بەزم و ڕەزم ئەبێ[1]
بێ حەیایی و یەرسەری و بێ ئابڕوویی هێندە هەیە
بۆ نەمانی سەکتەری ئینسانە خاوەن عەزم ئەبێ
سیلم و ئاسایش درۆیە خوێن مژینی بێ دەسە
سەگ لە بۆ ئێسک نەبێ، بۆ هەڵمەتی وا جەزم ئەبێ[2]؟
چاقوڵی بازی لە ناوانا نەبێ باوی وەها
شیعری (ئەسعەد) قافیەی بۆچی شڕ و بێ نەزم ئەبێ

١٩٦٩/١٠/٥

---

(١) مەشکی: لێرەدا بەواتای ورگی دێت کە بەمەشکەی چواندووە مەشکەش بریتییە لە پیستی مەڕ و مالاتی گوڕواو، بۆ ڕۆن هەڵگرتن و کەرە و دۆ دروستکردن بەکار دێت.
(٢) واجەزم ئەبێ: کار و کردەوەیەک، بێ هیچ دوو دڵییەک ئەنجام ئەدرێت، خاوەنەکەی لەو ڕووەوە تەواو بڕوای بەڕاستی و سەرکەوتنی ئەنجامی کارەکەی هەیە.

***

عالەمێکم پێئەوێ ئەهلی مقام و بەستەبێ

بۆ هەموو داماوو بێ دەس عاجز و دڵ خەستەبێ[(١)]

خاوەنی دەست و دڵ و عیلم و عەمەل بێت و ئەدەب

نەک چل و فل هاروهاج ناکەس و بێ جەستەبێ

زاهیر و باتین وەکو یەک بێ لە بۆ چاک و خراپ

ڕوو لە شەرعی (مصطفی) کە، وا عیزی دەم بەستە بێ[(٢)]

با بەدامان و سەراکەم؛ قوڕ لە بۆ تەکلیفی وا

ئەم محاڵە کەی ئەبێ؟ بۆ جانیانی ئێستەبێ؟[(٣)]

کوانێ دیوەخان و خوان و میرۆشێخانی قەدیم؟

چوو بەسەر مەردێ نەما (ئەسعەد) کە مەردی دەستەبێ

١٩٦٢/٢/٢١

---

(١) دڵ خەستەبێ: دڵنەخۆش بێ، واتە خەمخۆربێ.

(٢) زاهیر: ظاهیر: بەئاشکراو لە ڕوو.

– باتین: باطین: بەشاراوە و نهێنی، یاخود لە دڵدا.

– وا عیز واعظ: ئەوەی ئامۆژگاری چاکەی خەڵکی ئەکات.

(٣) محاڵە: مەحاڵە: دەگمەنە ئەنجامدرێت.

– جانیانی: گۆناه و تاوانبارانی.

***



## گزنگی ئاشتی[(*)]

ژینی ڕێکی بۆ خراپە؛ دەستی داگیرکەر نەبێ

بێ دەس و خاوەن دەس، بۆچی مساواتی نەبێ

دەرکی ڕیشوەت داخرێ جانا لە بۆ مەئمورەکان

بۆ بەقانوونی ئیلاهیی مۆری چەوتی وەک نەبێ

خائینانی تیپی گەل تاکەی لە ڕێ لادەن هەژار[(١)]

ڕۆژی ڕووناکی هەڵێت و کاتی تاریکی نەبێ

کەی ئەبێ میکرۆبی گەل بمرێ بەدەرزی یەکێتی

دەردی (تیفۆس)ی برا بۆچی پزیشکێکی نەبێ

سەیری (ئەسعەد) کەن بەدایم عاجز و غەم خوردەیە

تووشی تیراوی گەلێکە چاری زامانی نەبێ[(٢)]

قەڵادزە ١٩٤٤/١١/٢٦

---

(*) شاعیر خۆی ئەو ناونیشانەی بۆ شیعرەکەی داناوە... بەڕوونی و ئاشکرا باس لە دەرد و سوێی دڵی بەدەست نارێکی خەڵکانی بەرپرسەوە دەرئەخات و خۆی بەخاوەن خەمی میللەت ئەزانێت... بەوەش یەکێک لە ئەرکەکانی شیعر و شاعیری بەجێ ئەهێنێت.

(١) لەم شیعرەدا داخ و ئۆقی مرۆڤ بەدەست پەرت و بڵاوی و چەند بەرەکیەوە ئەبیسترێت، ئەو میکرۆبە کوژەرەی شاعیر هەست بەمەترسیەکانی ئەکات بۆیە پێی وایە: یەکێتی ڕیزەکانی گەل تەنیا چارەیە و هۆیەکە بۆ ئەوەی جەماوەر بەخۆشی و ئاشتی و کامەرانی بژی.

(٢) بەپێی ڕۆژی دانانی شیعرەکە ئەبێت ئەم شیعرەی دوای ئەوەی لە سەردەشت بەرەو سلێمانی گەڕاوەتەوە و لە شاری قەڵادزە دایانابێت.

***

غەم کەسی دەس ناکەوێ غەیری من و بولبول نەبێ
جێ نییە تیا بسرەوێ پەردەی دەروون و دڵ نەبێ[1]
چونکە هاودەردی منی باگریەکەم نەختێ لە لات
لاتی وەک من چی ئەکا گەر شێتی و سەرچڵ نەبێ
گەوهەر و دوڕی یەتیمم ئەمڕۆ برا بێ قیمەتە
شێت و وێتە ئەو کەسەی زەردینەیی پڕ مل نەبی
شاری ئێمە شاری کوێرە با منیش خۆ کوێر بکەم
تالبی حۆری نییە کڕیاری صنفی قول نەبێ
بێ ئەدەب نەوکو ببی (ئەسعەد) لە ڕووی شاهو گەدا
دەم لە حاڵی کەس مەدە (الا) لە غونچەی گوڵ نەبێ

١٩٤٢/١/٣١

(١) گەر شیعر چێژ و ئارام، بەدڵ و دەروونی شاعیر ببەخشێت، ئەوا: شاعیر لەم شیعرەیدا هەست بە نائارامی و دڵەڕاوکێی ژیانی ئەکرێت، بەڵام لەگەڵ ئەوەیشدا، لە ڕووی وەستایی و هونەری شیعرییەوە، زۆر سەرکەوتوانە مامەڵەی لەگەڵ خەمەکانی کردووە.
ئەم شیعرەی لە شاری سەردەشت وتووە و ڕوو لە شارەکەی خۆی (شاری سلێمانی) ئەکات و ئاهی بۆ هەڵئەکێشت و ئەڵێ شاری کوێرانە و خەڵکیش لە شاری کوێران ئەبێت دەست بەچاویەوە بگرێ و تا وەک خەڵکەکە بژی و لە شاریش دوور نەکەوێتەوە چونکە چەند جارێک ئاماژە بەو ڕاستییە ئەکات.

***



هیوای ژینم نەما جانا، لە دەرمان و طەبیبم چی
لە مەشقی عەشقی دڵدار و تەماشایی حەبیبم چی(*)
لە ڕۆژی ئەوەڵا بەختم نەبوو خاوەن تەجەللا بێ
لە تەعنی دوشمنی دین و لە تەحقیری ڕەقیبم چی[1]
لە علمی پڕ لە گەوهەر لا ئەدا قاضی بە مل پانی
زەمانی مەشعەرەی وەهمە لە فتوایی شەبیبم چی[2]
قەناعەت ڕۆحی تەقوایە خوا لوطفی لە گەڵمایە
طەریقم ڕوو لە مەولایە لە بێ لوطفی شەکیبم چی[3]
بە غەم (ئەسعەد) حەسودی پێ ئەبا عالەم بزانن وا
قسەو لۆمەم لە لا بایە لە عەیبی نا لەبیبم چی

١٩٤٠/٥/٢

(*) خەم و ئاواتی گەش، دوو دیاردەی دیارن و لای شاعیر خۆی ئەنوێنێت و هەوێنی شیعرەکەیەتی چونکە شیعر لای شاعیر هەڵوێستەو لە هەموو ڕوویەکەوە چێژ بەڕوحی شاعیر ئەگەێنێت... ئەم شیعرەش بەزمانی ڕەوان و بێ گریە و گۆل لە دایک بووە و هەر بەیتەی سەرگوزەشتەیەکی کارو بەرنامەی ژیانی شاعیرە و بەجۆرێک بڕوای بەخۆیەتی هیچ شتێک کاری تێناکات و لە ڕێڕەوی خۆی لاینادات.
(١) تەجەللا: شەوق و ڕەوقدانەوە.
- تەعنی: طعن: تەشەر، تیر و تانەهاویشتن.
- تەحقیری ڕەقیبم: سووکایەتی پێکردنی ناحەز و نەیار.
(٢) مەشعەرە: بەواتای هەست و نەست دێت و هەندێک جاریش بەو شوێنە ئەوترێت کە قوربانی لە حەجدا تیا ئەکرێت.
- فتوای شەبیب: واتە فتوایەک لە ناخدا تفت و تاڵەو بێ کەڵک.
(٣) مەولا: زیاتر بەشێخی تەریقەی نەقشبەندی ئەوترێت وەک: مەولانا خالیدی نەقشبەندی.
- شەکیب: ئارامی و دان بەخۆ داگرتن.

***

شەوت ئەڕوا مەترسە ڕۆژی ڕووناکت وەتەن هەر دێ
حەپسخانەی زوڵم ئەڕمێت و چاوی دوشمنت دەردێ
لە دیوانی عەدالەت ناحەقی پێوەن و زنجیرە
سبەی ئەشکێ بزانە ئەم زڕو هوڕەت لە پێ دەردێ[1]
نەمامی باغی شایی با بنێژێ گەنجی دەرکەوتوو
بدەن ئاوی بەخوێنی گەش بزانن بێ گومان بەردێ
گڵۆپی سەد هەزاری دەستی قودرەت سەڵ ئەکاتن زوو
ڕشێنەی هەوری ڕەحمەت لا ئەبا هەر تۆز و هەر گەردێ
وەکو پیری جگەر سووتاوە (ئەسعەد) دائیما یێژێ
بپارێزە خووا بەو ڕو پڵنگی ناو چیاو هەردێ[2]

٩ی حوزەیرانی ١٩٦٣

---

(١) ئەم زڕ و هوڕە: مەبەست لە زڕ و هۆڕی کۆت و زنجیری دیلێتی و چەوساندنەوەیە.
(٢) بەور: بەحەیوانێکی وەحشی و دڕندە ئەوترێت شاعیر ئەم شیعرەی لە ڕۆژی ٩ی حوزیرانی ١٩٦٣دا هۆنیوەتەوە کە بەڕۆژی ڕەش و خوێناوی دائەنرێت، لەو ڕۆژەدا سوپای عێراقی بەسەرۆکایەتی زەعیم صدیق لوای بیستی هێنایە ناو شاری سلێمانی و لەو بەرەبەیانەدا هاتووچۆی قەدەغەکردن و خەڵکی شاری بەکۆگرت و خستنیە تەویلەی حامیەوە و چەند کەسێکی دڵسۆزیشی گوللەباران کرد و بەبلدۆزەر گڵی بەسەرداکردن... ئەو ڕۆژە بەلای خەڵکی سلێمانییەوە بەڕۆژێکی سەخت و بەرخودای خەباتی کوردایەتی دائەنرێت.

***



لەبێ ڕەحمی دڵی (غەربی) خووا کردوویەتی کارێ
حقوقی بێ نەوا یانی ئەوا هێنایە بەرکارێ[1]
بریقەی بەرقی شوعلەی کەو بی ڕووسی لە ئەمەریکا
دڵی (ئایزنهاوار)ی بەجارێ خستە هاوارێ[2]
(ألم نشرح) بخوێنە با لەیەک دەن کۆمەڵی گاور
نەکەن دابەش بەسەریا فەقیر و بێ نەوا جارێ
لە (إستعمار) ئەوا ڕزگارییە عالەم وەرە ئەی گەل
بەئازادی (منوَّر) کە هەموو ئەرز و هەموو شارێ
شکۆفی کە گوڵی هیوای (ئەسعەد) ئەی خوواوەندا
نەمێنێ با لەسەر مانا هەموو عەیب و هەمووو عارێ

١٩٥٧/١٠/٣

---

(١) غەربی: مەبەست لە بەرەی ڕۆژئاواییە.
بەسەرۆکایەتی ئەمەریکا و بەریتانیا و فەرەنسا و ئەڵەمانیا و هاوپەیمانەکانیان.
(٢) ئایزینهاوار: سەرۆکی کۆماری ولایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا بوو.

***

بۆ نەخـۆشی؛ وەک مـلـۆزم قـەت لە ئێـمـە نابڕێ
هەر وەکـو غــەم بوو بەلازم دەس لە دڵ هەڵناگـرێ
تۆ کـەوا پەروانەیی سـووتاوی شـەمعی ڕۆژ و شـەو
من بەگــریە بولبــولم، باخی گــوڵم بەرناگــرێ...
هاتە خـەو ئەمشـەو ڕەقـیبم بوو بەمـار و گەسـتمی
خێوەتی هەڵداوە نەگبەت قەت ستوونی ناخرێ[١]
نا بەجــایی هاتە گــۆڕێ، عــاقــڵی دەوری نەمــا
بێ حـەیایی باوی زۆرە کـەس حـەیا هەڵناگـرێ[٢]
با دەسم ببــڕن ئەنووسم مــاڵ و ئەحــواڵی زەمــان
ئەم زروفی پیسە (ئەسعەد) داخی کەس هەڵناگرێ

١٩٦٩/٨/٧

---

(١) قەت ستوونی ناخرێ: هەرگیز کۆڵەکەی ناخرێ.

(٢) هاتە گۆڕێ: هاتە مەیدان، هاتە پێش، ئامادەبوو.

***



ڕەنگی پەژمــوردەی گــوڵانە بولبــولی کــردە گــری
شــوعلەیی شــەمــعی دلانە ڕۆحی پەروانەی بڕی[١]
نۆبەتی غونچەم ئەگرت ئەمشەو هەتا وەختی سەحەر
بای نەسیم هات و بەجارێ عارەقی عەتری سڕی[٢]
کـەیف و شـایی لێ بڕا سـینەم لەبەر لافـاوی غـەم
تەعن و لۆمـەی دوشـمنە پەردەی دڵ و جـەرگی دڕی
عــادەتی دەورانە ئەهلی دڵ بەمــەقــصـودی نەگــا
ئیکە باسی بۆ بکەم شــەرمی بەبێ شــەرمی کــڕی
بمکوژن جـەژنی ڕەقــیــبە پێ بەخــوێنم ڕەنگ ئەکــا
بۆیە ئەمــڕۆ ئەهریمەن بۆ کــوشــتنم بانگی چڕی
خوێنەکـەم ئەتکێ لە مـۆژگـانی ڕەقـیبم شـەق بەرێ
تیــری مــەحــبــوبەم بەڕۆحی پاکی شــیــرینم کــڕی
وەک ملۆزم وایە (ئەسعەد) چەرخی دوونی بێ وەفا
حــەســرەتی هێناوە غــەم کــفنی بەبالاّمــا بڕی[٣]

١٩٤١

---

(١) پەژمـوردەی گۆڵانە: پەژمـردەی گولانە: واتە گـوڵان سیس و ژاکـاوە و ڕەنگی مردوی گـرتووە و زەرد بووە.

(٢) سەحەر: بەری بەیان.

(٣) شاعیر بەخۆی ئەڵێت: ئەسعەد تەماشای چەرخی کەچ ڕەفتار بکە؛ چەندە نەگلیسە و بێ وەفا... بۆیە غەم شالاّوی بۆ هێنام و کفنی بەبالاّ بڕیووم... لێرەدا وێنەیەکی جوانی شیعری پێکهێنراوە و پێویستە خوێنەر هوشیارانە مامەڵە لەگەڵ ئەم بەیتەی دواییەدا بکات، دەنا واتایەکی پێچەوانەی شێواو ئەبەخشیت.

***

پێمبڵێ، ئەی دڵ، لە من بۆ بووی بەری
هەر وەکو (بی) تاڵ و تفت و بێ بەری[١]
وا لەسەر تۆ، بوومە پەندی عالەمی
ڕەجم و تەحقیرم ئەکاتن؛ سەرسەری
ڕێگەیی پیاوانەی بگرە بەرت
لابدە؛ تۆزێ لە خولقی بەربەری[٢]
بۆ درۆ مەیدە لە ڕووشت بۆ درۆ
دوای ڕەشی، چیکەت ئەوێ ئاخر شەڕی
قاچو قووچی ئەم زروفە (ئەسعەد)دا
خوێندەواری بوو بەجەردەی بێ سەری[٣]

١٩٧١

(١) لە من بۆ بووی بەری: واتا بۆ حاشات لێکردووم.
– بێ بەری: بێ بەرهەمی.
لە نێوان هەردوو وشەی (بەری) (صدر) و (عجز)ی بەیتەکەدا ڕەگەزدۆزی تەواو هەیە.
(٢) بەربەری: وا لە مێژوودا باس کراوە، بەربەریەکان کۆمەڵێکی توندڕەوی بوون و مامەڵەیان لەگەڵ بەرامبەرەکانیاندا توندو تیژ بووە.
(٣) قاچ و قووچی ئەم زروفە: تێکەولێکە بۆ ئەوەی ماڵ و سامانی خەڵکی بەخۆڕایی و مفت بخورێت، بردن و لێدانی ماڵی خەڵکی بەهیچە.

***



وتم: ئەمشەو بەبەختم بۆ ئەوەندە شووم و نەگلیسی
وتی: کردەی ئەزەل وایە لەبۆمن تالیعی پیسی(*)
وتم: بەیتم لەبن هێناوە یا قەتڵی (حسینم) کرد
وتی: زەللامە کە ئەبیە ڕەفیقی چڵکن و پیسی[١]
وتم: تۆ شێخ و من ئۆمی وەرە نەختێ بەمروەت بە
وتی: تۆ شێخ و مروەت وابزانم تۆ خوری ڕێسی[٢]
وتم: عەمرت نەمێنێ، لابە چارەت وا دڵم تۆقی
وتی: سامن لەتۆ بەدتر، بەدیمەن عەینی گورگیسی
وتم: توو بیخوا دەردێم لەژێر باری غەمی دیلی
وتی: خاکت بەسەر گیراوی دەستی ڕووس و ئینگلسی
وتم: چارەم چییە، ئابی حەکیمی چارە سازم بە؟
وتی: بمرێ عەزیزم؛ هاو جەلیسی حەزرەتی شیسی[٣]
وتم: بێ خۆ بکوژم، موستەحەقی وەیل ئەبم نابێ
وتی: وەیلی مووەقەت چاترە (ئەسعەد) لە ئینگلیسی

١٩٤٠/٢/٣

(*) بایەخی ئەم شیعرەی شاعیر لەوەدایە ساڵی ١٩٤٠ هۆنراوەتەوە و لە ڕووی هۆنەری شیعرییەوە و پەنابردنە بەر گفتوگۆ و هونەری درامی بۆ خۆی جێگای هەڵوێستەیە... هەر بەیتە بۆ خۆی یەکێتییەکی ئورگانی پێکهێناوە و لەواتادا سەربەخۆیە و تێکڕای بەیتەکانیش هەیکەلێکی تۆکمەی مەزن پێکئەهێنن و هونەروەری شاعیری پێوە دیارە و ئەکرێ لێکۆڵینەوەی قووڵ و وردی لەسەر ئەنجامبدرێت.
(١) بەیتم لەبن هێنا: واتە سامانی ماڵی خودا کە (کەعبەیە) تالانم کرد کۆتاییم پێ هێنا؟.
– یا قەتلی حسینم کرد: شاعیر ئەڵێت خودایە بۆ وات لێبەسەرهێنام خۆ من حەزرەتی حسینم شەهید نەکردووە کە کچەزای پێغەمبەرە (د.خ) و کوڕی حەزرەتی ئیمامی عەلییە.
(٢) ئۆمی: خوێندن و نووسین نازانێت.
(٣) شیسی: شاعیر بەدەست خەتی خۆی لە پەراوێزی شیعرەکەیدا نووسیویە: ناوی پێغەمبەری خودایە.

خــووا گــرتوو دڵە؛ تاکــەی ئەناڵی
لە دووی کێیە عەزیزم وا عەواڵی[1]؟
ڕەفــیــقــێکت نەبوو زامت دەواکــا
برینـاری مــــوژەی دوو چاوی کـــاڵی
شـــەرابم بۆیە پێـــخـــۆشـــە بەدایم
ئەدا نەشــئــەی مــژینی لێــوی ئاڵی
بەحــیلە کــێــیــە وا ڕۆحم ئەکــێــشێ
خـــووا بینـێـــرە بۆ زاڵم زەواڵی[2]
ڕەقـیـبی سـەگ هەمـوو کـاری بەفـێڵـە
مـەخـۆ تەفـرە مـەکـە ئەی دڵ دەلاڵی؟
مـــەوەســـتـــە بیـکوژە خـــوێنی بڕێژە
ئەوا (ئەسـعـەد) ئەدا فـتـوای حـەلاڵی

١٩٦٩

(١) عەواڵ: بەپەرۆشەوە بەدوایدا ئەگەڕێت.
(٢) زەواڵ: زوال: نەهێشتن و لەناوبردن، پێ ئەچێت وشـەکـە عـەرەبی بێت و وەک پەندە کـوردیەکـە نەوترێت هەموو زاڵمێک زەواڵێکی بۆ پەیدا ئەبێت... واتە زوڵم و ستەم تا سەر نییە و نامێنێت.

***



١

ئەوا باری گــوناهم زۆر و ســەنگینە خــووا ڕەحــمێ
لەگەڵما نەفسی پیسم مەیلی جەنگینە خووا ڕەحمێ[*]
لە بەحری ڕەحمەتی تۆ بەسمە نەختێ بۆ هەموو دەردەم
دڵ و جـەرگم بەجـاری مـات و ژەنگینە خـووا ڕەحـمێ
ئیرادەی لوتفەکەت بمخاتە سەر ڕێی مەککە ئەمجارەش
لە (مـشـعـر)دا شعـورم پاک و ڕەنگینە خووا ڕەحـمێ
گـرێکی دڵ بە (لبـیـک)ەی صـەفـایە تاوەکـو مـەروە
تەوافی حـەق بەنووری (روضـە) ڕەنگینە خووا ڕەحـمێ
سـەگی ئەسـحـابەکـانی تۆیە (ئەسـعـەد) یا رسـولەڵلا
شـەفـاعـەت کـە گـوناهم باری سـەنگینە خـووا ڕەحـمێ

٨ی ذی القیعدە/ ١٣٨٤ک

(*) شاعیر ئەم شیعرەی بەدوو جۆر بەدەستخەتی خۆی نووسیوە، لە یەکەمیاندا کە دوو سەروای لە هەر بەیتـێکدا بەکارهێناوە (ەنگینە خوارەحـمێ) و جگە لە دوو وشە لە سـەدری بەیتی یەکەم لە بریتی (زۆر) (قورس)ە بەکارهێناوە و لە سەدری بەیتی دووەمیشدا لە بریتی (نەختێ) وشەی (دڵۆپێ)ی بەکارهێناوە هەروەها گۆڕانکاری بەسەر هەندێک وشەی بەیتی چوارەم و پێنجەمیشدا هاتووە.
کەچی لە دەستخەتی دووەمدا لە بریتی دوو سەروا سێ سەروای بەکارهێناوە یەکێکیان لە هەموو دێرەکـاندا ئەگۆڕێت و دوو سـەروای دوایی وەک خۆی لە سـەدری بەیتی یەکـەم و تێکڕای عـجزی بەیتەکاندا دووبارە بۆتەوە و بەمەش شاعیر گۆڕانکاری و بەرەو پێشچوون بەهونەری شیعرییە وەی ئەینرێت بۆیە: بەباش زانرا هەردوو تێکستەکە بڵاوبکرێتەوە... ئەگەرچی یەکەمیان مێژووی دانانی لەسەر نووسراوە و هی دووەمیان ڕۆژی هۆنینەوەی بەسەرەوە نییە.

***

## ٢

ئەوا باری گوناهم قورس و سەنگینە خوا ڕەحمێ خوا ڕەحمێ
لەگەڵما نەفسی پیسم مەیلی جەنگینە خوا ڕەحمێ خوا ڕەحمێ
لە بەحری ڕەحمەتی تۆ بەسمە دڵۆپێ بۆ هەموو دەردەم
دڵ و جەرگم بەجاری مات و غەمگینە خوا ڕەحمێ خوا ڕەحمێ
ئیرادەی لوتفەکەت بمخاتە سەر ڕێی کەعبە ئەمجارەش
لە (مشعر)دا شعورم، پاک و ڕەنگینە خودا ڕحمێ خودا ڕەحمێ
سەفوەتی سینەم بەلەببەیکەی سەفاو مەروە پەیدابوو
بەبوونی نوری ڕەوضەیە شەرعی ئەم بەنگینە خوا ڕەحمێ خوا ڕەحمێ
سەگی ئەسحابەکانی تۆیە ئەسعەد یا ڕەسولەڵڵا
شەفاعەت کە، گوناهم قورس و سەنگینە خودا ڕەحمێ خودا ڕەحمێ

***



بەنوکی پەنجە بەس بێ وا ئەزانم میری بابانی
لە بابی بێ وەفایی شا ئەڵێی شێخی سولەیمانی
نەبوو لایە لە من کا دەردەدار و عاشقی خۆیم
بەقوربانی خودا بم بۆ نەماوە مەیلی جارانی
لە مەیدانی تەرسقەت گەر نەزەر کاتە دڵی ئێمە
نەکو من شێخی صەنعانیش ئەبێتە قۆچی قوربانی
نگینی حەق کە بوو سەیری کوڕ و باب و نەسەب ناکا؟
هەزار لات سڕو سواڵکەر ئەکاتە شاهی ئێرانی[1]
منی بێ کەس حسابم کە لە ڕیزەی موچە خۆرانا
هەموو بوونە ڕیجال و گەیینە ڕوتبەی میری میرانی
نەتۆپێ نەفسی پیسم، ناگەمە ڕیزی خوا پێداو
ئەمەش خەیلی گرانە بۆیە کەوتوومە پەرێشانی
لەتۆڵەی لۆمەیی بەدخوو هەناسەی سارد و فرمێسکم
بەگژیانا ئەکەم تا دێنە سەر ڕێگەی مسوڵمانی
نیگارم پێمی فەرموو گیانی من ئەم وەعزە شیرینە
هەتا ماوی لەبەرکە (ئەسعەدا) ئایاتی قورئانی
١٩٧٠

---

(١) شاعیر لەم بەیتەدا گلەیی لە بەختی خۆی ئەکات و ئەڵێت، مەلی نگینی هەق بۆچی بەسەر سەری کەسانێکەوە ئەنیشیتەوە کە کەس نەزانێت کێن و لە کوێیەوە هاتوون و هیچ حسابێک بۆ ئەسڵ و فەسڵ و نەسەب ناکات، تاکو بەرد لەشوێنی خۆی سەنگین و بەنرخ و بەهادار بێت.

***

شـــەربەتی مـــەرگم ئەوێ ئاوی حـــەیاتم ناوێ
بەرگی فـەقـرم فـەخـرە لا تاجی خـەڵاتم ناوێ[١]
من کـە مـەعلومـە لەلام ئەم فـەلەکـە بێ عـەهدە
دەبڕۆ چەرخی دەنی عـــەهد و وەفـــاتم ناوێ
لەحزەیە عـاقـیـبەت و ئەوەڵـی خۆت سەیری بکە
تێ ئەگـەی هیـچـە زەمـان بۆیە خـەباتم ناوێ
پاکی و عیلمە شەرەف، چی لە جبەی جانی ئەکەم
جە بەکـەن، لۆمـە گرم مـەدحی صیـفـاتم ناوێ[٢]
هەر ئەبێ بمرێ هەمـوو لا چ فـەقـیـر و چ غـەنی
ئیکە ئەی مـیـــری، ئەمن پوول و بەراتم ناوێ
کوێوە چوو فەلسەفە و عەقڵی لە بیبانی قەدیم
بێ حەیا نەفسە ئەڵێ: ئێستە مـەمـاتم ناوێ
وا لەبۆ بەختی گەلم عەینی، یەکە دوشمن ودۆست
لادە لێم یاری عـــەدو ڕەقس و ســەمـــاتم ناوێ
عـیللەتی دەردی دڵم چاری بەکەس نەبووە نییە
ئەی پزیشکانی دەنی ناشی دەواتم ناوێ
خـاینی دینی (مـوبین) بەسییە توانج و تەعنە
گـەر وتارت شـەکـرە نوقڵ و نەباتم ناوێ[٣]
دەرکەوە پیسی مەکە، کەعبەیی ئەربابی وەفا
لەو سـەرو کـەللەیە، من خـێـر و بەراتم ناوێ
چوون نەمـا مـەردێ کـە دڵ ئولفـەتی لابگرێ
(ئەسعەدا) ڕاسی ئەڵێ: ژین و حەیاتم ناوێ[٤]

١٩٤٧

(١) سەرەتا شاعیر ئەم شیعرەی داناوە و دواتر بۆ خۆی بەیتی (٩، ١٠)ی بۆ زیاد کردووە و لەگەڵ تەواوی شیعرەکەشدا گونجانوویەتی.

(٢) جبەی جانی: جبە یاخود عەبای گوناهبار.



– جەبە کەن: جەبە: سڵ، سڵبکەنەوە

(٣) دینی موبین: ئاینی پاک و پیرۆزی ئیسلام.

(٤) پێم سەیرە کە یانزە بەیتە، ئەبوو (دە) یاخود (١٢) بەیت بوایە، چەند سەر و سۆراخیم کرد و دەفتەرە دەستنووسەکان گەڕام هەر ئەمەندە بوون.

***

بێ قــەباحــەت پیــری دڵ بۆچی پەرێشــانم ئەکــەی
بەند بە بەندی سیلسیلەی گێسووی جانانم ئەکەی[1]
دڵ کـەتابی تیـشکی چاوی تۆی نیـیـە قـوربان ئەوەن
بۆ بەمـــوژگـــانی ڕەشت واتیـــرە بارانم ئەکـــەی؟
بۆ گوشادی مەکتەبی (طب) ڕاستەوخۆ لوقمانی تۆ
سەد ئەرەستۆ فێر ئەکەی وێڵی پزیشکانم ئەکەی[2]
نەو نەمــامی قــامــەتت کـەوتۆتە چاهی یوســفی
خوا ئەزانێ تووشی دەردی پیری کەنعانم ئەکەی[3]
بۆنی تۆ هات و شکا بازاڕی عـــەتری عـــالەمی
جـوان و پیـری ملشکان و تازە دەرمـانم ئەکـەی[4]
ئاگـری عـەشـقت گـڕانی مـەنجـەنیـقی سـینەکـەم
بۆی کـزەی جـەرگە وەها مـەحـجـوبی یارانم ئەکەی
ڕێ ئەدەی بێتن عـەد و بۆ سەیری تورەی شا پەسەند
خـادیمی تۆ (ئەسـعــەد)ە بۆ وێڵی شـارانم ئەکـەی

١٩٥٠

---

(١) قەباحەت: خەتا، گوناه... بێ قەباحەت: بێ سووچ و گوناه.
(٢) گوشاد: کراوە زۆجار بەواتای خاڵیش دێت.
– لوقمان: مەبەست لوقمانی حەکیمە.
(٣) قامەتت: بەژن و باڵات.
– یوسف: مەبەست یوسفی کەنعانە.
(٤) لەم بەیتەدا ئاماژە بەوە ئەکات... منالّی ساوای تازە لە دایکبوو، بەبۆنی تیژی عەتر یاخود هەر بۆنێکی لەو جۆرە دووچاری حاڵەتێکی نالەبار ئەبێت و ئەوترێت:
ئەو منالّە بەبۆنکەوت... کـەچی لێـرەدا جـوان و پیـر بەبۆن ئەکـەون و وەک منالّی سـاوا ملیـان ئەشکێت، وێنەیەکی بەراوردی وردە و هونەرێکی ناسکە کە شاعیر بەکاری هێناوە.

***



## جامی جیهانبینی ئەکەی

وێنەکـەی عـەشـقم، برا وەک لەیل و مـەجنونم ئەکـەی؟
بێ بەدەردی ئێـوە، کـونبێ سـینە تەحـسـینی ئەکـەی؟
بۆی هـەناســـەت هاتـووە، دڵ بۆیە کـــەوا بوردەوە
حەوسەڵەی نەبووە و نییە، بۆ باری سەنگینی ئەکەی[1]
چۆن ئەسـیـری داوی زوڵفـە، زەحـمـەتە ڕزگـاریبێ
وا لە حـالّی مــردنایە، گــوێ لە ناڵینی ئەکــەی؟
پیس نەفــەر بوو؛ خــادیمی دەروانەکــەی نوورینی تۆ
زۆر شـوکر جـانا، بەیەک خـەت، تۆ کـە تەعـینی ئەکەی
کـــۆتری بێ باڵ و پەڕبوو، بولبــولی مــاڵی خـــووا
بۆ بەچاوی ژێر دەستی شـمـقـار و شـاهێنی ئەکـەی[2]
من لەوێنەی خـۆمـە بێـزارم، لەکـاتی سـاغـیــیـا
ئێستە (ئەسعەد) مردووە، جامی جیهانبینی ئەگەی؟

---

(١) کەوا بوردەوە: کەوا بوورایەوە، لە هۆش خۆی چوو.
– حەوسەلەی نەبووە: سەبر و ئارامی نەبوو... بێ حەوسەڵەیە: بێ تاقەتە... بێ مەیلە.
(٢) شمقاڕ: مەلێکی جوان و ئازا و زیرەکە و بۆ ڕاو بەکاردێت.
– شاهین: مەلێکی هوشیار و ئازایە و بۆ ڕاو بەکاردێت.

***

وا ئەزانم گیـــانە تۆ تەرکی عــەشـقــداری ئەکــەی
خوێنی سووری کەو بەسەر خاڵ و ملی جاری ئەکەی؟
نـایەڵی قـــاقـــبـــەی بێ صـــبح دەم بۆ لای دڵم
مـەجلیسی ڕەندان و شۆخی پڕ لە غـەمـباری ئەکـەی؟
هەڵگرە دەستت لە کردە و ئیشی وا ئەی گیـانی گەل
گــەر دەوامت بێ لە ڕاوی ســینەکــەم ناری ئەکــەی
ئاو لە لووتی نێــرەکــەو ئەتکێــتــەوە بۆ مــاکــەوی
ئەیکوژی ئەو عـاشـقـە وا مـەنعی دڵداری ئەکـەی؟
بابمێنێ دەنگ وگــرمــەی کــێــو و کــەژ ئاوا بکا
تەرکی کە، کـاری وەها تۆ مەشقی سەرداری ئەکەی؟
حاڵی (ئەسعەد) تێک مەدە لەم چاوەوە سەیری بکەی
گـەردن و پێ سـوورەکـانی پڕ لە مـرواری ئەکـەی[1]

**١٩٧٠**

---

(١) هەر لە باوانەوە، مەلا ئەسعەدی مەحویی شاعیر پەیوەندی تێکەڵیەکی دۆستانەی لەگەڵ شێخ لەتیفی شێخ مەحموودی حەفید بووە و وەک هاوتەمەنێک و هاوڕێیەک پێکەوە کۆمەڵی برایەتیان لە شـاری سلێـمـانی دامــەزراندوە و دواتر سـاڵی ١٩٤٢ لە ئەنجـامی ڕاوەدونانیـان لە لایەن دەســتــەڵاتدارانی پاشـایەتی عـێــراق ڕوویان لە سـەردەشت کـردووە و پێکەوە ئیـدارەیەکی دەستەڵاتداریان لەوێ دامەزراندوەو دواتر تا دوا تەمەنی ژیانیان، هەر بەدۆستی و دڵسۆزی گیانی بەگیانی یەک مانەوە و ئەم شیعرەشی بەبۆنەی (ڕاوەکەوە)وە بۆ شێخ لەتیفی وتووە.

***



## پێنج خشتەکییەکان

«پێنج خشتەکی لەسەر دوو شعری فارسی»[*]

بۆ فـــیـــراقی لەبی یارم دڵی من هاتە نیـــدا
وتی جـانا نیـــیــە چارەی غـەمی جـەرگم بەخــودا
کەوکـەبی بەخـتی ڕەقـیـبم لە سـەما شـوعلە ئەدا[1]
ابر مـــیـبـــارد من مـــیــشــوم از یار جـدا
من جــدا گــریە کنم ابر جــدا یار جــدا

*

سـەرزەنشـتم مـەکـە ئەی پیـری خیـرەد مـەردی خـدا
فــایقــە مــاچی دەمی حــیکمـــەتە ئەربابی هودا
تاجی عــەشـقـم لە ســەرایە، نیـــیــە باکم ئەبەدا[2]
در دلم بود کــە هرگــز نشــوم از تو جـدا
چکنم چارە ندارم کـە خـدا کـرد خـدا[3]

---

(*) پێنج خشتەکی تەوەرێکی دیاریکراوی هونەری شیعرییە، شاعیری بەتوانا و شارەزای دنیای ئەدەب و ڕۆشنبیری پەنای بۆ ئەبات... بەکارهێنانی ئەم هونەرە وردەکاری و لێهاتوویی و بەهرەی شیعری شاعیری ئەوێت و زۆر جار شاعیر جگە لە شارەزاییەکی تەواوی زمانی زگماکی خۆی پێویستە زمانی ئەو شاعیرەش باش بزانێت کە پێنج خشتەکییەکەی لەسەر ڕێک ئەخات... چونکە پێنج خشتەکی بریتییە لەوەی شاعیر شیعری شاعیرێکی دی بەلاوە جوان و پەسندە و پێی سەرسامە... سا ئەو شاعیرە بەزمانی زگماکی، ئەو شاعیرە شیعرەکەی هۆنیبێتەوە یا خود شاعیری نەتەوەیەکی جیا لە زمانی نەتەوەیی شاعیر بێت. بەڵام پێویستە لەسەر هەمان کێش و سەروا و ئاوازی مۆسیقا شیعرەکەی دابڕێژێت و سێ دێری یەکەم هی ئەو شاعیرەیە کە سەرسامە بە شیعری شاعیرەکە و دوو دێری دوای ئەو سێ دێرەش هی شاعیرەکەی دییە. وەک لەم دوو پارچەیەدا دەردەکەوێت.

(١) نیدا: نداء، هات و هاوار.

– کەوکەبی: ئەستێرەی.

– لە سەما: لە «سماء»، لە ئاسمان.

– خیرەد: خرد، ژیری و هزر.

– فایقه ماچی دەمی: ماچی دەمی شفایه، یا خود بەماچی دەمی ئاواتم هاتۆته دی.
– ئەرباب: هاوچەشنی له زەوق و بەستدا.

ئەم دێره بەو واتایه هاتووه: ماچی دەمی بۆ من خۆشەویستی ئەگەینێت هەر وەک کاتێک دایک جگەر گۆشەی ماچ ئەکات، حکمەتێکی خودایه و پڕه له ناز و خۆشەویستی.

(٣) بۆ ئەو بەیتە شیعرانەی هی شاعێرێکی دین یا خود بەزمانێکی دی تێهەڵکێش کراون بەڕاست زانرا لێکدانەوەی ئاراسته نەکرێت.

***



(پێنج بەندی لەسەر غەزەلێکی فارسی حەزرەتی مەولانا خالدی نەقشبەندی)

شین و واوەیلایه وا ئاساری مەحشەر بوو بە ڕاست
لابه مەی ئەی ساقیا، بشکێنه شووشەی دەستی ڕاست
چیم له دەنگی تار و عودە نامەوێ ئاوازی ڕاست[١]
«جای جانا انست اینجا مایەی جانم کوجا است
منزلی سلطانی خوبا انست سلطانم کجاست»
ون بووه لەو ساوه لەیلم شینه ئیشم باوەکەرۆ
غەم بە سەرما هاته بارش مامەوه بێ ڕەنگ و بۆ
حاڵەکەم بەد حاڵییه پەتیاره بووم و ڕەنجەرۆ[٢]
«همچو مجنون کوه هامون میستردم بهر او
سو بەسو میجویەمش اما نمیدانم کجا است»
لاده لێم، ئەی زاهیدا مەگرە بەهانه و گیر و دار
کوێره کوژراوم مەکه ئەی زاڵمەی دڵ بەرد و دار
حەوسەڵەی وەعزم نییه نەم ماوه خۆ سەبر و قەرار[٣]
«اشکبارم بی قەرارم دردمند و دلفگار
(قره العین)م کجا ئارامی جانانم کجا است»
بۆ مژینی غونچەیه، دێوانەیی هاتوومە خول
ئەچمه باغی مونکیران و ئەبمه یاری قەومی قول
عەیب و عارم لێ بکه بێ نرخه دون و لات و گول
«بلبل فصل خزانم واله و شیدای گل
ای دریغا تو گلی گلزاری رضوانم کجا است»
چونکه مەستی چاوی تۆم جانا هەتاکو مردنم
ڕوو له میحرابی برۆت خۆ زەحمەته دەر بردنم
باخەوانی باخی ئێوەم ناحەقه دەرکردنم
«قمری بیچاره ام توقی وفا در گردنم
هر طرف کوکو زنان سر خرمانم کجا است»

(ئەسعەدا) زار و نەحیف و چیهرە زەردم وەک هیلال
دووی ئەجەل کەوتم نەما دەرچوو خەیاڵی زولف و خاڵ
هەر وەکو فەرموویە شێخم با نەکەم بیری ویسال[٤]
(خالدا) خاطر زخوبانی جهان دارد ملال
دل ربایی نازنینم ناری بستانم کجا است
١٩٦٠

---

(١) وا ئاساری مەحشەر: لێرەدا ئاسار «آثار» بەشوێنەواری مێژوویی نایەت، بەڵکو مەبەست لەوەیە: نیشانەی ڕۆژی حەشر «ڕۆژی قیامەت» دەرکەوت.

– ئاوازی ڕاست: ئاوازی گۆرانییەکی ڕەسەنی ناوچەی گەرمیانە.

(٢) غەم بەسەر ما هاتە بارش: غەم بەسەرما دایکرد.

(٣) حەوسەڵەی وەعزم نییە: توانا و تاقەتی وەعزم نییە.

(٤) نەحیف: لەڕ و لاواز.

– چیهرە: دەموچاو و ڕوو.

– ویصال: بەیەکگەیشتن، بیری ویصال نەکەم: بیر لەوە نەکەمەوە بەو کەسە بگەم... زیاتر بۆ یار و دۆست و خێزان بەکار دێت.

***



## پێنج خشتەکی لەسەر غەزەلێکی فارسی – حەزرەتی مولانا خالدی نەقشبەندی

بۆ کەساسی نیشتمانم، با بناڵێنین بەزار
لاوەکانی بێ نەوا فەوتا، بەکردەی کردگار
خوێن لە چاوم دێنە خوارێ هەر لە جەوری ڕۆژگار
«موسمی عید است ما نومید از دیدار یار
عالمی در عیش نوش ما و چشمی اشکبار»

ئەی برا دنیا بەهەشتی غەیرە بۆ ئێمە سەقەر
وا لە بن باری غەما کەوتوینە دەشتی پڕ خەتەر
قەت نەبوو بێنی فرح بۆ ئێمە نەختێ سەر بەدەر
«سینە سوزن دلفروزان کوچە کوچە دربدر
کس مبادا همچون من ئاوارە از یارد دیار»

قوڕ بپێون ئەی براگەل سەیری کە بوگینە پەند
عالەمێ سەر بەرز ئەژین، ئێمەین ئەوا کەوتوینە بەند
هەر لە بۆ تۆیە وەتەن، ێژم بەدەنگێکی بوڵەند
«بینوا و دل پر از خار غریب دردمند
دست بر دل سر بزانو چشم در ڕە دلفگار»

میللەتی کوردە بەدایم (ئەسعەدا) وا تووشی دەرد
بێ کەس و بێ داڵدەو مەهتوک و حەپس و ڕەنگی زەرد
سووچی گشتی هەر نیفاقە هەڵئەکێشن ئاهی سەرد
«(خالدا) گر نیستی دیوانە و صحرانورد
تو کجا کابل غزنین خاک قندهار»

١٩٤٢

---

شاعیر ئەم شیعرەی لە جەژنی ڕەمەزانی ساڵی ١٩٤٢ لە شاری سەردەشت، بۆ کەساسی نیشتمان وتووە.

***

پێنج خشتەکی لەسەر دوو شیعری شێخ مەحموودی حەفید لەسەر داخوازی خۆی[*]

دنیا بەمەسەل فاحیشە و خەرمەگەسێکە
بێ عەهد و وەفا دوون و دەنی وەک جەرەسێکە
گەه یاری کەر و گەه لە ملی ئەبلە ڕەسێکە[1]
«لوطف و کەرەم و قەهری دەم و دەس و نەفەسێکە
هەر ساتە بەرەنگێک و لەسەر طەبعی کەسێکە»

باوەڕ مەکە جانا کە ببێ ساغی محببەت
هەر وا بەدرۆ ئەیخەنە دەرها داغی محببەت
پشەیی حەسەنی زاڵمەکەی زاغی محببەت[2]
«تەخریبی گوڵی یاسەمەند و باغی محببەت
کرداری لەسەر کەیف و هەوابی تەرەسێکە»

١٩٤٥

---

(*) ئەم پێنج خشتەیە لەسەر دوو بەیتی شێخ مەحموودی حەفید کە بۆ شاعیری ناردووە و بەدەمیش پێی ڕاگەیاندووە ئەمە سەرزەنشتە، لەسەر ئەو هەواڵەی بەشێخ گەیشتووە کە گوایە: شاعیر بەنیازە ژن بەسەر خێزانەکەی بهێنێت.

(١) فاحیشە: ئافرەتی بەدخۆ.
- خەرمەگەسێکە: وەک مێشە سەگانە وایە.
- ئەبلە: گێل، کاڵفام.

(٢) زاغ: ئەوەی هێلێک بۆ جەرگەی مەبەست ئەبات.

***



## پێنج خشتەکی

سەرچناری چاوەکانم شێوەبی گوڵنارییە
خەرمەنی سووتاوی جەرگم شاهیدی غەمبارییە
دڵ لە دەردی نیشتمانی کوورەیەکی نارییە
کوا نەسیمی تۆ وەتەن بینێرە دەردم کارییە
مەیخەرە ڕۆژی حەشر تووبی خوا ئەم زارییە

بۆ وەتەن فەوتاوە دڵ قوربانە شینم بۆ مەکەن؟
من کە مردم بۆ خوا ناڵە و ئەنینم بۆ مەکەن؟
حاجەتی وەعزم نییە تەڵقینی دینم بۆ مەکەن؟
وا لە ڕێی کوردا ئەڕۆم و باسی ژینم بۆ مەکەن؟
ئەو حەیاتەی خەرجی ئەو بێ مایەیی هوشیارییە[1]

بەرد و داری شاخەکانت ئەی وەتەن گوڵزارمە
بێ نەسیمت تەن لە جان و جەن لە تەن بێزارمە
بۆ ئەسیری تۆیە دایم داد و گریە و زارمە
خوێنی بێ تاوانی لاوت باعیسی ئازارمە
هەر لە بۆتۆ قوڕ ئەپێوم بەم دڵەی غەمبارییە

ئەی وەتەن کوا قارەمانی شاخی کوردستانەکەت
کوا دلێری حەیدەریت و ڕۆڵەیی مەستانەکەت
کوانێ شاهی خەسرەویت و شێری ناو بوستانەکەت
بۆ نەماوە دەنگ و باس و سروەیی هەستانەکەت
خوابی غەفڵەت بەسییە نۆبیی بێدارییە[2]

ئەی وەتەن مەحکومی دەستی زاڵمی ئەم شارە خۆت
ئەی وەتەن فەوتاوی دەستی قەومەکەی بێکارە خۆت
بوویە فتبۆڵی شەقێنی میللەتی پەتیارە خۆت
دەستە پاچە و ڕووتوقووت و بێ کەس و بێچارە خۆت
بووینە میکرۆبی ژیانت سەیری ئەم غەددارییە

هەوری نەگبەت بای نیفاقی کوردی پێ جەنگین ئەبێ
یەعنی بۆ ژینی ئەسارەت یاری پێ سەنگین ئەبێ
خوێنی ئاڵی لاوەکانی یەک بەیەک ڕەنگین ئەبێ
قەومی نووستوو ئەی وەتەن هەر جەوهەری ژەنگین ئەبێ
بۆیە ناڵەی زاری من، زاری لەمن بێزارییە[٣]

جەژنی قوربانە سبەینێ کوردە ڕۆژی سۆزمە
جەژنە پیرۆزی لەبۆ من ناڵەیی جەن سۆزمە
ئەم جلی والآیە (ئەسعەد) ئاگری دڵسۆزمە
بۆ بەهاری ڕۆژی کوردە چاوەڕێی نەورۆزمە
ئەهلی دانش (ئەسعەدە) پیشەی بەدایم زارییە[٤]

١٩٣٠

(*) شاعیر بۆ خودی خۆی و بێ ئەوەی پەنا بۆ شیعری هیچ شاعیرێک بەرێت ئەم پێنج خشتەکیەی هۆنیوەتەوە، ئەمە نیشانەی بەهرە و توانای شیعری شاعیر دەر ئەخات.
(١) ئەنینم بۆ مەکە: شین و زاریم بۆ مەک، یا خود مەنووزینە و نووزە نووز مەکە.
– تەڵقینی دێنم بۆ مەکە: تەلقین بۆ مردوو دا ئەدرێت.
(٢) مەستانە: مەست و خومارە.
– شێری ناو بوستانەکەت: شێری ناو باخ و بێشەی چڕ.
– (بۆ تەماوە دەنگ و باس و سروەیی هەستانەکەت): شاعیر لەو دێرە شیعرییەیدا هوشیارانە ڕوو ئەکاتە میللەت و ئەڵێ: بۆ هەڵوێستی بەرخودان و ڕاپەڕین و شۆڕشتان دیار نییە؟ چونکە دەنگی بەرگری وەک سروەی بەری بەیان ئاهێکی فێنک بەدەروونی ئاگراوی ئەبەخشێت.
(٣) (بۆیە ناڵەی زاری من، زاری لە من بێزارییە) لەم دێرە شیعریەدا... وردەکارییەکی هونەری بەرزی شیعری بەکارهاتووە و لە نێوان هەر دوو (زاری)دا ڕەگەزدۆزیەکی پڕ واتای جوان بەکار هاتووە.
(٤) ئەهلی دانش: ئەهلی زانست.



پێنج خشتەکی لەسەر دوو شیعری فارسی

بۆ فیراقی لەبی یارم دڵی من هاتە نیدا
وتی: جانا نییە چارەی غەمی جەرگم بەخودا
کەوکەبی بەختی ڕەقیبم لە سەما شوعلە ئەدا
ابر میبارد من میشوم از یار جدا
من جدا گریە کنم ابر جدا یار جدا

سەرزەنشتم مەکە ئەی پیری خیرەدمەردی خودا
فائیقە ماچی دەمی حیکمەتە ئەربابی هودا
تاجی عشقم لەسەرایە نییە باکم ئەبەدا
در دلم بود کە هرگز نشوم از تو جدا
چکنم چارە ندارم کە خدا کرد خدا

***

**فارسی**

جان من رفت بغربت شهی گیلان مددی
میگرم آب شده پیر مریدن مددی
دل طپید از غم او خم شده است قد مرا
کو احیا زنده شود حضرت عثمان مددی
یاد چشمش بکنم تاب ندارند ضمیر
گر جدا میشوم از وضع پشیمان مددی
راحت روح فرا از لب میگون قو است
وای وای گر نکند لطف حبیبان مددی
«اسعد» آن وعده که دادند بقتلم رفت است
باز میخاهم از آن رحمتی احسان مددی(*)

---

(*) ئەمەش شیعرێکی فارسی ئەسعەد مەحوییە و بەباش زانرا، لە دوای پێنج خشتەکییەکانەوە دابنرێت.



هەستە باوانم وەتەن بیپۆشەوە بەرگی ڕەشت
وا بگریە چاوەکەم، بێتەدەرێ خوێنی گەشت
سەر لە قوڕ نێ بۆ نەمانی ڕۆڵەکانی بێ غەشت
قەت نەبوو گەنجی نەبینی بێ پشوو ڕۆژی ڕەشت
لەت لەتە جەرگ و دڵم بۆ جوانەمەرگانی دلێر
قوڕ ئەپێوێ بۆ کەساسی ڕۆڵەکانی نێرە شێر
پێنەگەییوە تاکو ئێستا وەک ئەمانە شێری نێر
خۆ لە خوم نێ، ئەی وەتەن ببینیتەوە ڕۆژی ڕەشت[1]
ئەی وەتەن ساڵێ نەبوو یەک دەفعە ڕۆژت ڕەش نەبێ
گەردنی گەنجانی تۆ ڕەنگین بە خوێنی گەش نەبێ
ماڵ و موڵکی ئەم گەلە دایم وەها بەش بەش نەبێ
شینی ئەیلولت بکەم یا نۆزدەیی مانگی شەشت[2]
بۆ ڕژانی خوێنی جەرگی زابتی لاوانی کورد
بۆ پڕانی ڕۆشنایی بیلبیلەی چاوانی کورد
واجبە بۆ تەعزیەی کوژراوەکەی باوانی کورد
گیانی من شینێ بکەی (تأریخ) بنووسێنێ بە شت
(عیززەتم)بوو، چوو لەدەس، ڕۆیی(محەمەد) ناوەکە
شینی (خیرالله) ئەکەم هەم (مستەفا خۆشناو)ەکە
ڕۆڵەیی بێ باوکە هاوارییە ئەی باوەکە[3]
بمرە (ئەسعەد) هەمدیسان ببینیتەوە ڕۆژی ڕەشت

١٩٤٧/٦/١٩

---

(١) خۆ لە خوم نی: خۆت ڕەشپۆش کە.
(٢) ئەمە شینە بۆ لەسێدارەدانی چوار ئەفسەرەکەی کورد لە ١٩٤٧/٦/١٩دا.
(٣) عزەتم: ئەفسەری نیشتمانپەروەری کورد عیزەت عەبدولعەزیز.
– محەمەد: ئەفسەری نیشتمانپەروەری کورد محەمەد قودسی.
– خەیروڵلا: ئەفسەری نیشتمانپەروەری کورد خەیروڵلا عەبدولکەریم.
– مستەفا خۆشناو: ئەفسەری نیشتمانپەروەری کورد کە هەر چواریان لە سێدارە دران.

ئەی پەناهی بێ کەسان بۆ هەموو کەس هەر دەلیل
ئەی دەوایی جەرگی پارە، مەرهەمی قەلبی عەلیل
ئەی حەبیبی خالقی عالەم (ترحم) ئەی خەلیل
تۆ شەفیع و شافیعی من مامەوە دوور و زەلیل
«السلام» ئەی مەنبەعی ئەسراری حەق و نووری پاک
«السلام» ئەی گەوهەری دەریای وەحدەت دوڕی چاک
«السلام» ئەی خاوەنی میعراج و تاج و مۆری پاک
تۆ شەفیع و شافیعی من مامەوە دوور و زەلیل
کەی ئەبێ یا ڕەب ببینم، من بەشاهەنشا بکەی
تەخت و بەختم ژووری مانگ و زوهرەیی عولیا بکەی
یەعنی (ئەسعەد) واصیلی زیارەت گەهی تەها بکەی
تۆ وەصیل و واصیلی، من مامەوە دوور و زەلیل[1]
وا بەدەردی عەشقەوە، ڕیشەی دڵم بڕیانەوە
کەرتی جەرگم دێتە دەر، ئێستە بەدەم گریانەوە
دادی کۆهی لەیلمە بەم سینەیی بریانەوە
تۆ وەصیل و واصیلی، من مامەوە دوور و زەلیل
یا ئیلاهی دڵ سووتاوی دووری خاکی (یثرب)م
ئارەزوویی جیلوەیەکی نووری خاکی (یثرب)م
بۆ دەوا پێویستەکانی تۆزی خاکی (یثرب)م
بگرە دەستم (یا محەمەد «ص») ئوممەتی تۆم و زەلیل[2]
(یا محەمەد) من سەگی ئەصحابی تۆم و تابعین
ڕووڕەش و پیس و بەد و بڵحم یەقین
کوێرە (ئەسعەد) بێ دەسە بێ داڵدەیە هەم بێ معین
بگرە دەستم «مستەفا» ئوممەتی تۆم و زەلیل[*]

(١) تاها: تەها، طاها، ئەو کەسەی وێنەی نییە، بێ وێنە، مەبەست لە پێغەمبەرە (د.خ).
(٢) یثرب: مەدینەی منەوەرە، کە مەرقەدی پێغەمبەری موسڵمانانی حەزرەتی محەمەد (د.خ) لێیە.



شاعیر لەو چوار خشتەکییەیدا، ویستوویەتی، بەهرەی هونەری خۆی لە بواری هونەری شیعریدا تاقی کاتەوە، هەر بۆیە... لەم چوار خشتەکییەیدا، ئەو هونەرە نوێیەی بەکارهێناوە و دێری بەیتی دووەمی، چوارینی یەکەم و دووەم، وەک خۆی دووبارە کردۆتەوە و هەمان ڕێبازیشی بۆ چوارینی سێیەم و چوارەم، لەلایەک و لەو لاشەوە بۆ چوارینی پێنجەم و شەشەم هەمان هونەری بەکارهێناوە. ئەو تازەگەرییە، لە هونەری شیعریدا گرانە، چونکە شاعیر ناچار ئەکات، پابەندنی ئەو کێش و سەروا و ئاواز و واتایە بێت کە لە دێرە دووپاتەکەدا سازیان ئەکات. ئەمە نیشانەی داهێنانێکی نوێی شیعرییە لە چوار خشتەکیدا و ڕاست وایە ئاماژەی پێ بکرێت و فەرامۆش نەکرێت.

***

ئاسمەن پڕ جونبشە، ئەمشەو لە ناڵەی پیری من
جەرگ و دڵ سووتا، لە شوعلەی ئاهی پڕ تەئسیری من
وەسڵی دولبەر گەر نەبێ ئەسڵەن نییە تەدبیری من
سەد ئەرەستۆ چاری ناکا سینەکەی پڕ تیری من[١]

***

وێڵ و سەرگەردانم و بێ قیمەت و بێ مایە بووم
بێ ئەنیس و مونیس و بێ سەروەر و بێ سایە بووم
ڕووت و قووت و عاجز و بێ مەلجەئو بێ پایە بووم
وا بەشێتم تێ ئەگا خەڵقی ئەکا زنجیری من[٢]

***

سەیری ئەحواڵم برا کاتی فەرەحناکم نییە
دەرد و حەسرەت کوشتمی ڕۆژێکی ڕووناکم نییە
دوشمنی خائین نەبێ یارێکی دڵپاکم نییە
بەردە بارانم ئەکا باب و برا و باپیری من

***

عاجز و خاوەن عەدد و مەحرومی دڵدارم خووا
وا بەتیری عەشقەوە دووبارە بیمارم خووا
بوومە مەجنون و ئەسیری دەستی غەدارم خووا
بێ شیفایە بۆیە پەشێوی زامی پڕ تەجمیری من

***

با بزانێ عالەمێ مەفتونەکەی لەیلایەکم
مەستی صەهبایی ئەلست و خاڵی سەر گۆنایەکم
جان نیساری لەنجەو و سەروی قەدی زیبایەکم
کەس نییە ڕەحمی ببێ، بێ حەل بکا تەحریری من[٣]

***



ناوێرم ناوت بڵێم (ئەسعەد) بەفایی ناوەکەت
هەر لە تۆیە ناز و عیشوە من فیدای هەنگاوەکەت
دڵ ئەسیری بازی نازی غەمزەیی دوو چاوەکەت
با لەسەر تۆ عالەمێ بێن و بکەن تەحقیری من[٤]

**١٩٣٩**

---

(١) پڕ جونبشە: پڕە لە جووڵە و لە ئەدەبدا بەئاشووب و قەزاوقەدەریش دێت.
شاعیر ئەم چوارینەی، لە بەشی چوارینەکاندا دووبارە کردۆتەوە.

(٢) شاعیر ئەم چوارینەی، لە بەشی چوارینەکاندا داناوە و تەنیا لە (عجز)ی بەیتی دووەمدا چەند وشەیەکی ئاڵوگۆڕ پێکردووە، بەمجۆرە:
وا بەشێتم تێ ئەگا، خەڵکی ئەکا تەحریزی من.
شایانی ئاماژە پێکردنە، شاعیر بۆی هەیە و ئەتوانێت هەر پارچەیەکی «چوار خشتەکییەکەی» خۆی بەتەنیا وەک چوارینێ، پێشکەش بکات، چونکە لە ڕووی هونەریی شیعرییەوە، گونجاوە و بۆ ناوەڕۆکیش زۆربەی پارچەکان «چوارینەکان» یەکێتی واتای خۆیان هەیە... بۆیە، ئەو حاڵەتە و دانانی ئەم چوارینە بەجیا، یاخود لەگەڵ ئەم چوار خشتەکییەدا ئاساییە، بەتایبەت، گونجان و خزمایەتی لە نێوان، ڕوخسار و ناوەڕۆکیاندا هەیە.

(٣) – صەهبایی: مەبەست لە مەیێکی ڕەنگ مەیل ئاڵە.
– ئەلست: لێرەدا مەبەست لە ڕۆژی ئەزەڵ و قیامەتە.
– نیسار: قوربانی... خۆی بەساقە و قوربانی ئەکات.
بەفایی: بەفیدای، بەقوربانی.

## بۆ برای جوانەمەرگم

برالەم ڕۆ، برالەم ڕۆ، برالەم نەوجەوانم ڕۆ
برای بەندی جگەرم و کوولەکەی دڵم و هەناوم ڕۆ
برالەی تازە عومر و لەهجە شیرین و کەلامم ڕۆ
برای دنیا و قیامەت خاوەنی عەقڵ و کەماڵم ڕۆ

لە خەوما تابی مەرگم دی ئەوە مەرگی برالەم بوو
خوماوی خۆم و بەرگم دی ئەوە بەرگی برالەم بوو
شەپۆلی خوێنی جەرگم دی ئەوە جەرگی برالەم بوو
برالەم ڕۆ، برالەم ڕۆ، برالەی نەوجەوانم ڕۆ

خووا ئەم ئاگرە چی بوو لە سینەم هەڵگڕا ئەمڕۆ
بەسەرما هەوری غەم هات و دڵم پەردەی دڕا ئەمڕۆ
کە بیستم نەومامم چوو ڕووناکیم لێ بڕا ئەمڕۆ
برالەم ڕۆ، برالەم ڕۆ، برالەی نەوجەوانم ڕۆ

برالە خوڵق و ئایینت لە دڵ دەرکەم خەجالەت بم
خەیاڵی کۆمەڵی شینت لە دڵ دەرکەم خەجاڵەت بم
نموونەی شکڵی شیرینت لە دڵ دەرکەم خەجاڵت بم
برالەم ڕۆ، برالەم ڕۆ، برالەی نەوجەوانم ڕۆ

بەفای دەردی گران و نالە ناڵ و ئێشی زۆرت بم
بەفای کاتی نەمان و گیانەڵا و تاتە شۆرت بم
بەفای حەفلەی مەزار و نوێژی مردوو قەبر و گۆڕت بم
محەمەد ڕۆ، محەمەد ڕۆ، برالەی نەوجەوانم ڕۆ

١٩٣٧

---

(*) کاتێک شاعیر، لە شاری بەغدا، لە خزمەت شێخ مەحموودی حەفیدا ئەبێت، هەواڵی کۆچی دوایی برا بچووکەکەی (محەمەد) پێ ئەگات، کە بەدەردێکی کتوپڕ ماڵئاوایی لە ژیان دەکات و وەک هەندێک دەڵێن: لە یاری تۆپی پێدا، تۆپێک بەر سکی کەوتووە و هەندێکی دی دەڵێن: دووچاری ڕیخۆڵە کوێرە بووە، وەفات دەکات و کار لەسەر هەست و هۆشی شاعیر دەکات، بەتایبەت کاتێک



ئەسعەد مەحوی، بەهۆی دوربییەوە، نە ئامادەی مەراسیمی بەخاک سپاردن و نە ئامادەی پرسەکەی دەبێت، ئا ئەوە، ئەوەندەی دی لەناخەوە ئەی هەژێنێت و ئەم چوار خشتەکیە نایابەی لا لە دایک دەبێت و دیوانە شیعرییەکەی پێ دەڕازێنێتەوە و چوار خشتەکییەکانی وەک شیننامە بۆ مەلا خالیدی باوکی دەنێرێت.

***

ئەم قەسیدەیە بەبۆنەی بۆردمان کردنی شاری سلێمانی بەدەستی چەپەڵانی ئینگلیز دانراوە.

دەربەدەر کەوتوومە غوربەت وا بەداخ و دەردەوە
ئەشکی سوورم جارییە دایم بەڕوویی زەردەوە
سەد کەڕەت دەردێ بەئانێ، دڵ بەئاهی سەردەوە
یارەکەم لێ ون بووە مردم بەماهی زەردەوە[١]

کەس نەبێ یا ڕەب وەکو من تووشی داوی نەگبەتی
دایمە ڕەنگ زەرد و غەمگین سەر بەزانووی نەگبەتی
دڵ لە کوورەی ناری عەشقە کەوتە چاهی غوربەتی
کوا ڕەفیقانم ئەوا مردم بەشاخ و بەردەوە[٢]

بای وەتەن ئا، پێم بڵێ: حاڵی (سولەیمانی) چییە؟
خانەقا و بوستان و باغم، زینەت و جوانی چییە؟
قەیسەری و خان و حەسارم باسی ڕووخانی چییە؟
حاڵی یارم پێ بڵێ مردم بەداخ و دەردەوە[٣]

دڵ ئەناڵێ میسلی (نەی) بۆ چاوەکانی یارەکەم
سینە ئەنجن ئەنجنە سەودا سەری دڵدارەکەم
موشتەری بازاڕی گەرمی دولبەری عەییارەکەم
یارەکەم لێ ون بووە مردم بەهەردوو نەردەوە

چاوەکەم لەیلا هەتاکەی مەینەت و دەرد و جەفا
ڕۆحەکەم مەجنون لاتە مروەتت بێ، بێ وەفا
«ئەسعەد» کەوتۆتە «ماوەت» تۆ لەجێی شانەی سەفا
بۆ خووا مەیلێکە یاران، نەک بڕۆم بەم دەردەوە

یا ڕەببی ئینگلیز نەمینێ وەک منی کرد دەربەدەر
دەنگی تەییارەی کە دێ عالەم ئەلەرزێ وەک شەجەر
فەرقی ئەو پیسە نییە بۆمبا کە ئەهاوێ ژوور و دەر
تەخت و بەختی تێکئەدا مردم بە تۆز و گەردەوە.

نیوە شەو مەندوب ئەڵێ: ئێستاکە جۆرجم ئەمری دا
گەر لە شارا شێخ نەمێنێ تا بەیانی بانگ ئەدا
هەر بە بۆمبا تێ ئەدەم، من، ئەوەڵا خانەی خوا
ئەی ڕەفیقان بێنەوە ڕووکەینە غار و هەردەوە[٤]

ناڵە ناڵم دێ لەلا، دەنگی تەییارەی کافرە
هەستە یاران زوو کە، سا چایی و سەماوەر لابەرە
خەڵکە وا ڕۆیشتووە بۆ شیو و گرد و مەقبەرە
دیارە میللەت هەر ئەفەوتێ عاقیبەت بەم دەردەوە

چایخانە داخرا، خان و دوکانە، چۆڵ و هۆڵ
ڕەنجەڕوو بوو ئەم گەلە، کەوتوونە شیو و ئاش و دۆڵ
حەزرەتی شاهی ڕەسول، تاکەی بچێژین ئاهی چۆڵ
ژینی وا یا ڕەب چییە، دایم بەداخ و دەردەوە.

شیو و کەندی (جوولەکان) پڕ عالەمە تا تانجەڕۆ
وەک نەمامی وشک و بۆ گریانیانە و باوکە ڕۆ
ترس و سەرما کوشتنی بوونە دووچاری سێبەڕۆ
بۆ بمێنم خەڵکە وا مردن بەئاهی سەردەوە[٥]

تانجی و توولە و سەگ بەربوو بە دەشتا وەک (چەقەڵ)
تەیری ماڵی باری گرت تەییارە کردینی بە(قەل)
ئەی خووا ڕەحمێ بە حاڵی سەد هەزاران کوێر و شەل
عالەمێ فەوتا بە دەرد و ئاهو ناڵەی سەردەوە

زاق و زووقی بێ نەوایە، کون لە جەرگ و دڵ ئەکا
خوێنی ئاڵی بێ دەوایە، هەر لە بەرگی گوڵ ئەکا
ڕەنگی زەردی پڕ جەفایی وێنەیی سونبوڵ ئەکا
ئەی براڵە، بابەلێ، مردم بەدەردە مەردەوە

بۆنی قیمەی جەرگی کوردە وا بەدەم بۆمباوەیە
چاکی سینەی لاوی کوردە وا بەدەم بۆمباوەیە
کەرتی کەللە و چاوی کوردە وا بەدەم بۆمباوەیە
سەیری ئەم زوڵمە بکەن مردم بەدەستی جەردەوە

ئەی خـوا تا کـەی لە دەس (ئینگلیـز) ئەبێ ئاوارە بێ
نێـر و مـێی ئەم گـێـتـیـیـە دایم ئەبێ پەتیـارە بێ
هەر لە کـارا بێ بە فـێڵ و عـالەمـیش بێ کـارە بێ
ئەم حـەیاتەی وا چیـیـە ئەڕوا بە داخ و دەردەوە
با لە (تاریخ)ا نەبێ ون، زوڵمی کـوفـری بێ شـومـار
یەک هەزار و سێ سـەد و سـیـان و چلە دڵ بێ قـەرار
یەعنی بۆمـبـا عـەینی تەرزە دێنە ناو کـۆڵانی شـار
بمرە (ئەسـعـەد) بۆ کـەسـاسی کوردی خـاوەن دەردەوە(*)

١٣٤٣ ک

(١) بە ئانێ: بە ساتە وەختێک، بەچاوتروکانێک.

(٢) زانوو: لێرەدا بەواتای (ئەژنۆ) دێت.

(٣) لە (صدر)ی بەیتی یەکەمی ئەم چوارینەدا، شاعیر بۆخۆی لە جیاتی «ئەی برالە» گۆڕیوەیەتی بە«بای وەتەن ئا؛»... کە ئەمیان جوانتر و گونجاوترە.

(٤) شاعیر لە (صدر)ی بەیتی دووەمی ئەم چوارینەدا ئەم دێری (صدر)ی:
هەر بەبۆمبا تەخت ئەکەم من ئەوەڵا ماڵی خوا
بەمجۆرە گۆڕانکاری بە سەر داهێناوە:
هەر بەبۆمبا ، تێک ئەدەم، من، ئەوەڵا خانەی خوا.
– ئەوەڵا: ئەوەلەن... یەکەمجار.
– هەروەها لە عجزی ئەم بەیتەدا، وشەی «ڕفیقانی» بۆ وشەی «براگەل»» گۆڕیوە.

(٥) شیو و کەندی جوولەکان: واتە شیو و کەندی گەڕەکی جوولەکان، کە جوولەکەکان تیایدا ئەژیان و کەوتۆتە خوارووی شاری سلێمانییەوە.
– تانجەرۆ: چەمێکی گەورەیە لە خوار شاری سلێمانییەوە، لە ئەنجامی تێکەڵبوونی ئاوی قلیاسان و بەکرەجۆ و سەرچنار و چەند ئاوێکی تر پێک دێت.
– سێبەرۆ: نەخۆشییەکی گرانە و دوچاری مرۆڤ دەبێت.

(*) ئەم چوارخشتەکییە، یەکێتییەکی واتایی لە نێوان هەموو پارچەکانیدا هەیە.



## چوارینەکان

### چوارین

زۆر کەڕەت ڕەحمەت لە دڵ ڕووی تێ ئەکا
مـێش بەڕێدا دێتـە سـەر گـوی تێ ئەکـا
یار ئەوا ڕۆیی ئـەجـەل حـازر بـووە...
شـوێنی شـایی شـیـوەنێ پێی تێ ئەکـا

***

وەفـا بۆچی وەفـاتی کـرد نەمـا ناوی لە ناوانا
وەکـو بووکی براو، ڕۆیی نـەمـا بـاوی لە باوانا
ئەمە ئاردە مـەلا تێر بە، بەنا ئەمنی بەسـە ئەمنی
تکا قەترەی حەیا و شەرمت نەما ئاوی لە چاوانا

***

هەڵڕژا فرمێسکی حەسرەت دەست بەئەژنۆی پیریا
عـیبـرەتێ، وەربگرە دڵ، تاعەت مەکـە هی بۆ ریا
ئیـدعـای خوایی ئەکـرد، ئەو تاقـمە بۆ کـوێوە چوو
ئەو کـەسـەی بێ مـەبدەئە، عـالەم بەگـۆڕیدا ریا

***

**وەڵامی حاجی مەلا ئەسعەدی مەحوی بۆ شێخ بابا عەلی**

نەسـیـمی سـوبـحـدەم عـەرزم بەرە بۆ شـارەکـەی بێـروت
بڵێ: بـابا عـەلی، ئەسـعـەد نەمـاوە حـاڵەکـەی بێ رووت
سکی وەک گـیـپـە ئاوساوە لە دووری غـونچـەیی لێـوت
لەبۆ پێشوازی شیـرینت، بەسەر دێت و بەپێشی رووت(١)

(١) برایەتی و دۆستایەتییەکی بەهێز لەنێوان ئەسعەد مەحوی و کوڕانی شێخ مەحموودی حەفیدا بووە، بابا عـەلی کوڕی شێـخ مەحـموودیش هەمیـشە شاعـیری بەسـەر کردۆتەوە و تەنانەت دوای ساڵی ١٩٦٤ کە عـێراق و کوردستان بەجێ ئەهێڵێت، بەردەوام بەنامەی لە دۆستی دێرینی خۆی پرسیوە و ئەمەش وەڵامی نامەیەکی شێخ بابا عەلی بوو، ئەوکاتەی لە شاری بەیرووتی لوبنانی نیشتەجێ بووە.

نامەی شێخ بابە عەلی شێخ مەحموودی حەفید بۆ جەنابی حاجی مەلا ئەسعەدی مەحوی

برای خۆشەویست جەنابی مەلا ئەسعەد

لە مژدەی ساغ سەلامەتیتان زۆر دڵخۆش بووم و بەگەیشتنی یادگارەکەتان متشکر بووم، هەروەها مەمنوونی ئەو هیمەتە خۆ تاسابییەتم کەوا «ای شده» کەتان بۆ پەیدا کردم و، ئەوەیشم بۆ تۆفیق ئەوێ و ئەمە چەند ساڵە هەر داوام لێ ئەکا. هەرچەندم ئەکرد دەستم نەئەکەوت.

لێرە کابرایەکم لێ پەیدا بووە بە شوێنی حەرەکەتی تەریقەی نەقشبەندییا ئەگەڕێ و بالاح انتشاری لە عێراقدا، ئەمجا لەم ڕووەوە هەر مەعلوماتێکم بۆ بنێری زۆر مەمنوون ئەبێ.

بەخوا زۆرتان بیر ئەکەم و ئەمە چەند ساڵیشە خۆت ئەزانی لە گیپە خواردنەکە و تەکیە مەحرومم.

انشاالله حەقی بۆ ئەکەینەوە

ئیتر هەر بژین قوربان

بابا عەلی شێخ مەحموودی حەفید

بیروت – ١٩٧١/٣/٢٥



بوو بەیەک ئەهلی وەجاخ و نا وەجاخ
بەڵکو باوی زۆری سەندۆ نا وەجاخ
پۆلیسی چنگ ناکەوێ بۆ خوێندوار
وا لە دەس میری ئەخۆن، زووخاو و داخ

***

ئاڵای کورد

بێنە لەرزە گیانی ئێمە بای نەسیم ئاڵایی کورد
داگرێتن گوڵ بەجارێ، سەرجەمی ئاڵای کورد
دەست لەمل هیوا بکەین، ئۆخەی ئەوا حەسرەت نەما
بابپۆشێ ئەم گەلە هەم ئاڵ و هەم واڵایی کورد

سەردەشت – ١٩٤٢

***

لە تاوی تۆ بڵێم چی؟ چەرخی بەدکردار
هەموو کاتێک بەدەر دێنی تۆ، پیاوێکی ناهەموار
لە زانایی و ئەدەب دوورە، لە بی ئەخلاقی ئەوپەڕ
عەمیل و خادیم و پیسیش و پیس ڕەفتار

***

کەی تەکە بوو، پێی ئەڵێن: وەیڵی شیعار
دڵ نەوایی بێ کەسە، عیلم و ویقار[1]
خۆ بە زل گرتن، ئەبێتە مەسخەرە
نەفرەتیشی لێ ئەکا یار و دیار

١٩٧٥/٢

***

---

(١) تەکە، بەبزنی نێری ئەوترێت.

هەستە ئەی بادی سەبا فەرموو بڕۆ وێنەی تەتەر
بەرگی غونچە شەق بکە، با بۆنی عەتری بێتە دەر
وەعدی ئوستادی شەرەف، موسا بەگورجی بێتەوە
نەقڵی لالەی باخی «مەحوی» بۆ غەمم دەرچێتە دەر

***

عالەمێکم لازمە ساغ و سەلیم و بێ زەرەر
ڕەحم و ئینسافی ببێتن بۆ گەلێ دڵ، پڕ کەدەر[1]
قوڕ بەدامان و سەرم تەکلیفی ناهەموار ئەکەن
لەم دز و جەردەی کەوا ئەم گێتییەی کردە شەڕەڕ[2]

---

(١) کەدەر: خەم و خەفەت و دەر دو مەینەتی.

(٢) شەڕەڕ: لە «الشرارة» هوە هاتووە، واتە... ئاگر یاخود پڕیشکی ئاگر.

***

بۆ چەپۆکی باوەژن، ڕوخساری من نابێتە ڕوش
غایەتی غونچەی هیوا، چەرخی فەلەک کردی بەپووش[1]
شەرتی من ژیرانەیە مەر، بۆ طی توولی عومرمە
سەرزەنشتم، کەس نەکا با نەی کوژێتن مەرگە موش[2]

---

(١) ڕووش: واتە، تەوقە سەر، لێرە مەبەست ئەوەیە: تەوقە سەری ناڕووشی و ناڕووتێتەوە.

(٢) مەر: مەگەر «پێویستی شیعر وا ئەخوازێت».

– طی: تەی: تەیکردن، گەڕان بەدوایدا، لێرەدا بەواتای: وەرچەرخانی درێژی تەمنم دێت.

– توولی: طول: درێژی، مەبەست تەمەن درێژییە.

– مەرگە موش: ژەهرێکە، دەرمانێکە زیاتر بۆ لەناوبردنی مشک بەکار ئەهێنرێت.

***



کاتی مەرگە، کاکەلێ، بێ نوورم و هەم بێ شوعاع
گەردنم ئازا بکەن ئێوە و خوواتان ئەلوداع[1]
نەمخەنە گۆڕ و نەکەن کفن و فرێمدەن چونکە وا
خود پەسند و بێ فەڕ و بی کردەم و خاوەن تەماع[2]

---

(١) کاکەلێ: بۆ خۆشەویستی و ڕێز لە مرۆڤ بەکار دەهێنرێت.

شوعاع: ڕووناکی، تیشک.

– ئەلوداع: ماڵئاوای دوایی تەمەنە.

(٢) ئەو نیوە دێرەی، ئەم بەیتە، نەوازش و بێ فیزی شاعیر ئەبەخشێت... پێ ئەچێت، ئەم چوارینە لە دواتەمەنەکانی ژیانیدا نووسیبێتی.

***

کاری بێ مانایە یار و، پێی ئەڵێم: ئەی ڕۆڵە بڤ
مۆن ئەبێ دیوانەیی، تووکی سەر و سمێلی گڤ[1]
لایحەی پڕ کرد دەوا داوی، بە دەستی دوشمنم
پێی ئەڵێ: حوکمی بدە «ئەسعەد» ئەڵێ: پێم ڕۆڵە بڤ

---

(١) بڤ: واتە: مەکە، قەدەغە و ترسناکە... ئەم وشەیە، زیاتر بۆ مناڵ بەکار دێت و بەهۆیەوە لە کاری مەترسیدار دوور ئەخرێتەوە...

– گڤ: پژ بۆتەوە، واتە ڕێکوپێک نییە.

***

بەسیەتی دنیا پەرستی، تا بەکەی ئەی عەبدی حەق
گەردنت هەڵناگری مەیخە بن گۆپاڵ و شەق
ڕۆژی حەشرت، وا لەبەر شەرمێ لە یەزدانت بکە
ڕاستیکە، چەوتی حسابت ئەچییە بەر دیوانی حەق

***

لە دڵمـــا هەڵچـــەقی گـــوڵ، بوو بەدڕک
لێم ئەدا دووژمن، تـوانجی وەک خـــڕک(١)
ژار و ژەنگـت بـۆ مـن، یـاری ڕەقـــــــیب
بۆ هەمـوو کـەس دێیـە بەر عـەینی بڕک(٢)

---

(١) خڕک: لێرەدا، خڕکە بەرد ئەگەێنێت.
(٢) بڕک: مەبەست، قێز لێکردنەوەیە.

***

بۆ گـلانی شـۆڕە سـواریێ، چاوەکـەم هاتۆتە گل
ئەشکی سوورم هاتە خواریێ مێزەرم کەوتۆتە مل(١)
ئەی سـەبا تووبی خـوا عـەرزی حـزوورم بۆ بکە
دەردی پیری یا غەمە ئەو شێرەیی کردۆتە جل(٢)

---

(١) هاتۆتە گل: هاتۆتە ژان، مەبەست لە ئازاری چاوە.
(٢) کـردۆتە جل: لە کـوردیدا و بەزاری سلێمـانی ئەوترێت بو بەپەڕۆ، واتە، بێ دەسـتـەڵات و هیچ لەدەست نەهاتوو.

شـاعـیـر لە پەراوێزی ئەم شیـعرەدا، ئاماژەی بەوە کـردووە: ئەم چوارینەی بەبۆنەی گـلانی پاشای کوردسـتان شێخ مـەحموودی حەفـیدەوە، وتووە کە سالّی ١٩٥٠دا لەسەر ئەسپ ئەگلێ و بەوەش سوێی و کسپە لە جەرگی شاعیر هەڵدەسێنێت.

***



کەی ئەمە ژینە، لەگەڵ ئەم میللەتەی چەوت و چەوێڵ
دز، درۆزن، بێ حـەیا، بێ مـەبدەء و جـووتە تەوێڵ
قـەپگر و گـەندە باخـەڵ، خـۆ لە خـەم خـورک ئەخـا
سـا خـوایە، نەمـژێنی لەم گـەلەی بێ دین و دڵ(١)

---

(١) خورک: مۆریانە... جانەوەرێکی زۆر بچوکە و لە جل و بەرگی خوری ئەدات و ئەیخوات و کون کونی دەکات و زۆر جار بەخوری خۆر ناو ئەبرێت.

شـاعـیـر لەم چوارینەیدا یەکجار لە بارودۆخی نالەبار و بێ دینی و بێ ویژدانی زۆربەی خەڵکەکە وەرسە و بێزار و لێیان تووڕەیە و لە ئەنجامی هەڵچوونی باری دەروونی، ئا بەو جۆرە لە داخدا نەک ڕەخنە لە خەڵک و خواکە ئەگرێت، بەڵکو، دوعا لە خۆشی ئەکات و داوا لە خودای پەروەردگار ئەکات، لەوە زیاتر نەیژێنێت و بەچاوی خۆی ئەو بێ دینیی و بێ شەرمیانە، نەبینێت.

***

کـە تۆپێکی لەمن دا دولبـەرم
تۆپی ڕەقـیـبی سـەگ(١)
وتی: جـغـزین مـەرامـە
ئابڵاوەی کـە جەنابی بەگ(٢)

---

(١) تۆپ: لێرەدا مەبەست لە ناڕاستگۆیی یا خود درۆی دولبەرە.
(٢) جغزین: جۆرێکە لە گاڵتە پێکردنێکی داخراو و پەنهانی.

شـاعـیـر لەم چوارینەدا، هونەری نوێی شـیـعری بەکـار هێناوە و وەک بەیتی دووەم و دوای بەیتی دووەمی قەسیدەی کلاسیکی، پەنای بۆ بەکارهێنانی سەروا بردووە، واتە تەنیا عجزی بەیتی یەکەم و دوەم یەک سەروایان هەیە، بەڵام (صدر)ی هەر دوو بەیت سەرواکانیان جیاوازە.

...........................

ب .....................

...........................

ب .....................

***

خــــراپە تا بڵـــێی، تەبعی غـــەریزم
لەگەڵ وەحشی نییە، ئەسڵەن تەمیزم[١]
مـوسڵـمـانی وەها بێ، ئێـمـە ئەیکەین
جەهەننەم جێی هەمـوومـانە عـەزیزم[٢]

١٩٧٣/٨/٨

(١) تەبعی غەریزم: جۆری ویست و خواستەکانم ئاوایە.
(٢) تەمیزم: واتە جیاوازی نییە.

***

سەد شـوکـر بۆ تۆ وەفا، تەوقێکی چوویە گەردنم
دەس لە تۆ هەڵناگـرم، گـیانە هەتاکـو مـردنم[١]
وەک قـەناعـەت، لازمی باب و هەمـوو باپیـرمی
تاکو زۆر بی، هەم کەمە، لەم نیعمەتە بەشبردنم[٢]

(١) تەوقێکی: ئەڵقەیەکی.
(٢) نیعمەت: فەڕ، خێر و بیر.

***



ببـــورە لێم، لەبەر پیـــری درێژ بووم
وەکـو سـەرخـۆش، بەدایم گـێـژوویـژ بووم
لە بێ باری، ئەهالی و چەوتی مـیـری
لەبن باری غـەمـا وا ناوکـەڕێژ بووم[١]

١٩٧٣/٩/٧

(١) ناوکەڕێژ: ناو سکت ڕەش بووە و، ئەمەش نیشانەی نەخۆشییەکی کوشندەی ناو سکی مرۆڤە.
- شاعیر: لەم چوارینەدا، پەنای بۆ بەکارهێنانێکی هونەری جیاواز لەوانی دی بردوە و لە (صدر) و (عجز)ی بەیتی یەکەم و (عجز)ی بەیتی دووەم، یەک سەروای بەکارهێناوە و سەروای (صدر)ی بەیتی دووەم جیاوازە. وەک:

أ ................................
آ ................................
ب .............................
أ ................................

- شاعیر بەدەستنووسی خۆی لە پەراوێزی ئەم چوارینەدا نووسیویە لە تەمەنی (٧٥) ساڵیدا ئەم چوارینەم هۆنیوەتەوە.

***

وێڵ و سەرگەردانم و بێ قیمەت و بێ مایە بووم
بێ ئەنیس و موونیس و بێ هاودەم و بێ سایە بووم
ڕووت و قووت و عاجز و بێ مەلجەئو بێ پایە بووم
وا بەشێتم تێ ئەگا، خەڵکی ئەکا تەحریزی من[1]

---

(۱) تەحریز: تەحریضی، تحریض، واتە خەڵکیم لێ هان ئەدات.
ئەم چوارینەی شاعیر لەڕووی هونەری شیعرییەوە لەوانی دی جیاوازن... (صدر) و (عجز)ی بەیتی یەکەم و (صدر)ی دووەم، یەک سەروایان هەیە و عجزی بەیتی دووەم سەرواکەی جیاوازە، وەک:

.............................أ
.............................أ
.............................أ
............................ب

***

دەردی دڵ تووشم بووە پەردەی سپی بوو بیلبیلەم
دومەڵەک، سالێدە دوژمن، وەخت نەمێنێ، ناوەکەم[1]
بو لوتفی لێوەکەی کاکە لەتیفی دەربەدەر
هەر وەکو تەیری باڵ بەستراوی، ناو داوەکەم[2]

---

(۱) دومەڵەک: ئالەتێکی ئاوازداری وەک تەپڵ وایە.
– وەخت نەمێنێ: وەختە لەناو بچێت و نەمێنێت.
(۲) کاکە لەتیف: مەبەست لە شێخ لەتیفی شێخ مەحموودی حەفیدە و بەواتای ئەم دێرەدا، دەر دەکەوێت ئەم چوارینە، کاتی دەربەدەربوونی شاعیر و شێخ لەتیف و نیشتەجێ بوونیان لە شاری سەردەشت وتراوە.

***



لە قەبریشا لە شوکری تۆ خووا خاڵی نەکەی سینەم
لە یار و یاوەر و یارت «بحمدالله» نییە کینەم
ئەوی داوتە بەمن، لوتفی خووایی خۆتە وەرنەمن
سیا ڕوخسار و داماو و خەجاڵەت ماوی ئەم دینەم[1]

---

(۱) وەرنێ من شیاوی ئەوە نیم چونکە:
– سیا ڕوخسار: ڕوو ڕەشم.

***

سی و دوو ساڵە وا لە حیزبا نابەریم
دائەنیشم هەر ئەبێژم پاکە ڕێم
کوردم و کوردایەتی بۆ کێ بکەم؟
بۆ گەلێ خادمی بێگانەیە، خۆمن بەریم(*)

۱۹۷۳

---

(*) بەم شیعرەدا، دەردەکەوێت، ئەسعەد مەحوی لە ساڵی ۱۹٤۱ەوە، وازی لە چالاکیی حزبایەتیی کۆمەڵی برایەتی هێنابێت. ئا لەو ساوە، داخ و پەژارەی لەدەست کاری ناو ڕیزەکانی کۆمەڵی برایەتی دەردەبڕێت، کە چۆن کرمی فیتنەیی و نیفاق و خۆ ویستی و لەژێرەوە ناپاکی کردن و لە پشتەوە خەنجەر هاوێشتن، وای کردووە کە مرۆڤ قێزی لەو جۆرە حزبایەتیانە ببێتەوە و بێزاری وا لێبکات، بۆچوونەکەی گشتگیر بکات.

***

ئەسسەلام؛ ئەی حەبیبی خالقی کەون ومەکان
ئەسسەلام و؛ سەروەر و سەردارەکەی موڵکی جیهان
من سەگێکی پێغەمبەرم هاتوومە دەرگانەکەت
بێ بەفریاما، لە حەشر و نەشرەکەی ئاخر زەمان(*)

---

(*) شاعیر بەدەستنووسی خۆی، لە پەراوێزی ئەم چوارینەدا نووسیویە و ئەڵێت:
ڕۆژی ١٧ی ذی الحجە ١٣٩٤ لە سەعات یەک و نیوی عەرەبی گەیشتینە «مەدینە» چوومە خزمەت پێغەمبەر (صلی الله علیە وآلە وسلم).
ئەم دوو شیعرەم عەرزکرد، لێی قوبوول کردم، لە ڕەحمەتی خواوە حاڵەتێکی باش ڕووی تێکردم.

***

ئاسمان بۆتن بەتەم، ئەمشەو لە ناڵەی پیری من
جەرگ و دڵ سووتا، لە شوعلەی ئاهی پڕ تەئسیری من
وەسڵی دوڵبەر گەر نەبێ ئەسڵەن نییە، تەدبیری من
سەد، ئەرەستۆ چاری ناکا، سینەکەی پڕ تیری من(*)

---

(*) شاعیر ئەم چوارنیەی، لە چوارخشتەکیەکیدا دووپات کردۆتەوە.

***



کاکی کاوە بۆقی هێنا بێ لە موون
وا ئەڵێ: هێناومە بۆتۆ بۆقلەموون
خاوەنی چوار قاچ و دەم، بێ باڵ و پەڕ
تا بڵێ: کێ دیویە وابێ بۆقلەموون(١)

---

(١) بۆق: گیانلەبەرێکی ناو ئاو لە خاکیشدا ئەژی.
موون: واتای هۆنینەوە، هۆنراوەتەوە دێت سا شاعیر مەبەستی لە هۆنراوە و شیعرە یا خود چنینەوە و ڕێکخستنە، وەک ئەوەی ئەوترێت: ئەو تەسبیحە ڕێک و جوان هۆنراوەتەوە.
دیارە شاعیر هوشیارانە و هونەروەرانە، مامەڵەی لەگەڵ وشەی «بۆقلەموون»دا کردووە... بۆ وای چوواندووە کە بۆی هێناوە، کەچی (بۆ) لەگەڵ (ق)دا وشەی (بۆق)ی لێ پێک هێناوە و (موون)ەکەش بەو واتایەی لە پێشەوە شیکرایەوە، بەڵام ئەنجام لە کۆکردنەوەی هەر سێ وشە هەڵوەشاوەکە، (بۆقلەموون) واتە: نێرە عەلەشیشی گەورە پێشکەش کرا، ئەمە یەکێکە لەو لایەنە هونەرییەی شیعر کە شاعیر لەگەڵیدا ژیاوە.

***

حەسادەت بۆ ئەبەی، ئەی دڵ بەوانەی خاوەنی جاهن
خوا داویە، بەتۆ فەقر و؛ بەوانەی ئێستەکە شاهن
ئەمین بە موستەریحی تۆ چ ئەملا بێ چ ئەولا بێ
بەنیو گەز فەرق ئەکا کفنی ئەوانەی حازری جاهن

***

کەی نەباتی میسر ئەدا، شیرینی گوفتاری تۆ
موشتەری وشەمس و قەمەر کوانێ وەکو ڕوخساری تۆ[(١)]
گوڵ لە ڕووتا ڕەنگی ڕۆیی غونچە لێوی هەڵوەری
ئاسکی چین سڵ ئەکاتن بۆ پەری ڕەفتاری تۆ[(٢)]

---

(١) نەباتی میسر: جۆرە شەکرێکی نەباتییە و زۆر شیرینە و لە میسر زۆرە.
- موشتەری: یەکێکە لەو حەوت ئەستێرە بەناوبانگەی فەلەک.
- شەمس: ڕۆژ، خۆر.
- قەمەر: مانگ.

(٢) ئاسکی چین: ئاسکی خەتا و خوتا لە چین بەناوبانگە و ناوکەکەی جۆرە بۆنێکی عەتریی نایابی هەیە.

***

بنووسە: ئەی قەڵەم، حاڵی ئەم کوردی بەد بەختە
تەمێ نابێ، بەهیچ جۆرێ، بزانە چەندە سەرسەختە
دەمێ پیاوی گەلی غەربی، دەمێ بێحورمەتی شەرقی
بە دەس ئەم دووانەوە، داماون و سەیری ئەم وەختە

١٩٧٥/٨/٥

***

ئەوی کردوویە بەکورد، کاری بەدی ئینلیسە
وەک کوڵەنانی وەها، عەینی ئەڵێی ئیبلیسە[(١)]
مەڵێ کورد و بڵێ، دنیا وەهایە
فەوتاوی دەمی ناپەسەنی پیس و خەبیسە

---

(١) ئینلیسە: ئینگلیسە، ئینگلیزە، مەبەست لە ئینگلیزی داگیرکەرە.
- کوڵەنانی: مەبەست لەو کەسانەیە، کە گوایە: زاوان و بەستراون و لە شەوی زاوایەتی و دواتردا ئەکەنەوە... ئەمە بڕوایەکی کۆنە و ئەشێت، لە ڕووی زانستی دەروونناسییەوە، بنچینەیەکی هەبێت.
- ئیبلیس: شەیتان.

***



تەماشا، حەیاتی، نەحسم ئەکەم گریانمە
بۆ خەبیسی، کردەوە، جەرگ و دڵی بریانمە
کوشتی، کە بو سبەینێ، ژینی دنیا فانییە
شێتی دەشتی مەحشەر و داماوی و عوریانمە[(*)]

---

(*) ئەم چوارینەم لەگەڵ هەموو دەستنووس و دەفتەرەکاندا بەراورد کردەوە، هەر بەم شێوەیە ساغکرایەوە و لێرەدا جۆری خویندنەوەی شیعر، مافی خۆی ئەداتێ و واتاکەی بە جوانی ئەبەخشێت.

***

وەکو قومری، نیشانەی بەندەگی؛ ها لە گەردنمە
لە دووری تۆ هەموو کاتێ، لەناوا باسی مردنمە
سوپاسی قەلبی پاک و لوتفی شیرینت ئەکەم جانا
لەبۆ دوعای بڵندی تۆ، بزانە سەجدە بردنمە[(*)]

---

(*) شاعیر، ئەو چوارینەی سەرەوەی، بەم شێوەیەی خوارەوەش پێشکەشکردوین:

***

وەکو قومری نیشانەی بەندەگی، تەوقی گەردنمە
لە دووری تۆ هەمووکاتێ، لەناوا باسی مردنمە
بەدڵ شوکری فؤادی قەومی خۆمانە، لەسەر زارم
لەبۆ دوعای بڵندی تۆ، بەدایم سجدە بردنمە[(١)]

---

(١) فؤادی: دڵی.
- فؤادی قەومی خۆمانە: دڵی نەتەوەی خۆمانە، لێرەدا بەواتای ئەوەی لە دڵ و دەروونی میللەتدایە، و گوزارشت لە خواست و داواکانی دەکات.

***

دیاری من عەزیزم، وا نموونەی شاخی کوردانە
ئەمە تەسبیحی سەد دانەم، ژمارەی ئاخی کوردانە[1]
تەماشا ڕەنگی زەردم کە، بەبێ عیللەت وەکو مردووم[2]
نییە دەردم، دەواکا، چونکە دەردم ئاخی کوردانە

---

(١) شاعیر لە پەراوێزی ئەم چوارینەدا نووسیویە:
ئەم شیعرە چوارینە لە ئەنجامی ئەو داوایە لەدایک بووە، کە جەنابی مەعالی و مێژوونووسی مەزنی کورد و کوردستان ئەمین زەکی بەگ داوای تەسبیحی لە شاعیر ئەسعەد مەحوی دەکات و ئەویش بەخۆشییەوە، داخوازییەکەی بەجێ دەهێنێت.
(٢) بەبێ عیللەت: بەبێ دەرد.

***

نەخۆشی و ڕەنگی زەردم بۆ ئەسیری ئەرزی کوردانە
حەواسی دائیما پەرتم، خەریکی مەرزی کوردانە[1]
برالە ڕۆژی شینە، دەست لە شایی هەڵگرە بەسیە
شەڕ و شۆڕی لەسەر ئەرزا نیشانەی بەرزی کوردانە

---

(١) ئەرزی کوردان: خاکی کوردان، کوردستان.
– حەواس: تاقەت و ئارەزوو، زۆرجار بەشەوق و ڕەوقیش دێت.
– پەرت: بڵاو.
مەرز: سنوور.

***



شیعرێکی بێ موازەنە و پڕ موازەنە
پێشکەش ئەکەم بەخزمەتی ئەهلی موازەنە[1]
هیوای گەزی کۆمەڵی کورد بۆ لە کورتییە؟
میرزایی تاکو کەیە؟ بێ موازەنەیە[2]

---

(١) موازەنە: مەبەست لە هاولەنگەری کێش و مۆسیقای شیعرەکەیە.
شاعیر لەم چوارینەدا پەنای بۆ هونەرەکانی ڕەوانبێژی بردووە ویستوویەتی ئەولایەنە هونەرییە، لە نێوان «بێ موازەنە و پڕ موازەنە»دا ساز بکات.
(٢) میرزایی: میرزا، لە کۆندا بە کەسانی خوێندەوار وتووە، هەروەها بەقسەزان و ڕیش سپی وتراوە. کە وتویانە: فلانە میرزایی ئەکات، یا خود تۆ میرزای کوێت؟ واتە: کوێخای کوێیت و بۆچی لە خۆتەوە خۆت لە شت هەڵئەقورتێنی.

***

«بارک الله» ئەی قەناعەت، ئەمڕۆ بەندەت کڕییەوە
جوابی وەعزی مێجەربت دا، زوو لە کورتیت بڕییەوە
«العفو» شێخ نیم بەپارە، فێری جاسوسیم بکەن
گەنجی کوردم پێت بڵێم: پەردەی حەیاکەت دڕیەوە[1]

---

(١) شاعیر لە پەراوێزی ئەم چوارینەدا بەدەستخەتی خۆی نووسیویەتی و ئەڵێ:
لە **١٩٣٩/٥/٢** لە وەزارەتی ناوخۆی عێراقی ئەبێت، ناوەرۆکی ئەم چوارینە... بەقسە، ڕووی دەمی لە ئەدمۆنسی ئەکات و دژی دەستەمۆکردنی لاوانی کورد، ئەوەستێتەوە و ئەم چوارینە لەدایک دەبێت و دژی جاسوسی و جاسوسیەت ئەوەستێتەوە.

***

ئەو پڕ و پوچەی ئەڵێن: ئاسایشێکی گێتییە
هەر فش و هووڕی درۆ و تەفرەی مناڵ و شێتییە
سەیری ئەولادانی ئادەم، تا دوا کاتی بکەن
کوشتنی یەکیان لەبۆ داگیرکەری و میراتییە

١٩٦٢/١٢/٦

***

وا لە غەمدا مامەوە، کاتی فەرحناکم نییە
دەرد و حەسرەت کوشتمی ڕۆژێکی ڕووناکم نییە
دوشمنی خائین نەبێ، یارێکی دڵپاکم نییە
بەردەبارانم ئەکا، باب و برا و باپیری من(*)

(*) ئەم چوارینەش لەناو چوار خشتەکییەکی شاعیردا دووبارە بۆتەوە.

***

من هەموو باپیرەکانم عالمی لاهوتییە
با نەمێنێ وێنەکەم «ئەسعەد» کەوا ناسوتییە
سەیری هەڵبەستم ئەکەن سوودێکی چەندانی نییە
هەر وتاری «مەحوی»یە مرواری و یا قوتییە

***

دەردی دڵ دەورم ئەدا، خوێنی دڵ و جەرگم هەیە
چۆن ئەڵێ: باوەڕ بکەن، هەولی پول و ئارەزووی بەرگم هەیە
عومری جوانیم، وا بەناخۆشی و نەخۆشی بردە سەر
بەری دەستم ماچ ئەکا، کەی پەرۆشی مەرگمە

***



ساقی ئەمڕۆ داونیی، چونکە بەمەی ئالودەیە
قەلبی ئێمە بوو بە دڕک و پێیەوە ئالودەیە(١)
دڵ لە کاتێ، بێ هیوا بێ، گۆشەگیر و موستەریح
نابینی تۆ؟ گوڵ بەسەر چوو باخەوان ئاسودەیە(٢)

(١) ئەم چوارینە، بیرێکی فەلسەفی کۆمەڵایەتی بەهێزی تیا هەست پێ دەکرێت و تا لێی ورد بیتەوە، واتاکەی قوڵتر ئەبێتەوە.
- ئالودە: هۆگر و پەیوەست.
(٢) موستەریح: ئارام و دڵنیا و دڵئارام.
- ئاسودە: بێ گێرمە و کێشە، ئارام...

***

هیچ کەس بە زانا، لە دایک نابێ
زانا و نەزان، بەباوک نابێ
کۆشیشێ بکە، بۆ زانیاری
سەرداری جاهیل، بەمالک نابێ

١٩٧٦/١/٢٥

***

مەلا حاحد حەمدون زەكی(*)

هەمیشە خوانی عەیشی دین و دینیات پڕ تەدارەک بێ
بەدڵ حاجی مەلا ئەسعەد، ئەڵێم: حەجت موبارەک بێ
بە دەفعی زامی شمشێری شەڕی شەیتان لە خزمەت خوا
تکا کارم کە قەڵغانی سەرت، سورەی تەبارەک بێ

مەلا حامد حمدون زەكی - ١٩٧٥/١/١٦

---

(*) مەلا حامیدی شاعیر، کوڕی مەلا حەمدونی زەکی شاعیری مەزن و نابینای کوردە کە خاوەنی قەسیدە بەناوبانگەکەی بۆ (سەفەر بەر) و مێژووی ئەدەبی کوردی شانازیی پێوە ئەکات و ئەڵێت:

ئەم ڕۆژە چ ڕۆژێکە، کە عالەم شڵەژاوە؟
هەر کەس بە«جەخارێ» جگەری قیمە کراوە
دنیا پڕی ئاشووبە، خەلاییق بە عموومی
ئاسایشی لێ مەنعە، ئەڵێی: جونبوشی ئاوە

مەلا حامیدیش شاعیرێکی بەهرەدار و بەتوانا بووە و دۆستایەتی زۆر بەتینی لەگەڵ مەلا خالید و ئەسعەد مەحویدا هەبووە و بەبۆنەی زیارەتی ئەسعەد مەحوی بۆ ماڵی خودا و بەجێهێنانی فەرزی حەج و بەسلامەتی گەڕانەوەی، ئەو چوارینەی سەرەوەی بۆ دەنێرێت و ئەسعەد مەحویش، هەر بەهەمان شیوە و زمانی شیعر وەڵامی دەداتەوە.

***

وەڵامی مەلا ئەسعەدی شاعیر

تعالی اللە، کە پیرۆزیت گەیی، جەژنم بەشایی بوو
مەلا حامد: بحمداللە، برا حەجم تەبایی بوو
ئەمەی بۆ بەندە تۆ کردت، بە قوربانە، لە زیاییە
دوعای سوبح و شەوی ئێوە، گەیی دەردم دەوایی بوو(*)

ئەسعەد خالد مەحوی- ١٩٧٥/١/١٨

---

(*) ئەم چوارینە، وەڵامی شیعرێکی چوارینەی مەلا حامیدی حەمدون بوو، کە بەبۆنەی زیارەتی شاعیر و گەڕانەوەی لە بەجێهێنانی فەرزی (حەج) وەڵامی شاعیری داوەتەوە.



برا سەیرە، ئەما گوێ پان و کەرتۆپی
وەرە جەژنە، سەماکە، بگرە سەرچۆپی(١)
زەڕەی جەهل و حەپەی پیسی، هەموو ڕۆیی
بەهاری عیلم و عیرفانە، بڕۆ بۆ ساحەکەی قۆپی(٢)

١٤ی ڕەمەزانی ١٣٨٢ک - ١٩٦٣/٢/٨

---

(١) شاعیر لە دەستخەتێکیدا، لە (صدر)ی بەیتی یەکەم لە بری وشەی «کەر» وشەی «سەگی» بەکارهێناوە.
- گوێ پان: مەبەستی عەبدولکەریم قاسمە، کە بەگوێ پان ناوی دەرکردبوو.
- سەما کە: هەڵپەڕە.

(٢) زەڕەی جەهل: زەڕەی کەر و نەزانە.
- حەپە: بۆ سەگ بەکار ئەهێنرێت.
- ساحەکەی قۆپی: ڕەنگە شاعیر مەبەستی لە قۆپی قەرەداغ بێت، کە ناوچەیەکی دڵگیرە و خۆش و جوانە.

***

برا سەیرە ئەما «گوێپان» و سەگ تۆپی
وەرە جێژنە سەماکە بگرە سەرچۆپی(*)
زەڕە و لوورە و حەپە، مۆدەی هەموو دەرچوو
بەهاری عیلم و عیرفانە، وەرە بۆ باخەکەی قۆپی

---

(*) شاعیر ئەم چوارینەی لە پێشترەوە پێشکەش کردووین و لێرەدا هەندێک وشەی ئاڵوگۆڕ کردووە. لە (صدر)ی بەیتی دووەمدا وشەی لوورەی گۆڕیوە، کە بۆ گورگ بەکار دەهێنرێت و لە (عجز)ی هەمان بەیتدا، لە بری ساحەکەی قۆپی، نووسیویە: «باخەکەی قۆپی» واتە باخی قۆپی قەرەداغ و ئەمەیان جوانتر و گونجاوترە.

***

خالقی شەڕ (ئەهرەمن) وا زوڵفی باری عاری دی
چاری وا خالق، مەکە، خۆ شێت مەکە بێکاری حەی[١]
کێ ئەڵێ: سوڵتەی ئیلاهی دا بە(مریم) سەیرکا[٢]
نامرێ خووا ئەو کەسەی بێ عەقڵە با......ی

---

(١) باری عاری دی: باری ڕووتی دی.

(٢) مریم: مریەم... دایکی حەزرەتی عیسا سەلامی خوای لێ بێت.

***

لە تەکیەی «مەحوی»ا تۆ بی، ئەمن شەمع و گوڵم ناوێ
ئەگەر وینەت لە دڵ بڕوا، برا جەرگ و دڵم ناوێ
لەگەڵ سێدارەدا جووتم بکەن، فکرت لە دڵ دەرکەم
هەتا غونچەی دەمی تۆ بێ، دەمی غونچەی گوڵم ناوێ[*]

---

(*) ئەسعەد مەحوی، لەگەڵ هەموو کوڕەکانی شێخ مەحموودی حەفیدا، دۆستایەتی و برایەتییەکی بەهێزیان لە نێواندا بووە... ئەمجارە... شاعیر لە وەڵامی هەواڵپرسینی شێخ ڕەوفی شێخ مەحموودی حەفید ئەم چوارینە پێشکەش دەکات.

***

شوعلەی چاوم بەتۆیە، هێزی ئەژنۆشم ئەتۆی
لابەری ئازاری کۆسپ و ئێشی پشتیشم ئەتۆی
هەر بمێنێ سەروەت و سامانەکەت، بۆ ئەم گەلە
فایقی ئاوا کوندەی شوینی مەحویشم ئەتۆی

***



ئەی مانگی تەموز، بۆچی مایلی سەورەی؟
بڕمێنی گەل و تەخت و سەری عالەمی گەورەی[١]
سووچت نییە تۆ، زەرف و زەمەن، کاری وەهایە
بۆ تۆیە، ئەشێ چەرخی فەلەک هاوملی چەورەی[٢]

---

(١) ئەوەن: ئەوەندە.

مایلی سەورەی: ئارەزووت لە شۆڕشە.

مەبەست لەوەیە کە زۆربەی شۆڕش و کودەتاکانی عێراق لە مانگی تەمووزدا ڕوویان داوە.

(٢) هاوملی چەورەی: هاوتای کەسانی بێ کەڵک و نا ڕێکوپێکیت.

***

ئەی ڕەقیبی لەعنەتی، نەقڵی کەلامم بۆ ئەکەی؟
مەنعی یار و یاوەر و نامە و سەلامم بۆ ئەکەی؟[١]
هەر موعاریز بوی، بەغەیر و ئێستە قەڵبی قەڵب ئەکەی
بێ سەند، بڵقی ئەتۆ غەسبی دەلیلم بۆ ئەکەی[١]

---

(١) نەقڵی کەلام: مەبەست لە دووزمانی و فیتنەییە.

(٢) هەر موعاریز بووی: واتە هەر بەرپەچت داوەتەوە و دژم بویت.

– غەسبی دەلیل، غصب الدلیل: واتە بەڵگەکانم لێ زەوت ئەکەیت.

***

## چوارین

### به زمانی عەرەبی

الظُّلمُ عدلٌ عند العراق مليحٌ
والعدلُ جورٌ لدى البليد قبيحُ
كم عــالم عــامل رأيتــه
مـأخـوذ في يد البليـد ذبيحٌ

***

تێ هەڵكێش «التضمين»

تێ هەڵكێشێكی كوردی - عەربییە
بەخـوێنی ئاڵی جـەرگم، شـێـخم نـووسـیـومـە نامـە
«إنـي لقــد مــزقت من بعــدك القــيــامــة»
«أُنظر الى عَــــينيَّ لكي ترى العــــلاّمـــة»
لە عــــالەمـــێكم پرسی ڕەوشــــتی لەیلا وتی:
«من ســـأل البـــديهی ليس له الفـــهـــامـــه،
ها تـیـغی غـەیبی ئەڵێ: لە ئاسـمـان نـووسـراوە،
«واللّه مــــا وهنا بـلا مــــلامــــســــة»
مـاڵی دڵی «ئەسعەد»ی بێكەس و غـەمبـار ئەڵێ:
«كـالشــمس من غـروب تـدخل في غــمــامــة»(*)

١٩٥٧/٨/٥

---

(*) شاعیر لە پەراوێزی ئەم پارچەیەدا، بەدەسخەتی خۆی نووسیویە:



ئەم پارچە شیعرە لە وەڵامی نامەیەكی شێخ مەحموودی حەفیدا لە ١٩٥٧/٨/٥ وتراوە.

بەباش زانرا كە ئەم تێهەڵكێشە عەرەبییە، لە دوای ئەو چوارینەوە بێت كە بەزمانی عەرەبی هۆنراوەتەوە.

***

**تاک «فرد»**

دوو(١٠) و (٢٠) بیستێکە یارم ئیدعای چواردە ئەکا
ڕاستە چواردەی ئەو ئەڵێ: بیست‌وشەش و چواردە ئەکا[*]

---

(*) شاعیر ڕۆشنبیرێکی ئاسۆ فراوانی سەردەمەکەی خۆی بووە، شارەزایی لە دەریای قووڵ و بەرینی هونەری شیعریدا بووە و بێباکانە، خۆی لە هەموو بوارە جیاجیاکانی هونەری شیعری لە شێوەدا و لە جۆر و چۆنیەتی دارشتن و گۆڕانکاری لە سەروا جیاجیاکان داوە.
تاک شیعریش بۆ خۆی بابەتێکی سەربەخۆی هونەری شیعرییە، چونکە یەکێتی هۆرمۆنی واتایی تێدایە و بۆخۆی یەکەیەکی سەربەخۆیە.
لەم تاکەدا کە لە دوو دێر پێکهاتووە، ناوەرۆکێکی فەلسەفیانەی لە خۆ گرتووە... ئەوەتا شاعیر ئەڵێ: دوو (١٠) کە ئەکاتە بیست لەگەڵ ٢٠ تەنیایەک بیستی دی کۆی تەمەنی یارەکەیەتی و دەکاتە چل ساڵ، کەچی ئەو هێشتا ئەڵێ: کچی چواردە ساڵم، هەر شاعیر وەڵامی یار ئەداتەوە، دڵێ نایەت پێی بڵێت: ڕاست ناکەیت، بەڵکو ئەڵێ ڕاست ئەکا، تەمەنی بیست و شەش و چواردەیە... کە هەر چل ساڵەکە ئەکات و لە هەمان کاتدا چواردەکەی یاریش ڕاستە... بەڵام لەوەڕاستر ئەوەیە: کە شاعیر بەهۆشیارییەوە ڕاستی لا سەلماوە.

***

کەی ئەبێ دەربێ دڵم کاتێ لە زیندانی بەڵا
ڕووی بکاتە دەرکی حەق دەست بکاتە ئەصەلا[*]

---

(*) ئەم تاک بەیتەی شاعیر دەرد و خەمەکانی شاعیر دەر ئەخات و ژیانی دنیای فانی بە بەڵا ئەزانێت و چاوەڕوانی ئەوەیە: یەزدان دەرگای بەزەیی بەڕوودا بکاتەوە و دەست بەنوێژ و خواپەرستی بکات.

***

چونکە ڕۆیی، عالەمی ڕاست و دروست
بمرە «ئەسعەد» تا زووە بێ دەنگ و مت

***



نزیکی جەژنی قوربانە، محەمەد خۆم بەقوربانت
بەفریاما کەوە شاها، سبەینێ دەست و دامانت[1]

---

(١) محەمەد: مەبەست پێغەمبەری خۆشەویستمانە (د.خ).
– شاها: مەبەست لە خوداوەندی میهرەبانە.

***

زوبانی کوا بەیانیکا سوپاسی لوتفی شیرینت
لە یەزدانم ئەوێ دایم، بەبەرزی بێ هەموو ژینت

***

سەدە حەیف، ئەمڕۆ نییە، نەی ماوەتن ساغی و ڕەواج
پارە پارەن، عالەمێ بۆ پارەیەکی عەینی ساج[1]

١٩٤١

---

(١) ڕەواج: باو... خەڵکی بەدڵییەتی.
– پارە پارەن: ڕەگەزدۆزیەکی تەواوە بە دوو واتا دێت:
أ- پارە پارەن: پارچە پارچە، کوت کوتن.
ب- پارە پارەن: هەر ئەڵێن: پارە، پار و دینار.
– عەینی ساج: واتە پارەیەکی ناڕەوا کە ڕوویانی پێ ڕەش ئەبێت و وەکو ساجی ڕەشی لێ دێت.

***

سەد سەلامت لێ ئەکەم، ئەی نووری هەق
ڕۆشنایی دینم و شوعلەی بینایی چاوەکان

***

تۆ لە نێر و من لە مێ یا «إبن ألحلال»
حەز مانە ئەما تۆ حەرام و من حەڵاڵ

***

کەر لە بەحرا بوو کە تێفکری نەویم
گوێ درێژە، ناوی خۆی ناوە کەریم[1]

(١) کەریم: مەبەستی عەبدولکەریم قاسمە، کە بەگوێ پان و گوێ درێژ ناسراوە و، بەکەسێکی نەزان لە قەڵەم دەدرێت، چونکە سوور ئەیزانی کێ دوژمنیەتی لەخۆی نزیک دەخستەوە و ئازاری دۆستەکانیشی ئەدا... ئەمە لە واتای ئەم تاکەدا دەر دەکەوێت.

***

لە خوام گەرەکە، دایم، تووڵی تەمەنت قوربان
بەمەدەدکا، ڕێی تۆ، ڕەبی، وەلیی و شاه و سوڵتان

***

میوان بەخێر بێی، سەر هەردوو چاوان
ئەتۆ خانەخۆی، من بوومە میوان

***

هەوا نووری حەیاتە، بۆ هەوا بۆیە وامردن
ئەوی دانایە، دانایە: لە پێناوی حەیا بردن[1]

(١) ئەم تاکە بۆچوونێکی فەلسەفییانەی شاعیرە، لەمەڕ بوون و ژیان و ئایندە.
- هەوا: لێرەدا بەمەبەستی خۆشەویست دێت.
- بۆ هەوا: لەم شوێنەدا هەوا بەواتای لووت بەرز و خۆ بەلزان دێت.
- ئەوی دانایە: ئەوی شت زان و ژیر و لەسەرخۆیە.
- دانایە: مەبەست لە نەوییە.

***

لەگەڵ عود و کەمانە سینە ئەمشەو نایلی نەی بوو
بەیادی چاوەکانت چاوەکەم وەک کاسەیی مەی بوو

***



ڕۆژ ژمێری کولمەکانت خۆری لێکردم بەدوو
کوانێ حەسەری فەردی نەوعی ڕۆژی ئێمە بوو بەدوو[1]

(١) لە دێری یەکەمی ئەم تاکەدا شاعیر وێنەیەکی شیعری ناسک و جوانی پێشکەش کردووین، چونکە ئەو کوڵمە سوورە جوانەی کە وەک گلۆپ داگیرساوە و تیشکی خۆری لێ ئەدات، وێنەی خۆری تیا ئەبینرێت و خۆرەکە بووە بەدوو.

***

گەڵای هەر شت ئەبینی، کردەیی خالق تەماشا کە
پەڕەی گوڵ جۆری، ڕەنگی کردەیی خالق تەماشا کە

***

مەیلی ساردیتە، چ لە گەرمی منە، عەینی چلە
سەیری ئەم دوو زێدەکە، پێیان ئەڵێن، هەردوو چلە[1]

(١) لەم تاکەدا شاعیر، وردەکارییەکی ناسک و جوانی لە بواری ڕەوانبێژیدا کردووە و لە نێوان (چ لە) و (چلە)دا ڕەگەزدۆزیەکی بە هێزی تەواو هەیە.
- هەردوو چلە: مەبەست لە چلەی هاوین و زستانە.

***

تەماشا وێنەیی نەحسم ئەکەم گریانمە
بۆ خەبیسی کردەوە جەرگ و دڵی بریانمە[1]

(١) ئەسعەد مەحوی، ئەم تاکەی لەژێر وێنەی خودی خۆیدا نووسیوەتەوە.

***

ئەركـانی شیـعـر، چواری كـافـیـیـە
لەفز و مەتانەیە و وەزن و قافییە[1]

(١) ئەمە بیروڕا و بۆچوونی شاعیرە، لەمەڕ هونەری شیعری كلاسیكی.

***

ئیـشـتـراكی مـەزبەتەی شـێـتـانە بـۆ من ناكـرێ
كـوردی مـادەر پاكم و دەرسی عـەیارێكم هەیە

***

هەزار و نـۆ سـەد و حـەفـتـا و پێنجی زایینی
شێوەن و گریانم بۆ گەلی كوردی بێ نازەكەم[1]

(١) شاعیر ئەم بەیتەی لە ئەنجامی ژان و سوبی هەرەسی شۆڕشی ئەیلول هۆنیوەتەوە كە بەپێی پیلانی دوژمنانی كـورد و كـوردسـتـان و مـرۆڤـایەتی لە ١٩٧٥/٣/٦ بەدەلاڵی هەواری بۆمـەدیەنی سەركۆماری جەزایر، ڕێگە پیلانێكی ڕەش لە نێوان سەدام و شاهەنشای ئێران محەمەدە ڕەزا پەهلەوی ساز كرا، بۆ لەناوبردنی هیوا و خەون و خواستی نەتەوەی كوردی ژێر دەستە و خاكی كوردستانی داگیركراو، شۆڕشی ئەیلوولیش دووچاری نسكۆ كرا و ئەو كارەساتە ترسناكە كەم و زۆر كاری كردە سەر ئەدیب و ڕۆشنبیران و نیشتمانپەروەرانی كورد و مرۆڤایەتی.

***

لە خـەومـا پێـی وتم: حـەزرەتی مـەحـوی
لە حەق لادەی، بەریئم لێت، ڕۆڵەكەی مەحوی

***



## تاک و (فرد)

### بە زمانی عەرەبی

لَـيْـتُ وهَـلْ يـنـفـعُ لـيـتُ
لَيتُ عـفـيف كـان، فـالْتَـقَـيتُ

***

الظلم وردٌ لدى العـراق مـليح
والعـدلُ نارٌ عنيـدهُ قـبـيح

***

راحَ شـابي جـاءَ تَبْي بألاشّـدْ
ما صلمت طَاعَة للواحد الفرد الصَمَدْ

***

راح عُـسـري، جـاءَ يُسـري أحَّـمـدُ
لِلخـالِقِ الفـرد الذي هو الصَّـمـدُ

***

### فەزیلە

ئەسعەد مەحوی خۆی ناوی ئەم بەرهەمە شیعرییەی ناوە فەزیلە و بەباش زانرا كە دوای (تاک)ەكانی بڵاویان بكەینەوە.

شاعـیر خۆی ئەڵێ: ئەمـە فەزیلەیەكی شێر و گاگەلە، فەلسەفەیەكی خەیاڵـییە و لە ١٩٤٣/١١/٢٢ دانراوە.

١

دەفـعـەیە، شـێـرێ لە بێـشـە دێـتـە دەر
كـەللە بـۆش و هیـچ نەدیـو و بێ خـەبەر
بینی چەند گـایە لە ناوانی چەمـا
مـەستن و كـەوتوونەتە ڕەقس و سـەمـا
شـێـر كە چاوی كـەو بەگـاگـەل بێ پشـوو
قـەسـتی كـرد ئەو گـاگـەلە بخـوا هەمـوو

گورێز:

خوا لەگەڵ گا نەم ژمێری توو عەلی
با بە نووری تۆ دڵم بێ مونجەلی
من لە دەس جانی وەتەن ئاوارە بووم
دڵ حەزین و سینە پارەپارە بووم
عاشقی ڕووتم بەڕووتی دێمە دەر
لەم گرێ و قۆرتە سەرمخەی بێ خەتەر

مەرام:

شێر بەهێزی خۆی ئەنازێ ئەو کەرە
شاهی بێ لەشکر برا قوڕ بەسەرە
نەعرەیی کێشا بە دڵ زیڕانی کرد
هەڵمەتی دا گایەکی زاماری کرد
چاوی کەو، گاگەل بەوە خڕ بوونەوە
شێر لە ترسا جەرگ و سی بەر بوونەوە

گورێز:

عیبرەتێ وەر بگرە تۆ ئەی هۆزەکە
بۆسەلاحی کاری ئێمە چوو«صلاح الدین»ەکە
حوڕ و سەربەستی لە دنیا خۆشییە
دیل و گیراوی برا ناخۆشییە
جەردەیی و کوشتن هەموو نامەردییە
کاری پیس و بڵح و بەرداو بەردییە
شەکرو چایی بوو «مچەی خستە فڕین»
هەر وەکو جاشی توغز کەوتە تڕین.

مەرام:

کلکی گاگەل دەست بەجێ بوو بەعەلەم
نووکی شاخی یەک بەیەک بوو بەقەڵەم
فیڕ و هۆڕی کەڵ هەموو کەوتە چەمی
کەف بەلیکا زایە زار و لادەمی



گورێز:

تێبکۆشی بۆ ژیانی یەکیەتی
شێری تەنیا بێ برا، بێ قیمەتی

مەرام:

گا لە چوار لا شێریان پێچایەوە
ئێسکی ورد بوو، خوێنیان لێسایەوە
شێری کەر «ئەسعەد» بزانە چی لێهات
گاگەلێ کوشتی وەها دەنگی نەهات

**٢**

فەزیلەیەکی «چیرۆکە شیعرێک»ی مام ڕێوی و شێر، دیسان فەلسەفەیەکی خەیاڵییە، هەر ساڵی **١٩٤٣** دانراوە:

مەرام:

ڕێوییەکی کۆنە ساڵ و حیلەباز
هاتە دەر، جارێ لە کون بۆ ساز و باز
هەر وەکو بابا بە فێڵ و حیلە بوو
چاوی جادوو کلکی دەستە چیلەبوو

گورێز:

یارەبی دوورم بکەی تۆ بێ عومەر
لەم هەموو گێژاوی مەکرە بێمە دەر
کەشتی نووحە سینەکەم تۆفانی غەم
و لەچاوم دێتە خوارێ دەم بەدەم
دڵ کە جوودی بوو برا ڕووخا وەتەن
چونکە ئاهی حەسرەتی کێشا وەتەن

مەرام:

بینی چەند گایە لە مێرگا دێتە دەر
هەرچی ئەفسوسی هەبوو هێنایە بەر

